# نۆستالژیا
# لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا

بەنموونەی شیعرەکانی

عەبدوڵڵا پەشێو
ئەنوەر قادر محەمەد
سەباح ڕەنجدەر

سۆران مامەند عەبدوڵڵا

ئەم کتێبەی لەبەردەستدایە لە بنەڕەتدا نامەیەکی ماستەرە لە بواری ئەدەبدا لە زانکۆی سەلاحەدین / بەشی زمانی کوردی پێشکەش کراوە، دوای زیاتر لە چوار کاتژمێر لە گفتوگۆکردن بە پلەی (نایاب) لەلایەن لیژنەوە پەسند کراوە




لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ئاوێر (٣٣١)

- ناوی کتێب: نۆستالژیا لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا
- بابەت: لێکۆڵینەوەی شیعری
- نووسەر: سۆران مامەند عەبدوڵلا
- تایپ: نووسەر
- دیزاینی بەرگ و ناوەرۆک: ئاکار جەلیل کاکەوەیس
- چاپ: یەکەم/ ٢٠١٦
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٩٠٠٠ دینار
- چاپخانە: تاران

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (   ) ساڵی ٢٠١٦ی دراوەتێ

# پێشەکی

زاراوەی نۆستالژیا، واتە گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و خەم و دەردی حەسرەتی گەڕانەوە بۆ شوێنی زێد و وڵات، نۆستالژیا واتە خەون و خەیاڵ و ئاواتخواستن بۆ داهاتوویێکی پڕشنگدار و پڕ لەسەروەری، دوور لە خەم و ژان و نائارامی، ئەم وشەیە بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٦٨٨)ز، لە نامەی ئەکادیمی بواری پزیشکی قوتابی "یوهانس هوفر"ی، سویسری بەکارهاتووە.کەواتە نۆستالژیا هەستێکی ناهۆشیارییە و لای هەموو مرۆڤێك بوونی هەیە، بەڵام لای شاعیر و لەناوئەدەبدا بەشێوەیەکی نویێ لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتایی سەدەی بیستەم، هاتووتە ناو ئەدەبیات و پەیوەندییەکی قووڵی بە ڕەخنەی دەروونییەوە هەیە.

نۆستالژیا، خەیاڵێکە لە سەردەمی ڕابردووی پڕ لە سەروەری و سەرکەوتن و شانازییەوە سەرچاوە دەگریێ، ڕابردوویێك کە ئیتر بوونی

نییە و سەر لەنوێ بنیادنانەوەی لەسەر ئەرزی واقیعدا مەحاڵە، دوای تێپەڕینی تەمەن و دوورکەوتنەوە لە زێد و کەوتنە خاکی غەریبی.....تاد،ە. یەکەمین کاردانەوەی شاعیران گەڕانەوەییە بۆ ڕابردوو، یان ڕاکردنە و خەون و خەیاڵە، بۆ ئاییندە و داهاتوویێکی نموونەیی و باشتر لە واقیعی ئێستادا.

## هۆی هەڵبژاردنی بابەتەکە:

وەکو دیارە، ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەمان، بریتییە لە (نۆستالژیا لە شیعری هاوچەرخی کوردی– بە نموونەی شیعرەکانی" عەبدوڵڵا پەشێو، ئەنوەر قادر محەمەد، سەباح ڕەنجدەر"). هۆی هەڵبژاردنی ئەم ناونیشانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەگەرچی، تاوەکو ئێستا لێکۆڵینەوەی زۆر لەبارەی شیعرەوە کراوە، بەڵام تاوەکو ئێستا ئەوەندەی ئێمە ئاگادار بین، لەنێو کارە ئەکادیمی و زانستییەکاندا، هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانەی ئەکادیمی لەبارەی نۆستالژیا لە بواری خوێندنی باڵا نەکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی زۆری ئەدەبیاتی کوردی بە گشتی و شیعر بە تایبەتی، بابەت و دیاردەی "نۆستالژیا"، بوونێکی دیار و بەرچاویان هەیە لەناوبەرهەرمەکاندا، لەلایەکی دیکەوە، کەمی توێژینەوە لەبارەی شاعیرانی ناو براو، بەتایبەتی" سەباح ڕەنجدەر و ئەنوەر قادر محەمەد"، ئەگەرچی دەنگ و ڕەنگێکی دیار و بەرچاوی ئەدەبی نوێخوازی کوردین.

ڕیزکردنی ناوی شاعیران بەم شێوەیە لە لێکۆڵینەوەکەدا، بەپێی تەمەنی شاعیرەکان ناومان هێناون.

## ئامانج لە هەڵبژاردنی ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە:

ئامانجمان لەم لێکۆڵینەوەیە، هەوڵدانێکە، بۆ دیاریکردن و خستنەڕوو و ناساندنی چەمك و زاراوەی نۆستالژیا و ناوەڕۆکی بابەتیانەی نۆستالژیا لە شیعری کوردیە، بە نموونەیی دەقەکانی شاعیرانی کورد "عەبدوڵڵا پەشێو، ئەنوەر قادر محەمەد، سەباح ڕەنجدەر "، چونکە لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوا و میللەتانی دیکەدا، لە سەدەکانی بیست و بیست و یەکدا، گرینگی و بایەخێکی زۆری پێدراوە، بەتایبەتی دوای لێکۆڵینەوە دەروون شیکارییەکانی "فرۆید و یۆنگ و ئەدلەر"، دوای گەڕانەوە و ئاوڕدانەوە لە بابەتە ئەفسانەییەکان.

ئەدەبیاتی کوردیش، هاوشانی نەتەوەکانی دیکە، بەرهەمەکانیان لێوان لێوە لەم دیاردە و بابەتە نۆستالژیانە، تەنانەت ئەدەبێك نادۆزیتەوە، کە دەمارێکی نۆستالژیای تیایدا نەبێ.

## سنور و بواری لێکۆڵینەوەکە:

لە ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەدا دیارە، نموونەی جۆرەکانی ناوەڕۆکی شیعری نۆستالژیامان وەرگرتووە، لە شیعرەکانی شاعیرانی سنووری باسەکەمان، واتە تەنیا ئەو دەقانەی نۆستالژیان لێ دەخوێندرێتەوە، وەرگیراوە، هەروەها بۆ دەقەکان پشتمان بە کۆ دیوانی شاعیرانی ناوبراو بەستووە.

سنووری جوگرافیایی ئەدەبیاتی کرمانجی خواروومان کردووەتە ئامانج لە وانیش"عەبدوڵڵا پەشێو، ئەنوەر قادر محەمەد، سەباح ڕەنجدەر"ە، کە شیعرەکانیان دەچێتە خانەی ئەدەبی نوێ و هاوچەرخی کوردییەوە.

## ئاستەنگەکانی بەردەم لێکۆڵینەوەکە:

کارکردن لەهەر بوارێك لە بوارەکانی ژیاندا، بەبێ کەم و کوڕی و گرفت نابێت، ئەم ئاستەنگ و گرفتانەی لەکاتی کارکردن هاتە بەردەم لێکۆڵینەوەکەمان، نەبوونی سەرچاوەی پێویست بە زمانی کوردی بەتایبەتی لە ڕووی تیۆرییەوە، بەهۆی نوێ بوونی بابەتەکە لە ئەدەبیاتی کوردیدا، ئەگەرچی هەندێك وتار و وەرگێڕان لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بوونی هەیە، بەلاّم لە ژێر ناوی جیاواز و کرچ و کاڵن، بۆ کارەکەی ئێمە شیاونەبوون، ئەمە جگە لە کێشەی نەزانینی زمانی

دووەم. لەگەڵ ئەوەشدا، سوپاس بۆ خودا هەوڵمانداوە سوود لە گرینگترین و زانستیترین سەرچاوەکانی ئەم بوارە وەربگرین.

## میتۆدی لێکۆڵینەوەکە:

ئەم لێکۆڵینەوەی لەبەر دەستمانە لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبییە، سوودمان زیاتر لە میتۆدێك وەرگرتووە، واتە خۆمان بە میتۆدێکی دیاریکراوە، نەبەستووەتەوە.

میتۆدی وەسفی شیکاریمان گرتووەتەبەر، سەرەتا میتۆدی وەسفیمان گرتووەتەبەر، بۆ ئەوەی لایەنی تیۆری لێکۆڵینەوەکەمان بە شێوەیەکی زانستیانە بخەینەڕوو، بۆ لێکدانەوەی دەقە شیعرییەکان و پراکتیزەکردنی جۆرەکانی نۆستالژیا و دۆزینەوەی ناوەرۆکی نۆستالژیا و بنیات و وێنەی شیعری و زمان و ئێستێتیکا لەناو دەقەکاندا، سوودمان لە میتۆدی ڕەخنەی و شێوازی و شیکاریمان وەرگرتووە، ئەگەرچی لە زۆربەی شوێندا هەردوو میتۆدەکە تێکەڵ بەیەکتر دەبن.

## پێکهاتەی ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکە:

ئەم لێکۆڵینەوەیە، بەشێوەیەکی گشتی لە پێشەکییەك و دوو بەش پێکهاتووە:

## بەشی یەکەم:

لەڕووی تیۆرییەوە: بەسەر دوو تەوەردا دابەشکراوە، هەر تەوەرێکیش هەشت باس لە خۆدەگرێت:

**تەوەری یەکەم:** لەم تەوەرەدا، باس لە زاراوە و چەمك و پێناسەی نۆستالژیا و ڕەگ و ڕیشە و سوود و تایبەتمەندی و جۆرەکانی نۆستالژیا و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی نۆستالژیا و نۆستالژیا وەکو داهێنانی ئەدەبی کراوە.

**تەوەری دووەم:** ئەم تەوەرەش لە هەشت باس پێکهاتووە:

لەم تەوەرەیەشدا، باس لە پەیوەندی نۆستالژیا بە ئەفسانە و نۆستالژیا و سۆز و ئەدەبیات و دەروونناسی و بیرەوەری و ئەدەبی هاوچەرخ و نۆستالژیا و بەشێك لە ڕێبازە ئەدەبییەکان کراوە.

## بەشی دووەم:

بە شێوەیەکی گشتی لە ڕووی پراکتیکییەوە، لە دوو تەوەر پێکهاتووە:

**تەوەری یەکەم:** ئەم تەوەرەش لەسێ باس پێکهاتووە:

لەم تەوەرەیەدا، سەرجەم جۆرەکانی نۆستالژیا"نۆستالژیای تاکەکەسی" و "نۆستالژیای گشتی/ کۆ" بە شێوەیەکی پراکتیکی لە دەقە شیعریەکانی " عەبدوڵڵا پەشێو، ئەنوەر قادر محەمەد، سەباح

ڕەنجدەر"دا، پراکتیزە کراوە، لەگەڵ ئەو هەل و مەرجانەی شاعیرانی ناوبراوی بەرەو بەرهەمی نۆستالژی بردووە.

**تەوەری دووەم:** لەڕووی تیۆری و پراکتیکیەوە، ئەم تەوەرەش لەسێ باس پێکهاتووە:

باس لە زمان لە دەقی نۆستالژی و ئێستێتیکای ناونیشان لە دەقی نۆستالژی و وێنەی شیعری "خواستن و لێکچوواندن" لە دەقی نۆستالژی، کراوە.

بەشی یەکەم

# تەوەری یەکەم

## ١ ـ ١ زاراوەی نۆستالژیا (Nostalgia)

بەر لەهەموو شتێك بە باشی دەزانین، کەوا سەرەتا لە زاراوەی نۆستالژیاوە بچینە ناو تەوەر و باسەکەمان، چونکە چەمك و مانای زاراوەی نۆستالژیا، وەکو دیاردەیەکی بەرچاو لە ئەدەبی جیهانی بوونی هەیە، بەلاّم لە ئەدەبیاتی کوردیدا ئەگەر وەکو دیاردەش بوونی هەبێ، وەکو لێکۆڵینەوە نییە، جا بۆ باشتر ئاشنابوون و تێگەیشتنمان لە بابەتەکە، سەرەتا بە زاراوەکە دەست پێدەکەین:

## ١. نۆستالژیا لە ڕووی وشەییەوە:

((نۆستالژیا لە بنەڕەتدا لە دوو وشـەی یۆنـانی پێکهـاتووە، بـەم شێوەیە (nostos) بـە واتـای گەڕانـەوە، (algos) بـە مانـای ژان و ڕەنج و حەسرەت))[1] دێت، کەواتە نۆستالژیا وشەیەکی لێکدراوە لـە دوو وشەی یۆنانییەوە هاتووە، بەسـەریەکەوە بـە مانـای گەڕانـەوە و حـەزکردن بـۆ گەڕانـەوە بـۆ ماڵـەوە و خـەم و غوربـەتی گەڕانـەوە، هاتووە.

## ٢. نۆستالژیا لە ڕووی زاراوەییەوە:

نۆســـتالژیا (nostalgia) ((زاراوەیـــەکی فەڕەنســـییە، واتـــا زاراوەییەکـەی لــە واتــا وشــەییەکەی نزیکــە، بــە واتاکــانی: داخ و حەسرەت بۆ ڕابردوو. حەزکردن بە گەڕانەوە بۆ ماڵ... دروسـتبوونی هەستی غەریبی لە لای مرۆڤ دێت))[2].

ئەگەر سەیری فەرهەنگی زمانە جیاجیاکان بکەین دەبینین، واتای ئەم زاراوەیە ئەگەر لای هەمووانیش، وەکو یەك نەبێت، بـەڵام واتاکـە لای هـەموان لـە یـەك نزیکـە..، بـۆ نموونـە لـە فەرهـەنگی (معاصـر)

---

(١) نصرت اله پورافکاری، فرهنگ جامع روانشناسی و روان پزشکی، انگلیسی ــ فارسی، تهران، ١٣٨٢، ص ١٠١١.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص ١٠١١.

هاتووه، کـه ((نۆسـتالژیا: فەرەنسـییە، دڵتـەنگی، بـەهۆی دووری لـە ولاّت، ژانی دووری لە ولاّت))[٣] بەکارهاتووه.

لە زمانی عەرەبی و لە فەرهەنگە عەرەبییەکانـدا "نۆسـتالژیا" بـە واتاکانی" گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، یان گەڕانەوە بۆ نیشتیمان هاتووه"، بۆ نموونە لە فەرهـەنگی فەڕەنسـی ــ عـەرەبی(المنهـل الوسـیط) لـە بەرانبەر زاراوەی نۆستالژیا، گەڕانەوەکە تایبەت دەکات بۆ نیشتیمان و بـە هەسـتێکی بەنیشـتیمانی بـوون باسـی دەکـات، واتـە ((حـەزی گەڕانەوە بۆ نیشتیمان و حەسرەتی گەڕانەوەیە بۆ ڕابردوو))[٤].

هەنـدێك لـە فەرهەنگـەکانی زمـانی فەرەنسـی تەنانـەت زاراوەی "نۆستالژیا" بە جۆرێك لە نەخۆشی دادەنێت، وەك: ((نەخۆشـی خـۆ بەستنەوە بە ولاّت، کـە بـارێکی دەروونییـە. بـە غەمگینییـەك دیـاری دەکرێت، کە بە هۆی دووربوون لە ولاّتی دایك، یان ئارەزووی لـە نێـو نیشتیمان بوون، سەرهەڵدەدات))[٥]. لێرەدا وا دەردەکـەوێت، کـە لـە سەرەتادا  نۆستالژیا بـە تایبـەتی لـە فەرەنسـا و سویسـرا و ولاّتـانی دیکە، بەواتای جۆرێك لە نەخۆشی عەقڵی بەکارهاتووه، مەبەست لێی بـارێکی دەروونــی تایبــەت بــووە. لــە فەرهــەنگی (ئۆکســفۆردی

(٣) محمد رضا باطنی و دیگران، واژەهای دخیل اروپایی در فارسی، فرهنگ معاصر، تهران، ١٣٧٢، ص ١١٣.

(٤) سهیل إدریس(د)، (المنهل الوسیط)، قاموسی فەرەنسی ـ عربی، ٢٠٠٦، ص ٥٣٧.

(5) M-N.Bouillet, Dictionnaire universel des sciences, desletterset desarts…, paris, Libraivie braivie del.Hacheet teetcit, 1857, p83 .

بەریتانی)دا لە بەرانبەر زاراوەی (nostalgia – نۆستالژیا) واتای ((هەستکردن بە ژان و حەسرەت لە بەرانبەر ئەو شتەی، کەوا لە ڕابردوودا لەدەستچووە))[٦] هاتووە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی لە زۆربەی فەرهەنگەکانی زمانی ئینگلیزی لە ئەوروپا و ئەمریکا و وڵاتانی دیکەدا، زیاتر دەستەواژەی (Homesic Kness)[٧] لە بەرانبەر زاراوەی (nostalgia) نۆستالژیا، بەکارهاتووە، کە واتای (غوربەت و گەڕانەوە بۆ ماڵ) دەگەیەنێت.

لە فەرهەنگەکانی زمان و ئەدەبیاتی فارسی گرینگی زۆر بە نۆستالژیا و ئەم بابەتە دراوە، ئەگەرچی زاراوەیەکی ئەوروپییە، بەڵام وەکو دیاردەیەکی ئەدەبی، توێژەر و نووسەر و ڕەخنەگرانی فارس بایەخی باشیان بەم دیاردەیە داوە، ئەوانیش لە ژێر کاریگەری ئەدەبیاتی ئەوروپا، هەمان زاراوەیان بۆ (nostalgia) بەکارهێناوە، کە زاراوەی (نۆستالژی)یە. کەواتە لای فارسەکانیش هەر بە واتاکانی (خەم و غوربەت، هەستکردن بە ناخۆشی و مەنفا و گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، گەنجییەتی و مێرد منداڵی و مردن و مەرگ و ژیان و لەدەستدانی ئازیزان ...)[*] دێت.

(6) Hornby,A.S., Oxford Advanced Leaness, Dictionary, Oxforduniversity press, 2003,p: 84 .

(7) Archer,J. Amus,S.L.Broad, H.& currid.L.Duration of Home sickness scale.British journal of Psy Schology,1998, P: 8&205.

* بۆ زانیاری زیاتر سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

ئەگـــەر لـــەناو ئـــەدەب و فەرهەنگـــە ئـــەدەبی و دەروونـــی و پزیشکیەکانیشدا بە زمانی کوردیشەوە بڕوانین دەبینین، لـە بەرانبـەر ئـەم زاراوەیـە دەسـتەواژەگەلێك بـەكارهاتوون، وەكـو لـە فەرهـەنگی پزیشکی دەروونی عەرەبیدا، نۆسـتالژیا بـە واتاكـانی: ((دڵـەڕاوكێ و تـرس و خـۆفی نەخۆشـی نۆسـتالژی، واتـە ئـەو كەسـەی تووشـی نۆسـتالژیا بـووە، ترسـی گەڕانـەوە بـۆ نیشـتیمان و ڕابـردووی لـە دەستچـوو، بەتایبـەتی ڕابـردووی سـەردەمی گەنجییـەتی...تـاد))[(٨)] هـاتووە، واتـە لـە ڕووی دەروونییـەوە زیـاتر حاڵـەتێكی نیگـەرانی و خەمۆكی و وەسواسی و ترسی مانەوە لە غەریبیـدا، سـەرنانەوەیە لـە غوربـــەت و غەریبیدایـــە، هـــەروەها ئەگـــەر ســـەیری فەرهـــەنگی (ئەلمونجید) بكەین، كەوا لە بەرانبـەر (حـنین)، كـە واتـای نۆسـتالژیا دەگرێتە خۆی، وشەكانی ((تاسە كردن، دڵ بۆ لێدان، بیركردن، سـۆز بۆ جوولأن))[(٩)]ی، بۆ بەكار هێناوە، هەروەك لەم فەرهەنگەدا ئاماژەی بۆ كراوە، دەبینین، كەوا سۆز و هەستكردن و لایەنە هەسـتەوەرەكان

---

١. سلیمان حییم، فرهنگ معاصر، انگلیزی و فارسی حییم، جلدی یك، چـاپ نوبهـار، تهـران، ١٣٧٥، ص ٦٦٩.

٢. حسن انوشه، فرهنگ نامه ادبی فارسی، تهران، ١٣٧٦، ص ١٣٥٩.

٣. داریوش آشوری، فرهنگ علوم انسانی، تهران، ص ٢٤٦.ح

(٨) لطفی الشـربینی(د)، معجـم مصـطلحات الطـب النفسـي، مركـز تحـرین العلـوم الصـحیة، مؤسسـة الكویت للتقدیم العلمي، ص ١٢٣.

(٩) جەلال مەحمود عەلی سوبحانی(و)، فەرهەنگی ئەلمونجید، بەرگی یەكـەم، چـاپخانەی سـەردەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٥٦٥.

ڕۆڵــی ســەرەکی و گرینگیــان هەیــە لــە دروســتبوونی و ســەرهەڵدانی نۆستالژیا و کەسی نۆستالژی.

مەرج نییە ئەم دووری و غوربەتــە درێــژ خایــەن بێــت و ماوەیــەکی زۆری پێ بچێت، ئینجا دیاردەی نۆستالژیا بە کەسـەکەوە دیـار بێـت، بۆیە ئەگـەر غوربـەت و دووری لـە نیشـتیمان زۆر کـورت و ماوەیـەکی دیاری کراویش بێت، ئەوا نۆستالژیا و حـەزی گەڕانـەوە هـەر دروسـت دەبێت، چونکە نۆستالژیا ((دوای دوور کەوتنەوە لە وڵات و گەڕانـەوە بۆ وڵات پەیوەندی نییە بە ماوەیەکی کاتی دیاریکراوە، کـە بـە هـۆی یەکێك لە هۆکارەکانی خوێندن، یان کـارکردن سـەفەری ئـەم وڵاتـەی کـردووە، بەمـەش سـۆز و گریـانێکی بـە هێـز و بـە کوڵـەوە تووشـی دەبێــت، یــان نۆســتالژیا: تامــەزرۆیی و تــرس و دڵــەڕاوکێ یــەکی دەروونییە تووشی کەسی دوور لە خاك و زێد و نیشتیمان و خێـزان و ئازیزانی، دەبێت))[10]، بەڵام لە فەرهەنگە کوردییەکاندا ئـەم زاراوەیـە نەهاتووە، بەڵکو بە دەسـتەواژەی دیکـە هـاتووە، کـە هـەمان واتـا و دەلالـەتی زاراوەی (نۆسـتالژیا) دەدەن بـە دەسـتەوە، وەکـو غـەمی وڵات، بیرەوەری کۆن، سۆزی غەریبی، گەڕانەوە بۆ سەردەمی باوك و باپیران، تاراوگە، مەنفا، ئەزموونی ژیان، سـەردەمی منـداڵی، نـامۆیی ــ نامۆبوون، حەسرەتی دووری، یادەوەری هاوڕێیان و.....تـاد، هـەر

(١٠) مدحت عبدالرزاق الحجازی، معجم مصطلحات علم النفس،(عربی ــ انگلیزی)، دار الکتابە، بیروت، سنە، ١٩٧١، ص ١٨٢.

چــەندە ئــەم وشــە و زاراوانــە ڕێــك و ڕەوان لــە بەرانبــەر زاراوەی (نۆستالژیا)دا، ناوەستن، بەڵام ئەگەر بـە شـێوەیەکی ڕێـژەییش بـێ، هەڵگری واتا و دەلالەتی نۆستالژیا و بابەتی سەرەکی نۆستالژیان. بۆ نموونە ئەگەر ڕامانێك بەناو فەرهەنگی بەناو بـانگی کـوردی (هەنبانـە بۆرینـە)ی "هـەژار موکریـانی" بکـەین، لـە چـەند شـوێنی جیاجیـادا، چەند وشەیەکی بەکارهێناوە، کەوا زۆر نزیکن لە بابـەتی نۆسـتالژیا و تەنانەت دەتوانین بڵێین: ڕێك خۆیەتی ئەمەش شـتێکی ئاسـاییە و لـە لای هـەموو میللـەتێك بـوونی هەیـە. ئـەوەی لـە فەرهـەنگی (هەنبانـە بۆرینە)دا، هاتووە، بریتییە لە وشـەکانی ((نـامۆیی، بیـانی، غەریبـە، غـەوارە، یـان نـامۆیی: بێگانـەیی))[11]، هـەر لەهـەمان فەرهەنگدا لـە شوێنێکی دیکەدا، لە بەرانبەر وشەی (غەریب)دا، هـاتووە((ئـاوزە لـە وڵات، بەستە زمان، گۆرانی خەمبارانـە، سـەیر، سـەمەرە))[12]، لـەناو کوردەواری خۆشماندا، لە کۆندا لە لایەن باوك و باپیرانماندا بـە زۆری وشــەکانی: غــەریبی و غەریبایــەتی و غوربــەت و دوورە وڵاتــی و مەفتەن... تاد، بەکارهاتوون. بۆ نموونە، حاجی قادری کۆیی، دەڵێ:

---

(١١) هەژار موکریانی، (فەرهەنگی هەنبانە بۆرینـە)، کـوردی- فارسـی، چاپخانەی سـروش، تهـران، ١٣٥٩، ل ١١.٦٥٧

(١٢) سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١٢.

**((قوڕی کویٚ بکەم بەسەر خۆما لە غوربەت**

**خەوم نایێ لەداخی مولك و مـــیللەت))[١٣].**

لە ئەدەبی نـویٚ و هاوچـەرخی کوردیـدا، هەنـدێك لـە فەرهـەنگ و زاراوە ئـەدەبی و ڕەخنەییەکانـدا، کـە لـەم سـاڵانەی دوایـی لـە چـاپ دراون، کە هەندێکیان لە بەرانبـەر ئـەم زاراوەیـەدا، کۆمـەڵێك وشـە و دەسـتەواژەیان بـەکارهێناوە، فەرهـەنگی زاراوەی ئـەدەبی (کـۆڕی زانیاری کورد) لە کوردسـتان، لـە بەرانبـەر زاراوەی (nostalgia ـــ نۆستالژیا)، دەسـتەواژەی ((سـۆزی گەڕانـەوە بـۆ نیشـتیمان))[١٤]ی، بەکارهێناوە، کە ڕاسـتەوخۆ وەرگێڕانـی دەسـتەواژە عەرەبییەکەیـە، کە بریتییە لە (الحنین الی الوطن).

"نەوزاد ئەحمـەد ئەسـوەد" لـە بەرانبـەر زاراوەی (نۆسـتالژیا)دا، دەڵیٚ: ((نۆستالجیا، نۆستالژیا، وشەیەکی یۆنـانی کۆنـە و ئامـاژە بـۆ ئەو ئازار و ناخۆشییانە دەکات، کە دووچـاری نەخۆشـی دەبێـت، بـە هۆی سۆزی گەڕانەوە بۆ ژینگەی خۆی...))[١٥].

فەرهەنگـە پزیشـکییەکانیش بـە نەخۆشـی دەروونـی ناویـان هێناوە، کـە نەخۆشـیەکە لـە ئـەنجامی دووری وڵاتـی تووشـی کەسـی

---

(١٣) سەردار حەمید میران و کەریم شارەزا، دیوانی حاجی قادری کۆیی، سنە، ١٣٩٠، ل ٢٢٧.

(١٤) ئامادە کردنی لیژنەی ئەدەب کۆڕی زانیاری کوردستان، زاراوەی ئەدەبی، کوردی – عەرەبی – ئینگلیزی، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٦٩.

(١٥) نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی و ڕەخنەیی، سلێمانی، ٢٠١١، ل ٣٣٨.

نۆستالژی دەبێت و بە گەڕانەوەی بۆ زێدی خۆی چارەسەر دەبێت، وەك ((شارە سۆزی– پەرۆشی چوونەوە ماڵ، شار و نیشتیمان))[١٦].

## دەرکەوتەی نۆستالژیا لە لێکۆڵینەوەو بابەتە ڕەخنەییەکانی میللەتاندا

مەرج نییە لە ئەدەبیات و فەرهەنگی ڕەخنەیی هەموو وڵاتێکدا بەرانبەر بە زاراوەی (دوورە وڵات و غوربەت) تەنیا وشەی نۆستالژیا بەکار بێت، بەڵکو هەر میللەتە و وشە و زاراوەی خۆی بەکار دێنێت، کە هەمان واتا و دەلالەت دەگەیێنێت، چونکە نووسەر و تۆیژەرانی ئەدەب پێیان وایە بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە بە شێوەیەکی گشتی وشەیەکی قورسە و ئاسان نییە، بۆ نموونە: ((ئەڵمانییەکان وشەی (tteimwen)، بۆ دوورە وڵاتی بەکاردەهێنن، ئیسپانییەکان (maldecorazon)یان، بۆ بەکارهێناوە، چیکییەکان لەبەرانبەر دوورە وڵاتی و غوربەتدا، زاراوەی (Litost)ی، بۆ بەکاردێنن، هەموو ئەم زاراوانەش بە واتاکانی: هاوخەمی، خەم، پەشیمانی، حەسرەتی لە ڕادەبەدەر دێن. لە زمانی ڕووسیدا دەنگی چرپە چرپ، وەك زاراوەی (taska)، کە لە ئەدەبیاتی دوورخراوەکان لە وڵات ناوبانگی دەرکردبوو، کەشێکی خۆش و تەنگ و دڵگیرێك دەخاتەڕوو، چونکە

(١٦) جەمال ڕەشید فەرەج(د)، فەرهەنگی پزیشکی (دەوەن)، ئینگلیزی– عەرەبی– کوردی، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٣١٤.

مرۆڤ دڵی بۆ فەزایەکی کراوە و بێ کۆتا تەنگ دەبێت، هەرهەمان هەستی خەفەبوون و بێ هەناسەی دوورکەوتنەوە، دەتوانین لە دەنگی پڕ لە ڕەنگدانەوەی لە هەستەکانی (Tesknota)، هەستی پێ بکەین، بەڵام پرتوغالییەکان و بەڕازیلیەکان زاراوەی (Saudade)ی، بۆ بەکاردەهێنن، کە واتای (غەمی ناسك، شنەدار، بەهەیەجان خستن)دێت، ڕۆمانییەکان پێیان وایە، زاراوەی (dor)، کە زاراوەیەکی پڕ لە مۆسیقایە و وەك خەنجەر تیژە، یان واتای خەم و ژانێکی غەمگین دەبەخشێت، کە تایبەتە بە خەڵکی ڕۆمانیا))[(١٧)] تەنانەت زۆرجار و لە زۆر شوێندا لە بەرانبەر وشە و زاراوەی (نامۆبوون)دا، کە بە ئینگلیزی (Alienation)ە، کۆمەڵێك وشە و چەمکیان لەبەرانبەر داناوە، وەکو ((ئاوارەیی، هەستی ئاوارەیی دەرەکی، ئاوارەبوون، ئاوەکی، یان هەتەرە بوون))[(١٨)]، ئەمانە بۆ نۆستالژیاش (nostalgia) ئاساییـنە، بە تایبەتی لە باسەکانی غوربەت و دووری نیشتیماندا.

لەلای عەرەبەکان کۆمەڵێك زاراوە بۆ دوورە وڵاتی و غوربەت بەکارهاتووە، لەوانەش ((الغربة، الأغتراب، الحنين الى الماضى، الحنين

---

(١٧) صفدر تقى زاده، نوستالژى، نشريه بخارا،شماره(٢٤)، خرداد و تير، تهران، ١٣٨١، ص٢٠٥.

(١٨) حەمە ڕەشید قەرەداغی(د)، فەرهەنگی ئازادی ئینگلیزی– کوردی، چاپی یەکەم، چاپ و نشری ئیحسان، چاپخانەی اسوە، ٢٠٠٦، ل ١٧.

الی الوطن، الحنین الی البلد، الی المدینه... تاد))[(١٩)]، کە هـەموویان بـە واتاکانی: گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، غەم و غوربەتی دوورە وڵاتی، سـۆزی گەڕانەوەی زێدی لەدایکبوون ......تاد، دێن.

لە زمـانی کوردیشـدا بـە هـەمان شـێوە کۆمـەڵێك وشـەی، وەکـو: (غـەریبی، مـەنفا، دوورە وڵاتـی، تاراوگـە، سـۆزی غـەریبی، فـەیراق، تامـەزرۆیی لەڕادەبـەدەر، ئـەزموونی منـداڵی...تـاد)[(*)] بـۆ بـەکاردێ، هەرچەندە هەر زاراوەیەك بۆ ڕیتمی تایبـەت بـە زمانەکـە داتاشـراوە، هەموویان ناتوانن واتایەکی تەواویان هـەبێت و ڕێـك و ڕەوان هـەڵگری سـەد لـە سـەدی واتـا و دەسـتەواژەی نۆسـتالژیا بـن، بـەڵام هـاو واتاکانیان لە واتادارکردنیـان و نزیکـی و گەیانـدن، لـە هـەمان واتـا و دەلالەتی نۆستالژیادا هاوبەشن، بۆیە ئێمـە پێمـان وایـە بـەکارهێنانی زاراوە ڕەسـەنەکە، کـە "نۆسـتالژیا"یـە، باشـتر و گونجـاوترە بـۆ بەکارهێنان، چونکە هیچ یەکێك لەمانەی باسمـان کـرد نـاتوانێ ڕۆڵ و ئـەرکی تـەواوی نۆسـتالژیا بەرجەسـتە بکـات و پـڕ بـە پێسـتی ئـەم دیاردەیـە بێـت، بۆیـە ئێمـە پێمـان بـاش بـوو، زاراوە ڕەسـەنەکە،

(١٩) مجدالدین فیروز آبادی، القاموس المحیط، بیروت،١٤٠٦، مؤسسة الرسالة، ص ٣٨٣و٦٣٠.

(*) بۆ زیاتر زانیاری بۆ وشە و دەستەواژە کوردییەکان سەیری ئەم سەرچاوانەی خوارەوە بکەن:

أ) هەژار موکریانی(هەنبانە بۆرینە)، فەرهەنگی (کوردی– فارسی)، ل ٥١٢ و ٦٥٧.

ب) محەمەد فەریق حەسەن، هێمن و بۆنی غەریبی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٤٠.

ج) حەمە ساڵح فەرهادی، سۆزی غەریبی و سێ چامەی کوردی، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٦.

کە"نۆستالژیا"یە، وەك خۆی بەکار بهێنینـەوە، چـونکە هەریـەك لـەم وشە و زاراوانەی خستمانەڕوو لە لای میللەتانی دیکە و کـوردیش، بـە تـەواوی نـاتوانن واتـای نۆسـتالژیا بـدەن و ڕۆڵـی واتـای قـووڵی ئـەم زاراوەیـە بگێـڕن و هەڵەیـەکی گەورەشـە، ئەگـەر وا هەسـت بکـەین هەریەك لەم زاراوانەی دیکە، کە لـە شـوێنی نۆسـتالژیا بـەکارهاتوون، دەتوانن هەمان واتا بەرجەستە بکـەن، بۆیـە باشـترین ڕێگـە چـارەی زانســتییانە، بــەکارهێنانی ئــەم زاراوەیــە، وەکــو خــۆی کــە "نۆستالژیا(Nostalgia)"یە، لە هەمان کاتدا بۆ زیـاتر بـە زانسـتی کردنی توێژینەوەکەشمان وا پێویست دەکات.

## ١ ـ ٢ چەمك و پێناسەی نۆستالژیا

ئەم زاراوەیە لە سەرەتا دا پەیوەست بوو، بە بواری پزیشکی و سەر بە زانستی دەروونناسیەوە، بۆ چارەسەرکردنی سەربازەکان بەکار دەهات، کە بە هۆی دوورکەوتنەوەیان لە خێزان و ولاّتی خۆیان تووشی جۆرێك لە نەخۆشی دەهاتن. ئەمەش بە پێچەوانەی بیر و باوەڕی ئێمەوە، زاراوەی نۆستالژیا: (حەسرەت بۆ ڕابردوو، هەستی دڵتەنگی و خەمی غوربەت و،.....)، لە دنیای شیعر و ئەدەبیات و سیاسەت سەری هەڵنەداوە، هەر چەندە سەرچاوەی سەرەکی و ڕەگ و ڕیشەی ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ یۆنانییەکان، بەلاّم لە گریك سەری هەڵنەدا، بەڵکو ئەم وشەیە بۆ یەکەمجار (لە ساڵی (١٦٨٨) ز، لە نامەی ئەکادیمی بواری پزیشکی قوتابی "یوهانس هوفر" ی، سویسری دەرکەوت، کە دەیویست بە دانانی ئەم زاراوەیە ((دیاردەی غەمگین بوون لە ئارەزووی گەڕانەوە بۆ زێد و نیشتیمانی باوك و باپیران، ڕوون بکاتەوە، هەروەها "هوفر" زاراوەکانی (نوسومانیا و فیلۆپتری)یش، بۆ ڕوونکردنەوەی هەمان نیشانە و حاڵەت پێشنیاز کردبوو....))[٢٠].

کەسە سەرەتاییەکانی تووشبوو بەو نەخۆشییە لەسەدەی حەڤدەم کەسانێك بوون، کە بەهۆی هۆکارێکەوە، لە ماڵ و ولاّتی

(٢٠) صفدر تقی زادە، نوستالژی، نشریەی بخارا، شمارە (٢٤)، ص ٢٠٢.

خۆیـــان دوورکەوتوونەتـــەوە، لەوانـــە کۆمـــەڵێك قوتـــابی، کـــەداوای ئازادییان لـە کۆمـاری بێـرن لـە (بـازل)[*] دەکـرد، یـان کەسـانێك کـە خزمەتکاربوون بـۆ ئـیش و کـار چـووبوونە فەڕەنسـا و ئـەڵمانیا، یـان سـەربازانی سـویدی، کـە لـەدەرەوەی وڵاتـی خۆیـان شـەڕیان دەکرد...تاد.

هەرچـەندە ئـەم دیاردەیـە((نۆسـتالژیا)) بەنەخۆشـیەك دادەنـدرا، بەڵام ((هیچ جـۆرە دەرمـانێکی تایبـەتی بـۆ بەکارنـەهاتووە، چـونکە لەسـەدەی حەڤـدەم وابـاوبووە، کـە ئەمـە نەخۆشـییەکی چارەسەرکراوە، بەگەڕانەوە بۆ زێد و نیشتیمان))[21].

دیارە قۆناخ و سەردەمی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤ جیایە، ئێمە ئێستا لە سەردەمێکی نوێ و جیا لەسەردەمی پێشوو دەژین، بە هـەموو واتـاو ڕەهەندەکانی ژیانەوە، لەبەر ئـەوەی سـەردەمی ئێسـتای مرۆڤایـەتی سـەردەمی بـەرەو پێشچـوون و پێشـکەوتنی تەکنـەلۆژیا و شـاری گەورەی ملیۆنین، سەردەمی ئاڵۆزی ژیان و ڕاکـە ڕاکـەی پەیـداکردنی سەرمایە و داهاتی زۆر و...تاد، یە، بۆیەش ئەم سـەردەمەی ئێسـتای مـرۆڤ، هێنـدەی دیکـە نۆسـتالژیا و خـەم و حەسـرەتی مـرۆڤ قـووڵتر دەکاتـەوە، پێشـکەوتنە یـەك لـەدوای یەکـەکانی دنیـای زانسـت و

---

(*) بـازل: شـارێکە لـە بـاکوری سویسـرا، کـە یـەکێك بـووە، لـە کـۆنترین سـەنتەرەکانی ڕۆشـنبیری ئەوروپا.

(21) Svetlana Boym,Nostalgia and ItsDis contents, p8

هاوچەرخ و داگیرکردنی ولأتان، نەبوونی ئازادی و جەنگە یەك لـەدوای یەکەکانی ولأتان.....تاد، وایکـردووە، کـەوا نۆسـتالژیا ببێتـە بـاس و خواسـێکی دیـار و بـەربلأو، لەلایـەن توێـژەر و نووسـەرانی سـەردەم گرینگی پێ بـدەن و بیخەنـە بـەر بـاس و لێکۆڵینـەوەکانیان، چـونکە هـەموو ئـەوەی گوتمـان وایکـردووە، ئـەم بـارە نـا تەندروسـتە لـەم سـەردەمە پڕکێشمەکێشـم و ئاڵۆزیـەی جیهـان(نۆسـتالژیا) ببێتـە،" دیـاردە"(phenomenon )، بۆیـە ناکرێـت ئـەم زاراوەیـە فـەرامۆش بکەین و نەیخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوەمان.

ئەگەر لە پێناسە سەرەتاکانی (نۆستالژیا)وە، دەست پێ بکـەین، ئەوا دەبینین بەچەندین شێوە و لەچەندین ڕوانگەی جیاوازی ژیانەوە، خراوەتە ڕوو، بۆ نموونە، ئەگەر چاوێك بە نێو کتێـب و لێکۆڵینـەوە و وتار و فەرهەنگی ولأتان بخشێنین، ئەوا شتێکمان دەست دەکەوێت.

لە فەرهەنگی (لاڕۆسی) سەدەی بیستەم لەبەرگی شەشـەم چـاپی سـاڵی (١٩٣٢ز)، بـەم شـێوەیە نۆسـتالژیامان پـێ دەناسـێنێت: ((نۆستالژیا وەلأمێکە بۆ کەسێك، کە ناتوانێت خۆی بگونجێنێـت لـەو شوێنە نوێیەی تێیدا نیشتەجێ بووە، یان لـەبارودۆخێکی نوێدایـە، چ لەڕووی ماددی و چ لەڕووی عەقڵیـدا...، دەکرێـت نۆسـتالژیا تووشـی ئـەو گونـد نشـینانە بێـت، کـە هـەرگیز گونـدەکانی خۆیـان، یـان شارۆچـکەی خۆیـان جـێ نەهێشـتووە))[٢٢]. لـەم پێناسـەیە

(٢٢) فەرهەنگی لاڕۆس، سەدەی بیستەم لە بەرگی شەشەم، ١٩٣٢ز.

دەردەکەوێت، کەوا نۆستالژیا پەیوەندیەکی بە هێز و دانەبڕاوی بە شوێن و زێدی لە دایکبوونەوە هەیە، بۆیە دوورکەوتنەوە لێی، دەبێتە هۆی خەم و حەسرەت و دڵتەنگی و بیرکردنی، بەمەش کەسەکە تووشی نۆستالژیا و غوربەتی شوێن دەبێتەوە.

هەروەها "ئەددیسۆن ویسلی لۆنگمان" لە فەرهەنگی (Longman)دا، بەم شێوەیە پێناسەی نۆستالژیا دەکات: ((هەستکردن و حەزی حەسرەتی ڕابردوو، ڕابردوویەك تێکەڵ بە خۆشی و ناخۆشی بەبیرهێنانەوەی وەك لە دەستچوویەك، کە کەسی نۆستالژی خەم و حەسرەتی پێ دەخوات، چونکە خۆی لە ڕابردوودا یادەوەریەکی خۆشبووە، بەڵام ئێستا کە بیری دێتەوە خەم دایدەگرێت...))[٢٣].

بۆیە مەرج نییە هەموو ڕابردوویەك خراپ و ناخۆشبێ، بەڵکو کە بەبیرت دێتەوە خەم و ناخۆشی دروست دەکات.

"محەمەد فەریق حەسەن" لەبارەی نۆستالژیا و غوربەتەوە، دەڵێ: ((سایکۆلۆجیای مرۆڤی هاڤی[*] هەردەم وەهایی، ئەو لەولاتی غەریبی، ئەگەر لە دۆخێکی باشی تەندروستیدابێ، دەرامەتی کۆکیشی هەبێ و تەواویش ئازاد بێ، هێشتا غەریبی هەر غەریبییە و

(23) Addison Wesley Longman, Dictionary of English Language and Culture,1998,p 928.

(*) غەوارە، غەریبە، بیانی و بێگانە.

دووری نیشتیمان دەردێکی گرانە، نیشتیمان کاڵایەك نییە قەرەبوو بکرێتەوە))[٢٤].

لە پێناسەیەکی دیکەی نۆستالژیادا، دەگوترێ: ((نۆستالژیا جۆرێکە لە هەستی دووری تێکەڵ بەحەسرەت بۆ ڕابردوو، کاتی بەسەرچوو، کە بووەتە هۆی ئەوەی مرۆڤ لە شتە خۆشەویستەکانی دووربکەوێتەوە، بە تێپەڕبوونی کات بەهای ئەو شتانەی لە ڕابردوو هەیبووە و قەدری نەزانییووە، ئێستاش بە لە دەستدانیان خەم و حەسرەتیان بۆ دەخوات))[٢٥]، چونکە شیعر زۆرجار گەڕانەوەی شاعیر بووە، بۆ سەردەمی منداڵی و قسەکردنێکی منداڵانە، لەبەر ئەوەی شاعیران بە زمانێك دەنووسن زمانی گەورەکان و باو نییە، چونکە زمانی منداڵیش شاعیر ئاسا لە زمانی ئاسایی و باو ناچێت، زمانێکە پەیڕەوی ڕێسا و یاساکانی زمانی ناکات و لێیان لا دەدات، هەر ئەمەشە وایی لە ((گۆستاڤ فلۆبێر)) کردووە، بڵێ: ((شیعر گەڕانەوەیەکی دەستی ئەنقەستە بۆ منداڵی ... گەڕانەوە بۆ منداڵی هەر گەڕانەوەیەکی سادە و ساکار نییە و تەنیا دەکرێ بە کودەتایەکی شیعری بۆ تێکشکاندنی بنەماکانی زمان ئەنجامبدرێت،

(٢٤) محەمەد فەریق حەسەن، هێمن و بۆنی غەریبی،چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٥٢.

(٢٥) حسین پاینده، نوستالژی و جست و جوی هویت WWW.atiban.com

لێرەوە ئەو گەڕانەوەیە، گەڕانەوەیەکی نۆستالیژییە))[٢٦]. کەواتە، ڕابردوو ئامادەییەکی زیندووی هەیە، لەلای مرۆڤ و هەرگیز ناتوانێ لێی ڕابکات و لە بیری بکات، لە هەر چرکە ساتێکدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە، هەرئەمەش وای لە مرۆڤ بەگشتی و نووسەر و شاعیران بەتایبەتی کردووە، بەردەوام گۆرانی بۆ نیشتیمان و زێدی خۆیان بچڕن و مۆسیقای دەروونیان هاواری لێ هەڵستێت و فرمێسك و گریان میوانی تەنیایی و هاوسەفەریان بێت. وڵات و نیشتیمان خۆی لە خۆیدا لە ڕابردوودایە، بۆیە مرۆڤ ناتوانێ لە غوربەت و تاراوگە بژیت، چونکە یادەوەری و ڕابردووی لە زەمینێکی دیکە و نیشتیمانێکی دیکەیە و لەم تاراوگە و مەنفایەدا هیچ شتێك نایبەستێتەوە.

کەواتە: نۆستالژیا کردەیەکی تەنیایی و یادەوەری و گەڕانەوەییە، بۆ ڕابردوو و کارێکی پاسیڤییە، چونکە گریان و فرمێسك هەمیشە ڕەتکردنەوەی ئێستایە."ڕێبوار سیوەیلی" لەبارەی نۆستالژیاوە، دەڵێ: ((گریان دەمخاتە باوەشی تەنیاییەوە، لە گریاندا تەنیا دەبم...، گریان کردەیەکی پاسیڤە و لە پاسیڤبووندا خۆم دەپارێزم و...، لە پاسیڤبووندا نۆستالژیا و یادەوەری پەلکێشم دەکەن و دڵم

(٢٦) جەبار سابیر، لەو دیو هەناسەی شیعرەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ٢٣-٢٤.

گەرم دەبێ و پاشان دەگریم...، گریان شێوازێکە بۆ یاد کردنەوەی ڕابردوو لە سەر حیسابی ئێستادا...))[٢٧].

لەبارەی غەریبی و غوربەت و تەنیایی و گۆشەگیرییەوە بەڵگە و نموونەی زۆرمان لە ئایینی ئیسلامدا هەیە، چ لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا و چ لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت) و ژیاننامەی هاوەڵانی. بۆ نموونە، لە سورەتی (الفرقان) لە ئایەتی (٢٧ و ٢٨)دا، خوای گەورە دەفەرموویێت: (( وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَـٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾))[٢٨]، لێکدانەوەکەی :((بیر لەو ڕۆژە بکەرەوە، کە ستەمکار لەداخانا و لەبەر پەشیمانی خۆی لەوەی، کە لە دنیادا ستەمکاریی کردووە، پەنجەی خۆی دەگەزێ و دەڵێ: بریا لەگەڵ پێغەمبەری ڕێنیشاندەردا ڕێگای ڕاستی ئیسلامەتم بگرتبایەبەر و بە گوێم بکردبایە))[٢٩].

ئەم ئایەتانە لەبارەی گەڕانەوە بۆ ڕابردوووەوەیە، کە داواکردنێکی بێ ئاکام و لە دەستچووە، چونکە ئیتر گەڕانەوە بۆ ئەو سەردەم و کاتە بوونی نییە و مەحاڵە، هەروەها لە ئایەتەکانی سورەتی(یوسف) و لە ئایەتەکانی (١٣٨) لە سورەتی (الاعراف) و

(٢٧) ڕێبوار سیوەیلی، نەتەوەو حەکایەت، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٢، ل ١١.

(٢٨) قورئانی پیرۆز، سورەتی (الفرقان) ئایەتی (٢٧ و ٢٨)، ل ٣٦٢.

(٢٩) قورئانی پیرۆز، خولاصەی تەفسیری نامی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، چاپی دووەم، ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٣٦٢.

ئایـەتی (١٧) لـە سـورەتی (العنکبـوت) و ئایـەتی (٨٠) لـە سـورەتی (النحل) و ئایەتی (٧و٢١٣)ی، سـورەتی (البقـرە) و ئایـەتی (٧٧) لـە سورەتی (القصص). هەڵگری ماناو چەمکی نۆستالژیان.

هەروەها پێغەمبەر (دروودی خوای لە سـەربێت) لـەبارەی ئـایینی ئیسلام و سەرەتا و دەست پێکردنی غەریبی و تـەنیای ئـەم ئایینـە و کۆتایەکەی دەفەرمووێت: ((ان الاسلام بدا غريباً، وسيعود غريبـاً كمـا بدا، وهو يارزبين المسجدين كما تارز الحية فى جحرها))[٣٠].

واتە:(ئیسـلام بەغـەریبی سـەری هەڵداو غـەریبیش دەکەوێتـەوە، وەکو سەرەتا لەنێوان دوو مزگەوتدا کۆدەبنـەوە، هـەر وەکـو مـار لـە کونەکەی خۆیـدا کۆدەبێتـەوە). تەنانـەت خـودی پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێت) تووشی حاڵـەتی نۆسـتالژیا و خـەم و حەسـرەت و ناخۆشی زۆر بووە، لە مێژووی ئیسلامیش هەر بەناوی (ساڵی ماتەم و خـەم (عـام الحـزن) ) نـاوی هـاتووە، کـەوا لەسـاڵی (١٠)یـەمی پێغەمبەرایـەتی بـوو، لـەم سـاڵەدا (ابوطالـب)ی مـامی مـرد و پاشـان کۆچی دوایی خاتوو(خدیجە)ی، خێزانی و پاشان کۆچکردنی بۆ شاری (مەدینە) و دوورکەوتنەوەی لە زێد و شاری (مەککـە)ی، بۆیـە کاتێـك پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) لـەدەرەوەی مەککـە ئاوڕدەداتەوە و بە چاوی پڕ فرمێسکەوە، دەڵێ: (وڵڵاهی مەککە ئەی

(٣٠) باوکی عەبدوڵڵا، بەهێزترین فەرموودەکانی پێغەمبـەر(صلی اللـه علیـه وسلم)، چاپی یەکـەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣، ل٥٣.

شـــارەکەم ئەگـــەر خەڵکەکـــەت دەریـــان نـــەکردبام قـــەت بـــەجێم نەدەهێشتی و لێت دوورناکەوتمەوە... )

نۆسـتالژیا هەمیشـە لەگـەڵ دوو کاتـدا هەڵـدەکات، یـان ئـەوەتا گەڕانەوەیـە بـۆ ڕابـردووی کـۆن و بەسەرچـوو، یـان هەنگاونانـە بـۆ داهـاتووێکی نموونـەیی و ئاییندەیـەکی گریمانـەکراو، ئەمـە جگـە لـە دروسـتکردنی شـارێکی خـەیاڵی و شـارێك لـە ئاییـندەدا بـۆی بچێت، شارێکی بەهەشت ئاسا بێت، دوور لە خەم و حەسـرەت و ناخۆشـی و چینایەتی و غوربەت و بێ نیشتیمانی و.....تاد، بێت.

بۆیە نۆستالژیا هـیچ کـات لەگـەڵ کـاتی ئێسـتادا ڕێـك ناکـەوێت و لەگەڵی هەڵناکات، لە ڕاستیدا غوربەت و ژیانی تاراوگەش شتێك نییـە نووسەر لە خۆیەوە دروستی بکات، بەڵکو ئەمە واقیعی ژیانی نووسەر و شـاعیرە، بۆیـە لـەم بارەیـەوە "ئـەدوارد سـەعید" لـە کتێبـی ((ڕۆژهەڵاتناسـی))دا، دەڵـێ: ((ئـەم ڕابـردووە تـەنیا بریتـی نییـە لـە ((جوگرافیـای خـەیاڵی))، کـە دروسـتبوونی گێڕانەوەکانـە، بـەڵکو لـەوەی، کـە ئـەو لـە دەستچـووە واقیعیـە و نـەبوونی بـەردەوام ئـەم پێکهاتەی ژیـن دیـاری دەکـات، دەبـێ لـە بەرانبـەردا ئـەم پێکهاتەیـە بپارێزێ. هەر لەم ڕوانگەیەوەیە، کە ڕابردووی نۆستالژیك بـە ناچـاری بۆ کۆمـەڵێك شـت و بـیرەوەری دەگۆڕێـت، کـە دەتـوانن بخرێتـە ڕوو بـەردەوام بـەکاربێنن))[٣١]. کەواتـە بـەپێی پێناسـەکەی "ئـەدوارد"

(٣١) حمید نفیسی، نوستالژی مهاجر، فصلنامه گفتگو، شماره(١١)، تهران، ١٣٧٥، ص ٦٢ – ٦٣.

بەردەوام کۆمەڵێك شت هەن، وەك وێنەی هاوڕێیان و ئازیزان، کە سەیریان دەکەیت لەناو ئەلبوومەکانت، یان خەریکی خوێندنەوە و نووسینی نامەیەکی ژێر تیشکی مۆمێکە، یان جگەرە و دووکەڵی جگەرە و دانیشتن لە کەناری دەریا ....تاد، ئەمانە هەموویان نموونەی گێڕانەوەی دەقە نۆستالژییەکانن و نۆستالژیان بە ئاسانی پێ دەناسرێتەوە.

"ڕێبوار سیوەیلی" لە پێشەکی کتێبی (لە ستایشی ئەدەبدا) کە لەلایەن "شێرزاد حەسەن"ەوە، لە زمانی ئینگلیزییەوە، وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی بەم جۆرە پێناسەی نۆستالژیا، دەکات: ((نۆستالژیا گەڕانەوەیەکی پڕ مەترسیە بۆ ڕابردوو))[٣٢]، هەروەها نووسەر پێی وایە، کەوا ((ئەوانەی تەنیا لە ئەدەبی پێشینەکاندا بۆ وەڵامی پرسیارەکان دەگەڕێن لە نۆستالژیادا گیریان خواردووە، چونکە دەیانەوێ بە ڕاکردن و چاو نوقاندن لە ئێستادا، ڕابردوو گەورەتر پیشان بدەن لەوەی کە هەیە))[٣٣] لەلایەکی دیکەوە ڕەخنەگرانی ئەدەبی، وەك "ئەلفرێد تینسۆن Alfred teeny son و ئارنۆلد Arnold "... تاد، ناویان لە سەردەمی ڤیکتۆرییەکان، کە

(٣٢) لە ستایشی ئەدەبدا، کۆمەڵێك وتار، وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە(شێرزاد حەسەن)، چاپ و بڵاوکردنەوەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠١١، ل ١١.

(٣٣) لە ستایشی ئەدەبدا، کۆمەڵێك وتار، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن، ل ١١.

بەرهەمەکان پڕ بوون لە دەقی نۆستالژیا نـابوو، سـەردەمی نادڵنیـا و سەردەمی نیگەرانی.

ئێمــە لەگــەڵ ئــەو بۆچــوون و بــاوەڕەدانین، کــەوا نۆســتالژیا گەڕانەوەیەکی پڕ مەترسـییە بـۆ ڕابـردوو، بـەڵکو بـە پێچـەوانەوە بـە سەدان شاکاری مەزن و بەرز لە ڕێگـەی نۆسـتالژیا و هۆکارەکانیـەوە بەرهــەمهاتوون و ئــەو ناوبانگــەیان بــە دەســت هێنــاوە، بــۆ نموونــە:"دۆنکیشــۆت"ی "ســێرڤانتس"، "ئــەلیادەو ئۆدێســە"ی، "هۆمیرۆس" یان (نامۆیی) "ئەلبرت کـامۆ" و.....تـاد، چـونکە مـرۆڤ هەر چەندە بیەوێ خۆی لـەم ڕابـردووە و غوربەتـە ڕزگـار بکـات و لـە زەین و دەفتـەری یـادەوەری خـۆی بیسـڕێتەوە و لـە ژیانـدا هێڵێکـی ڕاسـت و چـەپی بەسـەر دابهێنێـت، شـتێکی بـاوەڕ پـێ نـەکراوەو ئەسـتەمە لەسـەر نووسـەر و شـاعیران لـە داهێنـانی بەرهەمەکانیانـدا سێبەری نۆستالژیا و سۆزی غـەریبی و غوربـەتی بەسـەرەوە نـەبێت، چونکە ئەگەر خۆشی بیەوێ بـێ سـوودەو نـاتوانێ. ئـەوەتا دەبینـین نووسەرێکی، وەك "AmyDorrits" دان بـەوەدادەنێت و ویسـتێك دەردەبڕێت، کە نامۆیە لەگەڵ حەز و خۆزگـەکانی خێزانەکـەی بـۆ لـە بیرکردنی ڕابردوو و هەنگاونان بۆ پێشەوەو، دەڵێ: ((ئێستا پێویستە دان بەوەبنێم، کە من بە هۆی غەریبی بۆ وڵات و ماڵەوە دەناڵێنم، کە زۆر حەز بە وڵاتەکەم دەکەم، هەندێ جار، کە کـەس مـن نـابینێ، بـۆ

ئەوەی ئارەزوو و دەردە دڵی بۆ بکەم...))[٣٤]، کەواتە زەمەنی مرۆڤ بریتی نییە لە ئێستایەکی ڕووت و ڕەها و تاقانە. لەم بارەیەوە "عەبدوڵڵا سەراج" دەڵێ: ((ئێستایەکی ڕووت نییە، بگرە ڕابردوو تانوپۆی ئەم ئێستایە مانایی پێکهێناوە و ئایینەدەشمان دەچنێت))[٣٥].

کات و شوێن لە ژیان و تەمەنی مرۆڤدا هەمیشە بوونی هەیە، کەوا مرۆڤ لە کاتی دووری و غوربەتدا بە دیدێکی دیکە و لە گۆشەنیگایەکی دیکەدا، کات تاقی دەکاتەوە و بەرجەستەی دەکات: "فردرێك جیمسون" دەڵێ: ((چەند پارچە بوون و دووربوون لە وڵات، دەبنە هۆی ئەوەی مرۆڤ بە شێوەیەکی دیکە کات تاقی بکاتەوە، واتە کاتی ئێستای، وەك کاتی لە دەستچوو بخاتە ڕوو...))[٣٦]. هەر لەم بارەیەوە لەسەر گرینگی و هەبوونی ڕابردوو لە ژیانی مرۆڤ بە گشتی و نووسەر و شاعیران بە تایبەتی بێ ئاگان لەسەر گرینگی و پێویستی ڕابردوو لە ژیانی مرۆڤدا "عەلی ئەشرەف دەروێشیان"، دەڵێ: ((ئەوانەی ڕابردووی خۆیان، بەئاگایانە فەرامۆشکردووە، بەو پەڕی نائاگاییەوە وابیردەکەنەوە، کە ئیتر سەردەمی ڕابردوو بەسەر چووە

---

(٣٤) حمید نفیسی، نوستالژی مهاجر، فصلنامه گفتگو، شماره(١١)، ص ٥٩.

(٣٥) عەبدوڵڵا سەراج، دۆنایدۆن یان بەدگۆڕان، سلێمانی، ٢٠١٣، ل ٢٦.

(36) Tamara.S.Wagner,fellow.(Nostalgia and The Victorian Novel) ,National university of Singapore/ university of combridge,P 588.

و باوی نەماوە))[٣٧]. لە ڕاستیدا دەبیٚ، ئاماژە بەوەش بکەین، کەوا مەرج نییە، نۆستالژیا هەمیشە پەیوەست بێت بەو کەسانەی تووشی دووره ولاٌتی و غوربەتی نیشتیمان دەبن و لە زێدی لە دایکبوون دووردەکەونەوە، چونکە بەسەدان مرۆڤ و نووسەر هەن بەرهەمەکانیان لێوانلێون لە غوربەت و غەریبی و گەڕانەوە و ناڕەزایی لە واقیعی ئێستادا، چونکە نۆستالژیا دیاردەیەکە پەیوەستە بە دەروونی مرۆڤ و لایەنی هەست و سۆز و هەڵچوونەکانی، ئەوەتا "شێرکۆ بێکەس" لەبارەی غەریبی و مەنفا و غوربەتەوە، دەڵیٚ: ((غوربەت هەر غوربەتی جوگرافی نییە، تۆ ئەشیٚ لە ماڵی خۆشت بیت و بەلاٌم غەریبی ماڵەکەت بیت، شاعیران بە گشتی سروشتێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، کە تەنیایی و گومان و دڵەڕاوکیٚ و دوورکەوتنەوە لە کۆمەڵ و پەناگیری و شۆڕبوونەوە بۆ ناو خودی خۆیان، لە هێڵە دیارەکانی ئەم سروشتەن، هەمیشە خەمێك لەگەڵی دایە، گۆرانییەکی خەمناك هاوڕێیانە. ئەوەندەی پایز لە ڕۆحی ئەوانە نزیکە قەد ئەوەندە بەهار لە ڕووحەوە نزیك نەبووەتەوە، ئەمە بۆ منیش هەر وایە))[٣٨].

---

(٣٧) عەلی ئەشرەف دەروێشیان، سەمەدی بەهرەنگی، وێڵێك بە دوای خەونەکانی منداڵاندا، گۆڤاری ((سورینیٚ نویٚ))، ژمارە(٤)، ساڵی سێیەم، ئابی ٢٠٠٧، ل ٨٧.

(٣٨) سەمیرە عەلی، شێرکۆ بێکەس، گۆڤاری ((سورینیٚ نویٚ))، ژمارە(٤)، ساڵی سێیەم، ئابی٢٠٠٧، ل ٤٧.

نۆستالژیا ((حەسرەت بۆ لە دەستچووەکان دەخوات و سکالاش لە کاتی ئێستا بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا دەکات))[٣٩]. بۆیە هەندێکجار غوربەت و نامۆبوونەکە لە ناوەوەییە و هیچ پەیوەندییەکی بە دووری و مەوداوە نییە، لە شوێنی نیشتیمان و زێدەوە.

"هربرت مارکیز"، دەڵێ: ((تەکنەلۆژیای سەردەم مرۆڤی کردە مرۆڤی تاك ڕەهەند و وای لێکرد تەنانەت لە بەرهەمەکانی خۆیشی نامۆ بێت))[٤٠] ، غوربەت و بێ نیشتیمانی و هەستی نۆستالژی هەر بەوە نایەتە دی و دروست نابێت، کە دوورە ولاتی بکاتە مەرجی بابەتی نۆستالژیا، چونکە غوربەتی ئەو کەسانەی بە ولات و شەقام و کەس و کۆمەڵگەیی خۆیان نامۆن و غەریبەن زۆرن. بۆ نموونە: "پابلۆ نیرۆدا" دەڵێ: ((لەوەتەی هەم هەرگیز هەستم نەکردووە، کە(شیلی) نیشتیمانی منە، من هێندە نامۆم بە ولاتەکەی خۆم و دنیا، ئەسڵەن من ناچمەوە سەر وەچەی ئادەمیزاد، من منداڵی مانگم))[٤١]. بێگومان بێگومان نووسەر وێڵە بە دوای شوێنێکی پڕ لە ئازادی و هەوایەکی ئازادی لێ دەست کەوێت و هەست بە مافی خۆی و بوونی خۆی بکات.

---

(٣٩) نجمه نظری و فاطمه کولیوند، بررسی نوستالژی (در شعر حمید مصدق)، فصلنامه زبان و ادب فارسی، شماره(٤٦)، زمستان ١٣٨٩، ص٣.

(٤٠) فازیل شەوڕۆ، (٢) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٣، ل٢٣.

(٤١) سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٠.

دەبێت ئەوەش لە بیر نەکەین، کەوا ئەگەر چی مرۆڤ لەناوولآت و شار و زێدی خۆی، خۆی پێ غەریبە و تەنیا و نامۆ بێ، بەلآم لە تاراوگە و دوورە ولآتی، ئینجا هەست بەبوونی زێد و نیشتیمان و شتە ورد و بێ نرخەکانی ولآتی خۆی بە گەورە و پیرۆز دێتە پێش چاو بە حەسرەتەوە بیریان دەکات و خەمیان بۆ دەخوات، ئەوەتا"پابلۆ نیرۆدا" دوای ئەوەی بە تەواوی لە زێد و ولآت و نیشتیمانی دووردەکەوێتەوە، چ هەستێکی لا دروست دەبێ، چۆن قەدری نیشتیمان و زێد دەزانێ، غەریبی و غوربەتی ڕاستەقینە ئەو کاتە لە دایك دەبێ، کە دەڵێ: (("هاتمە ڕانگۆن– Rangoon" لە ئاسیا، نەمزانی تەنیایی هێندە کوشندەیە و دوورە ولآتی هێندە بێکەست دەکات، تۆ دەزانی لە نێو چوار دیواردا تەنیا تونـد سەری خۆت بە دیواردا بکێشیت و هاوارکەیت و کەسیش بە هاناتەوە نەیەت...))[٤٢].

کاتی ڕابردوو کاتێکی زۆر و دەوڵەمەندە، چ لە ڕووی ڕووداو و کاریگەرییەوە بێت لەسەر خودی شاعیر و بەکارهێنانی لەناو دەقی شیعرییدا، چ وەك ڕابردوویەکی گرینگ خۆی لە سایکۆلۆژی مرۆڤدا بێت. زیاد دەکات، بە جۆرێك هەست و سۆزی بەهێزتر دەبێت، بۆیە واقیعی حاڵ ڕەفز دەکات و لێی یاخی دەبێت، ئەوا ئاوات بە ڕابردوو دەخوازێت و هەوڵی بە دەستهێنانەوەی دەدات، چونکە ((لە ڕازی

(٤٢) سەرچاوەی پێشوو، ل ٧١.

بوون بە واقیعدا مانایی نغرۆ بوونە لەو یـادەوەر و بیرکردنەوانـەی کـە لە دەروونـدا چەسپاون))[٤٣]، هەر ئەمەش بووە، هۆی ئـەوەی وای لـە توێژەر و ڕەخنەگران بکات لە بابەتی نۆستالژیا(کات) بکەنە سەرەکی و بەبایەختری لە قەڵەمی بدەن.

بۆیە، دەگوترێ: ((ئەو شتەی کە زۆر گرینگـە، واتـا گـرینگترە لـە ناخۆشـی و دەردەسـەری و غـەریبی و دووری وڵات دەگەڕێتـەوە، بـۆ زەمەن زیاتر لە شوێن، چونکە مرۆڤ (مرۆڤی تاراوگە و غەریبی) زیـاتر بیری ئەو کاتانە دەکات، کە لێی تێپەڕبووە، وەکو لـە شـوێن، بـەڵکو بۆ ئەو ڕۆژانەی منداڵی و مێرد منداڵی و گەنجایەتی...))[٤٤].

"بۆیم Boym"یش، هەمان ڕای هەیە و کات بە گرینگتر دەزانـی و دەڵێ: ((نۆستالژیا تەنیا بریتی نییە لە گەڕانەوە و خۆشەویستی بۆ شـوێنێکی دیـاریکراو، بـەڵکو ئـەوە گۆڕانـە لـە کـات، کـە هـەوێنی دروستبوونی نۆستالژیایە))[٤٥].

لەڕاستیدا، نە(کات) بەتـەنیا دەتـوانێ ڕۆڵێکـی کاریگـەری هـەبێت بەسەر نۆستالژیا و نە(شوێن)یش، چونکە هەردووکیان دووانـەی یـەك منداڵدانن و ناتوانین لە یەکتریان جیا بکەینەوە لـە بابـەتی نۆسـتالژیا

(٤٣) عبدالرحمن بدوی، الزمان الوجودی، دارالثقافة، بیروت، للطبعة الثالث، ١٩٧٣، ص٢٠.

(44) J. starobinski,llconcet to dellanostalgia,tr.itinprete Alacuradi),Raffaello cortino,1992, p:85-86.

(45) Svetlana Boym. Nostalgia and Its Discontents, p 8.

ئەگەر چی جیاوازیەکی کەمیشیان هەبێ لە بەرهەم هێنانی دەقی نۆستالژیادا.

"سەرکەوت پێنجوینی" دەڵێ: ((غوربەت و نامۆیی بریتییە لەوەی، کە مرۆڤ لە ژینگەیەکەوە بۆ ژینگەیەکی دیکە هەڵکەندرێ، بە جۆرێك سەرەڕای ئەوەش پەیوەندێکی ڕووحی لە ناخی ئەو خودەدا لەوێدا لەلای دروست دەبێ سەبارەت بە زێد و ئازیزان و خۆشەویستان...))(٤٦) ، شوێن و دوورکەوتنەوە ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە دروستبوونی غوربەت و نامۆیی لە شوێنی نوێدا، چونکە ڕەنگە لە ژیانی مرۆڤدا هیچ شتێك لە کۆچ و سەفەر سەختتر نەبێ، جا ئەگەر ئەو کۆچەش بە زۆرە ملی و بێ ویستی مرۆڤ خۆی بێت. هەڵکەندنی مرۆڤ لە شوێنی و زێدی ڕاستەقینەی خۆی، ئەو شوێنەی بووەتە بەشێك لە سایکۆلۆژیای و تراژیدیایەکی گەورەیە بۆ مرۆڤ و کاریگەری دەروونی گەورەی لەسەر جێدەهێڵێت.

ئەگەر لە ڕووی زیانناسی (خەسارەناسی) دەروونی(Psycnopathology) سەیری بابەتی نۆستالژیا بکەین بریتییە لە: ((لە زەمەنی پڕ سەروەری، لە ڕابردوو سەرچاوە دەگرێت، ڕابردوویەك، کە ئیتر بوونی نییە و سەرلەنوێ بنیادنانەوەی

(٤٦) سەرکەوت پێنجوێنی، تاسەی غوربەت لە شیعری نوێی کوردی تاراوگەدا، گۆڤاری(ڕامان)، ژ(٤٨)، ٢٠٠٠، ل٥١.

مەحاڵە))[٤٧] ، چونکە کاتێك مرۆڤ لە زەمەنێك لە ژیانی خۆیدا تووشی چەند کێشەیەك دەبێ، یان تەندروستی تێکدەچێ، یان بیر لە پیری و مردن دەکاتەوە، بۆیە یەکەمین کاردانەوەی لەم دیاردەیە ڕاکردنە لەم واقیعە، بەڵام زۆربەی کات، ئەگەر لەسەر ئەرزی واقیع ڕێگایەك نەدۆزێتەوە، بۆ ڕاکردن، ئارەزوو بۆ ڕابردوو دەکات، کە تێیدا ژیانێکی خۆشتری هەبووە. پەنا بردنی نووسەر و شاعیران بۆ سەردەمی منداڵی و مێرد منداڵی و گەنجییەتی و گەڕانەوە بۆ شوێنی زێد و زەمەنی ڕابردووی لە دەستچوو، هەمیشە پێداچوونەوەیەکی بیوگرافی مێژووی خودە، گرینگیش لەم ڕوانییەدا ئەو هەستانەیە، کە لە نێوان ڕازی بوون بەم زەمەنە و ڕەتکردنەوەی ئەم زەمەنەدا دروست دەبێ، ئەمەش وای کردووە، هەندێك نووسەر و ڕەخنەگر نۆستالژیا بە بارێکی ڕەخنەییەوە ببەستێتەوە، بۆیە دەڵێین:((نۆستالژیا زیاتر، وەك بارێکی ڕەخنەیی لێکدانەوەی بۆ دەکرێ))[٤٨] ، یان (پۆڵ ماری (Paul-marie) دەڵێ: ((هەموو بەرگە گرتنێك نۆستالژیایە))[٤٩].

---

(٤٧) سعید شاملو، اسیب شناسی روانی، چاپ ششم، انتشارات رشد، تهران، ١٣٧٥، ص١١.

(48) paul-Marie couteaux,royaliste"Les francais Souhaitunnouveaule gitimisme (enteretien) proposreceillis parchristophe Barbieer, LExpress,2002.p34.

(٤٩) سەرچاوەی پێشوو، ٢٠٠٢.

کەواتە، دەگەینە ئەو ڕاستییەی، کەوا ئەوانەی باس و پێناسەی نۆستالژیان کردووە، هەموویان یەك بۆچوون و لە یەك ڕوانگەوە پێناسەی ئەم بابەتەییان نەکردووە.

دەتوانین بڵێین: نۆستالژیا و چەمکی نۆستالژیا جەخت لەسەر چەند لایەنێك دەکاتەوە وەك:

**یەکەم:** کاتی ڕابردوو و کاتی ئاییندە و گریمانەکراو.

**دووەم:** خەون و ڕاستی.

**سێیەم:** شوێنی زێد و نیشتیمانی باوك و باپیران.

**چوارەم:** شوێنی نموونەیی و یۆتۆپیا.

**پێنجەم:** واقیع و ڕەتکردنەوەی واقیع.

نۆستالژیا ئازارێکە، کە هۆکارەکەی بێگومان ناگەڕێتەوە بۆ دووربوون لە شوێنی جوگرافی بە تەنیا، بەڵکو بە هۆی شتێکی دیکەوەیە دەکرێ هەر یەکێك لەمانە بێت، بۆشایی ئاسمان، یان مەعنەویی و غوربەتی ڕۆح، هەژاری و سەرمایەداری، شتە ون و دیارەکان، یان هەر شتێك کە پێناسە نەکراوە، ئەو ئارەزووەی هێشتا نەهاتووەتە دی، یان هێشتا نەمانناسیەوە، یان هەرگیز ناتوانین پێی بگەین وەك: یۆتۆپیا لە زەین و مێشك و خەیاڵماندا دەخولێتەوە، دڵتەنگیەك تێکەڵ بە ئارەزووەکانی مرۆڤ دەبێت. کەسی نۆستالژی و غەریبە لە هەموو کەسێك زیاتر ئاگادارە لە نێوان ئەو شتانەی، کە

دیـــارن بـــە بیـــنین و ئـــەو شـــتانەش کـــە هـــەن، بـــەلاّم بەچـــاو نابیندرێن.....تاد.

نۆستالژیا بە واتای ڕابردوو بەشێکی ئۆرگانییە لەداهاتوو، ناتوانین داوای چـاکبوونی داهـاتوو بکـەین، تـەنیا لـە ڕێگـا پرشـنگدارەکانی ڕابردوو نەبێت.

نۆستالژیا و گەڕانەوە بۆ ڕابـردووی کـۆن، تـەجاوزکردنی ڕابـردوو، تــەجاوزکردنێکی ڕەهــا نییــە، بــەڵکو تەجاوزکردنــە لەســەر ئاســتی هونەری و چەمك و بەهاکان، کە وەك مێژوو گوزارشت لـە حاڵەتـەکان دەکات. چـەمکی دەلالـەتی نۆسـتالژیا خـەون و خـەیاڵ و ئەندێشـەی مرۆڤ و نووسەرە بۆ داهاتوو، خەون بە کۆمەڵێك شتەوە دەبینـێ، کـە هەمیشە بەخەیاڵ لەگەڵیدا دەژیت. یان گەڕانەوەیەکی بەحەسرەت و خەم و ژانە، بۆ ڕابردووی پڕ سەروەری غوربەت و دووری لە ئازیزان و دوور لە مەعشوق و تەمەنی پیری و خەمی مووی سپی و ترسی مـردن و مەرگ و یاخی بوون لە ئێستادا.....تاد.

نۆستالژیا بەشێوەیەکی کورت بریتییە: لەهەستێکی دەروونی تـاڵ و شیرین لە بەرانبەر بارودۆخ و هەڵکەوتێکی لەدەستچوو لـە ڕابـردوو، یان بە سواری باڵی خەیاڵ و ئارەزوو و ئـاواتێکی سـەرەنجڕاکێش بـۆ داهاتوو دەخوازێـت، داوای چـاکبوونی کۆمەڵگـە و خـەمی کۆمەڵگـەی هاوچــەرخ دەخــوات و بــۆ مەبەســتی وێنــاکردنی ژیــانێکی ئــارام و ئاسوودە بۆ هەموو تاکێکی ناو کۆمەڵگە، نۆستالژیا ئاواتخواستنە بـۆ

شارێکی خەیاڵی و نموونەییە، شارێك و شوێنێك، کە نووسەران و شاعیران ئاواتەخوازی دروستکردن و بەدی هێنانییەتی.

نۆستالژیا لەسەردەمی ئێستاماندا بابەتێکی سەردەمییە و زۆریش بەربڵاوە و گرینگی پێدەدرێت، واتا و دەلالەتێکی فراوانی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، لە وتارە فیکریەکانی ئەم سەدەیەماندا زۆر جار ئاشنا دەبین بە چەمك و واتایی نۆستالژیا، چونکە نۆستالژیا تەنیا نەبەستراوەتەوە بە چەمکی ڕابردوو، گەڕانەوە بۆ نیشتیمان و زێد و سەردەمی گەنجیەتی، بەڵکو هەڵگری بابەتی هەمەڕەنگ و فرە چەمسەرە، لەبەرئەوەی پەیوەستە بە دڵ و دەروون و هەست و سۆزی مرۆڤەوە و گۆڕانکارییەکانی مرۆڤ و شارستانییەت و لەسەردەمە جیاجیاکاندا.

بەواتایەکی دیکە، نۆستالژیا کۆکردنەوەی دژەکانە کۆکردنەوەی خۆڵەمێشی ڕابردووە، ڕاکردنە لە واقیعی حاڵ، هەنگاونانە بۆ داهاتوو، پارێزگاریکردنە لە کولتوور و کەلەپووری نەتەوەیی و فرمێسك ڕشتنە بۆ نیشتیمان و شین و ڕۆ ڕۆیە بۆ لەدەستدانی ئازیزان، پێکەنین و شادی و خۆشی لە دەستچووی سەردەمی لاویەتی و قۆناخی مێرد منداڵییە، یاخی بوون و بەرگە گرتنە.....تاد.

## ١- ٣ ڕەگ و ڕیشەی نۆستالژیا لە ئەدەبیاتی میللەتاندا:

نۆستالژیا ناوێکی نوێیە بۆ دۆخێکی دەروونی کۆن، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی هاتنە سەر دنیای باوکە ئادەم و دایکە حەواوە (سەلامی خوایان لەسەر)، ئێمە ئەگەر بۆ ئەو مێژووە کۆنە بگەڕێینەوە، دەبینین لەو ڕۆژەوەی کوڕانی ئەم دایك و باوکە، واتە (قابیل و هابیل) کەوتنە کێشە و بۆ ئەوەی قابیل خراپەکاری و چەوتییەکانی خۆی پنج بکات، دەستی لە هابیلی برای بەرزکردەوەو کوشتی، لەو ڕۆژەوە نۆستالژیای گریان بۆ ڕابردوو لای قابیل درووستبوو..، چونکە قابیل بەمە برایەکی لە دەست چوو، کە هەتا چەند خولەکێك پێشتر ئەو برایەی بۆ ئەم زۆر باش بوو و هەمیشە خۆی بە خزمەتکاری دەزانی، بەڵام ئێستا بە دەستی خۆی ئەو برایەی کوشت و تازە جارێکی تر، هابیلی برای لەم دنیایە زیندوو نابێتەوەو ناتوانێ، وەکو جاران سوودێکی پێبگەینێ!!، جگە لەوەش قابیل بە کوشتنی ئەو برایەی دەربەدەر بوو و نەیتوانی لەبەر چاوی دایك و باوك و خوشك و براکانی تریشی بمێنێتەوەو ناچار بە سەدان میل لەو خۆشەویست و دڵسۆزانەی دوورکەوتەوە و بێ دایك و

باوك و بێ خوشك و براش مایەوە و ئیدی چ دۆست و دڵسۆزێكی لەسەر پشتی زەوی هەیبوو، بەو قەتلە هەڵەیەی ئەنجامی دا، هەموو ئەوانەشی لە دەست داو لە تەنیایی و بێكەسی ژیانی بەسەر برد، ئەوەش دیسانەوە بووە، هۆی ئەوەی نوستالژیا و خەمی دووركەوتنەوە لە كەس و كار و خەمی دووركەوتنەوە لە وڵات و خەمی لەدەستچوونی ڕابردووی خۆش و خەمی لەدەستچوونی سەردەمی جوانی منداڵی و هەموو ئەو خەمانەشی بۆ دروستبوو و بووە مامە خەمەی وشكهەڵاتوو، كە بەپێی دەقە ئایینییەكان و تێگەیشتن لەم دەقانە، لەولاش شەرمەزارە و بە هۆی ئەو قەتلەی كردی، لە ژیانی ناخۆش و خراپ دایە، چونكە گوناهی هەموو قەتلەكانی دوای خۆی لەو ڕۆژی هابیلی كوشت و هەتا هەتایەش چۆن بۆ قاتلەكان دەنووسرێ، بە هەمان شێوە بۆ قابیلیش دەنووسرێ.

دوای ئەم ڕووداوە، دیسانەوە (دایكە حەوا و باوكە ئادەم)یش خەمی جەرگسووتان و گریان بۆ كوڕە خۆشەویستەكەیان و بیرەوەری ڕۆژانی خۆشی بەر لەو كارەساتەیان بۆ دروست بوو، ئەوەش هەمووی هەستی نۆستالژی بوو و لەو ڕۆژگارە زووەوە دروست بوو.

لە دوای ئەم ڕووداوانە ئیدی ئادەمیزاد زۆربوون و ئەوانیش هەموو ئەو بارانەیان بەسەردا هات، كە لە وڵات دووربكەونەوە، لە ڕابردوویان دووربكەونەوەو ئێستایان ناخۆشتر بێ لە ڕابردوو، پێدەچێ ئەو

پەندەش لەو مێـژووە زۆر کۆنـە ئـادەمیزادە یەکەمـەکان درووسـتیان کردبێ، کە دەڵێت:"ساڵ بە ساڵ خۆزگەم بە پار!"

ئەگـەر بـۆ مێـژووی مرۆڤایـەتیش بگەڕێینـەوە، لـە ئـەدەبیاتی میللەتاندا لە هەموو کات و شوێنێك، ئەو غەمانەی باسیان لێـوە کـرا، بە هۆکاری جۆراوجۆری زوڵم و سـتەم و بـە هۆکـاری گرانـی و قـات و قڕی و بە هۆکاری نەزانین و بە هۆکاری لەیەکجیا مرۆڤەکان بـەردەوام لە دوای ڕابردوویەکی خۆش کەوتوونەتە ئێستایەکی ناخۆش، ئەوەش هەمیشـــە ئـــەو هەســـتە سروشـــتییەی نۆســـتالژیەی لـــە لایـــان درووسـتکردووە، ئیـدی ئـەدەبیاتێکی گـەورەی پـڕ لـەو بابەتـە لای نەتەوەکان درووستکردووە.

ڕۆمانســـییەکان لـــە ســـەدەی هـــەژدە لـــە ئـــەوروپا زۆربـــەی ناوەرۆکەکـەیان لەسـەر غـەمی نوسـتالۆژی بنیـات نـاو هەمیشـە لـە ئێستای خراپیان بە خەیاڵ بۆ ڕابردووی خۆش و بۆ ڕۆژانـی منـداڵی و ڕۆژانی بەر لەو لێقەومانەی تێیکـەوتبوون دەگەڕانـەوە، واتـە: لێـرەدا هەستە سروشتییە نۆستالۆژییەکە، بە جۆرێك لە فەلسەفە کرا و کرایە هەوێن و بنـەما سـەرەکییەکانی ڕێبـازی ڕۆمانسـیزم، کـە لـە مێـژووی ئەوروپادا ئەو ڕێبازە بووە ڕێبـازێکی ڕەشـبین و سـەدەیەکی تـەواوی کێشا.

لە ئەدەبی فۆلکلۆری و کۆن و میللـی و شـیعری کلاسیکیشـدا ئەم هەستە لای زۆربەی شاعیران هەستی پێـدەکرێت، بـە تایبـەت لـە

داستانە بەناوبانگەکانی "شیرین و فەرهاد و مەم و زین و   محەمـەد و سـێوێ و لاس و خـەزاڵ و  خـەج و سـیامەند و.....تـاد"، هـەروەها شیعرەکانی"مەولەوی و وەلی دێوانە و بێخود"ش، نموونەی بەرچـاون بۆ هەستی نۆستالژیان.

## ٤-١ جۆرەکانی نۆستالژیا لەناوئەدەبدا

دوای لێکۆڵینــەوەمان لــە توێژینــەوە نوێیــەکان، وامــان بــۆ ســاغ بووەتەوە، کە ڕەخنەگر و توێـژەرانی بـواری ئـەدەب و ئـەدەبیات لـە لێکۆڵینــەوە ئەدەبییــە نوێیەکانــدا، بــە شــێوەیەکی گشــتی دوو جـۆر نۆســتالژیایان دیــاریکردووە، گوتویانــە: بــە شــێوەیەکی گشــتی دوو جـۆری ســەرەکی نۆســتالژیا لــە بەرهەمــە ئەدەبییــەکانی نووســەر و شاعیراندا هەن، ئـەوانیش بـۆ چـەند جـۆرێکی دیکـەی نۆسـتالژیا ورد دەبنەوە، کە هەموویان هەر دێنەوە خانەی دوو جۆرە سـەرەکییەکە، ئەوانیش بریتین لە:

**یەکەم// نۆستالژیای تاکەکەسی (تاك، فەردی).**

**دووەم// نۆستالژیای گشتی (کۆ، جمعی).**

## یەکەم/ نۆستالژیای تاکەکەسی:

شاعیر، یان نووسەر لەم جۆرە نۆستالژیایەدا، گرینگی بە ماوەیەکی زەمەنی لە ژیان و بەسەرهاتەکانی ژیانی خۆی دەدات و لە بەرهەمەکەیدا دەیخاتەڕوو، باسی ئەو شوێنانە دەکات، کەوا تایبەتن بە خۆی و غوربەتی تاکەکەسی دروست دەکەن، واتە دەکرێت ئەو شوێنەی ئەو باسی دەکات، تەنیا بۆ خودی خۆی پێویست و گرینگ بێت و دەردەسەری و ناخۆشی و شادی و خۆشی تێیدا ببینێت و کۆمەڵێك ڕووداو لەم شوێنە ڕوویاندا بێت، کە هەر پەیوەست بن بە خودی خۆی و دەروونی شاعیر. دەتوانین نۆستالژیای تاکەکەسی بە پێی کات و گەڕانەوەی ڕابردوو، بۆ سەر دوو جۆر دابەش بکەین، وەك: (کاتی ئێستایی(خێرا) ) و (کاتی بەردەوامی).

### أ) نۆستالژیای تاکەکەسی کاتی(خێرا، ئێستایی):

ئەو کاتەیە، کەوا نووسەر لە بەرهەمە ئەدەبیەکەیدا گرینگی بە وێنەی چرکەیەك، یان چەند چرکەیەك لە کاتی ڕابردوو لە دەقەکەیدا دەدات، واتە شاعیر تەنیا لە چرکە ساتێکدا، یان وشەیەك، یان وێنەیەکی خێرا و کورت، یان گرتەیەکی زۆر کورت لە ژیانی ڕابردووی دەخاتە ناو بەرهەمەکەی، دواتر دەگەڕێتەوە بۆ سەر بابەتی سەرەکی دەقەکە و درێژە بە تەواو کردنی بەرهەمەکەی دەدات.

## ب) نۆستالژیای تاکەکەسی کاتی بەردەوامی:

نووسەر لەم جۆرەیاندا لە سەرتاپای بەرهەمەکە گرینگی بە ڕووداو و بەسەر هاتەکانی ڕابردوو دەدات و دەیانکاتە هەوێنی داهێنان و بە هۆیانەوە فەزایەکی نۆستالژی بەرهەم دەهێنیٚ، دەقەکەی دەبێتە دەقێکی تەواو نۆستالژیا و گەڕانەوە بۆ ڕابردوو.

ئیدی تا کۆتایی بەرهەمەکە، ئەم گەڕانەوەیە بەردەوام دەبێت، وێنەکان، دیمەنەکان و مۆنتاژکردنەکانی ڕووداو و بەسەر هاتی ڕابردووی ژیانی خۆی و کەسایەتی خۆی، دەکاتە تابلۆیەکی شیعری تاکۆتایی دەقەکە.

واتە دەقەکە دەبێتە دەقێکی سەد لە سەد نۆستالژی و شاعیر کاتی ئێستا ڕادەگرێت و لەناو ڕابردوودا هەست بە خۆشی و شانازی ژیانی کۆنی خۆی دەکات، یان بە پێچەوانەوە. کەواتە دەتوانین ئاماژە بەو جۆرانەی، کەوا دەکەونە ژێر چەتری نۆستالژیای تاکەکەسی بکەین، هەرچەندە دەبێت ئەو ڕاستیە لە بەر چاو بگرین، کەوا جۆر و بابەتە وردەکانی دیکەی نۆستالژیا لەناودەقی نووسەر و شاعیراندا، وەکو یەك نییە و دەگۆڕێت، گۆڕانکارییەکەش تەنیا لە بەکارهێنانی جۆرەکانیەتی، واتە هەندێك شاعیر زۆرترین جۆرەکانی لەناو بەرهەمەکانیدا بەکارهێناوە و هەندێك شاعیریش هەندێك، یان چەند جۆرێکی کەم لەناو دەقەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە.

ئەو جۆرانەی دەكەونە ژێر چەتری نۆستالژیای تاكەكەسی بـریتین لە:

١. گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی.

٢. گەڕانەوە بۆ گەنجی و مێرد منداڵی.

٣. نۆستالژیای دووری لە مەعشوق "دڵدار".

٤. نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ نیشتیمان و غوربەتی دووری لە وڵات و زێدی لە دایكبوون و گوند.

٥. نۆستالژیای پیری و بیركردنەوە لە مردن و ترسی مەرگ.

٦. دووری لــە بەهەشــت و ژیــانی هەمیشــەیی، ســۆفیگەری و غوربەتی ڕووح.

٧. نۆستالژیای لە دەستدانی یەكێك لە ئازیزان و ئەندامانی خێزان و هـاوڕێ كۆنـەكانی ژیـان. هەنـدێكجار بـەهۆی مـردن و نەمانیانـەوە نۆســتالژیاكە دروســت دەبێــت، هەنــدێكجاریش بــە هــۆی دووری و بیركردیانەوە.

٨. نۆســتالژیای داهــاتوو ((ئاییندەیــەكی پێشــبینی كــراو، یــان گریمانە كراو)) لە ڕووی كاتەوە.

٩. پــەنابردن بــۆ دروســتكردنی شــارێكی نموونــەیی" المدینــة الفاضله" تێیدا هەست بە ئارامی و خوشگوزەرانی بكات

١٠. نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سروشت.

١١. نۆستالژیای سیاسی. دەبێت ئەوە لە بەرچاوبگرین نۆستالژیای سیاسی هەموو کات خودی و تاکەکەسی نییە، هەندێکجار ڕووداوی سیاسی و کەسایەتی سیاسین، بەمەش دەچێتە ناو نۆستالژیای سیاسی گشتی و دەبێتە هەست و نەستێکی کۆیی(گشتی).

## دووەم// نۆستالژیای (گشتی، جمعی،کۆ)

ئەم جۆرە نۆستالژیایە گەڕانەوەیە بۆ کۆمەڵێك بابەت و شتی گشتی، کە پەیوەندی بە گەڕانەوەی ڕابردوویەکی دووری ژیانی نەتەوەکەوە هەیە و گەڕانەوە و نۆستالژیای گشتین. کەواتە باس لە زەمەن و شوێنێکی زۆر کۆن و زەمەنی زۆر دوور دەکەن، چونکە نۆستالژیای گشتی پەیوەندیەکی قووڵی بە ئەفسانەوە هەیە، هەندێ پێیان وایە، کە ((ئەفسانەکان ئارەزووەکانی زەمەنی منداڵی مرۆڤ بە خۆیانەوە دەگرن، هەر نەتەوەیەك لە زەمەنی پێشوویدا لە ئارەزوو و ئاواتەکانی دا، خەیاڵاتێك دروست دەکات، کە دوایی لە مێژوو بە شێویەك دەردەکەوێت، بەم پێیە ئەفسانەکان بەجێماون، یان بەرهەم و شوێن پێی ژیانی منداڵی هەر نەتەوەیەکن و خەو و ئەفسانەی هەر تاکە کەسێکن))[٥٠]. کەواتە، باسی پاشا و ناوهێنانی شاعیرانی کۆنی نەتەوە و ڕووداوە مێژوویەکان و پاڵەوانە ئەفسانەیەکان.....تاد، بابەتی سەرەکی نۆستالژیای گشتین. لە خوارەوە بە خاڵ جۆرەکانی نۆستالژیای گشتی دەخەینەڕوو:

---

(٥٠) کارل آبراهام، رؤیا اسطوره، ترجمەی جلال ستاری، جهان اسطوره شناسی، چاپ اول، تهران، نشر مرکز، ١٣٧٧، ص١٤٥.

**١. نوستالژیای بیرەوەری مێژووی:(*)**

ئــەمجۆرە نۆســتالژیایە بابەتگــەلێکی، وەك: شــەڕ و جــەنگ و پەیماننامــەکان و ڕووداوە سیاســی و ڕامیارییــەکانی و.....تــاد، دەگرێتەوە، کە بەسەر میللەت و نەتەوەکەدا هاتوون.

**٢.نۆستالژیای نەتەوەیی، گەڕانەوە بۆ ئەفسانەکان:**

پــەنا بـردن بـۆ ئەفسـانەکان هەنـدێکجار ئەفسـانەکان ئەفسـانەی جیهـانی و بیـانین. جـاری واش هەیـە ئەفسـانەکان خۆمـاڵیین وەك: گلگامێش، کـاوەی ئاسـنگەر، خـدری زینـدە، جـەنگیزخان، شـیرین و فەرهاد، خەجێ و سیامەند.....تاد. ئەمەش بە دوو شێوە دەبێت:

أ) یـان ئەوەتـە ڕاسـتەوخۆ باسـی ئەفسـانە و نـاوی ئەفسـانەکە دەهێنێت.

ب) یـان باسـی ڕووداوی ئەفسـانەکان و پاڵەوانـە ئەفسـانەییەکان دەکات و.....تاد.

**٣. حەکایــەت و بابەتــە فۆلکلۆرییــەکان وەك:** پەنــد و قســەی نەستەق و وتەی بە نرخی زانایان و مەتەڵ.....تـاد، کـە هەمیشـە بـە گێڕانەوەیان و باسکردنیان، تەنانەت بە ناو هێنانیان خەڵك دڵیان پـێ خۆش دەبێت و حەز و چێژێکی شێتانەیان بۆی هەیە.

**٤. باســـکردن و گەڕانـــەوە بـــۆ شـــوێنەوارە دێرینـــەکان و مۆزەخانەکانی ولات**، بەتایبەتی دوای دزین و لەناوچوون و نەمانیان.

ئەم جۆرە گەڕانەوەیە زۆرجار بە دوو شێوازە:

أ) بەکارهێنانی وشەی کۆن و مردوو، یان ئەو وشە و دەستەواژانەی، کە لە کۆندا بەکاردەهات لەلایەن باوك و باپیرانمانەوە، ئیتر ئێستا بەكار نایەن و ئێمە نایزانین.

ب) ناوهێنانی کەرەستە و کەلەپووری کۆن، کە ئێستا وەك: شوێنەوار سەیریان دەکەین ڕەمزی نەتەوەیی سەردەمانێکی کۆن و ژیانی کۆن و گوندیمان دەهێنەوە یاد، وەك: دەستاڕ، گۆزە، دێمەکە، شەربە، دیزە و گۆزە، جەنجەر، ئاون، یان هاون و تێرکە، دارسووك، لووباك، جاجم، ڕەشماڵ.....تاد.

هەروەها "د.أحمد رضایی" لە لێکۆڵینەوەیەکدا لەبارەی بەرهەمەکانی دوای جەنگ، یان ئەو شاعیرانەی لە جەنگەکاندا بەشدار بوونە، دوو جۆر نۆستالژیای دەست نیشان کردووە، ئەوانیش:

((١. نۆستالژیای دڵتەنگی و حەسرەتی عارفانە.

**٢. نۆستالژیای حەسرەت و ناڕەزایی.))**[٥١]

کـە، بەگشـتی شـەهیدبوون و نـەمانی برادەرەکـانی سـەربازی، هەروەها ناڕەزایی دەربڕیت لە بەرانبەر لە بیرکردنی ئـەو سـەربازانەی شەهیدبوونە و بوونەتە قوربانی خاك و نیشتیمان، بـە بیرکردنـەوەیان حەسرەتیان بۆ دەخوات و خۆزگە دەخوازێ ئەویش نەمابایە بۆ خـەم و خەفەت، لەلایەکی دیکە ناڕەزایی دەردەبڕێ، کە لـە بـیر کـراون بـە ئاسانی و کـەس یادیـان ناکاتـەوە، لـە کاتێکـدا ئـەوان شـەهیدی، بـە دیهێنانی ئەم ئازادییەن.

**٥. نۆستالژیای ئایینی و کەسایەتیە ئایینیـەکان،** بـە شـێوەیەکی گشـتی نـەك تـەنیا هـەر ئایینێـك بـۆ نموونـە، جولەکەـ مەسـیحی ـ ئیزیدی ـ یارسان ـ زەردەشت ـ ماو ـ ئیسلام.....تاد. گەڕانەوە بـۆ ئایینــە کۆنــەکان و کەســایەتیە ئایینیــەکان لــە شــیعر و ئــەدەبی هاوچەرخدا زیاتر بۆ مەبەستی لایەنە مێژووییەکەیە، نە وەکـو بابەتـە دینی و ڕووحییەکە، چونکە زۆربەی ئەم نووسەر و شاعیرانە هـەڵگری ئایدولۆژیای مارکسی و چەپ ڕەون.

**٦. نۆسـتالژیای گەڕانــەوە بـۆ کەسـایەتییە نەتەوەییـەکان،** کـە ئێسـتا بونەتـە مولـك و میراتـی نەتـەوەیی، وەك: شـاعیرانی کـۆن ـ

(٥١) أحمد رضـایی(د)، نوسـتالژی دلتنگی و حسـرت عارفانـه در شـعر سـالهای نخسـتین از جـنگ تحمیلی، کتاب ماه ادبیات، شماره (٣٢)، پیاپی (١٣٦)، بهمن ماه، تهران، ١٣٨٧، ص ٤٣–٤٤.

.

شۆڕشگێڕ و سەرکردە سیاسی و قارەمانەکانی جەنگ، یان گۆرانیبێژ و حەیرانبێژانی میللی، ئەمەش بە دوو شێوە دەبێ:

أ) کەسایەتی نەتەوەیی جیهانی و ناسراو لەناوهەموو میللەتانی جیهان، وەکو شاعیرانی ئەدەبی ئینگلیزی ، فەرەنسی، ئەڵمانی و ڕووسی و ئەمریکی.....تاد، یان هونەرمەند و گۆرانیبێژ و وێنەکێش و.....تاد جیهانی.

ب) کەسایەتی و شاعیر و نووسەر و هونەرمەندانی ناوەخۆیی، **وەك: نالی، مەحوی، بابەتاهیر، حاجی قادر، مەولەوی، بێخود، جزیری، خانی، حەمدی، گۆران، دیلان، هەردی، هێمن و.....تاد، یان گۆرانیبێژە نەمرەکان، وەك: حەسەن زیرەك، تاهیر تۆفیق، عەلی مەردان، قادر دیلان، مشکۆ، ڕەسووڵ گەردی، سەلاّح داودە، شەماڵ سائیب، مەلا کەریم، ئەحمەد شەماڵ، حوسێن عەلی، ئایشەشان، خودادا عەلی، فوئاد ئەحمەد و.....تاد.**(*)

---

(*) بۆ زیاتر زانیاری بۆ جۆرەکانی نۆستالژیا سوودم لەم سەرچاوانەی خوارەوە بینیوە:

١. الیاس نورایی(د) و مهدی شریفیان(د) و علی أصغر آذر پیرا، رویکردهای نوستالژیك در شعر م.سرشك، پژوهشنامەی ادب غنایی، شمارە بیستەم، دانشگاە سیستان و بلوچستان، سال یازدهم، بهار و تابستان، ١٣٩٢، ص ٢٨٢–٢٨٣.

٢. معصومە خدادادی، نوستالژی در شعر زنان معاصر، پایان نامە دکتر زبان و ادبیات فارسی، دانشگاە تربیت مدرس، ١٣٧٣، ص ٥٢.

٣. نجمە نظری و فطمە کولیوند، بررسی نوستالژی در شعر حمید مصدق، فصلنامە زبان و ادب فارسی، شمارە (٤٦)، زمستان ١٣٨٩، ص ٦–١٣

## ١- ٥ ڕووالەت و تایبەتمەندییەکانی نۆستالژیا لەناو ئەدەبدا

بۆ ئەوەی بتوانین ئەو دەقانەی هەلگری تارمایی نۆستالژین بناسینەوە، ڕەخنەگر و توێژەرانی ئەدەب نیشانەگەلێکیان، وەکو نیشانە و خاسیەتی ئەدەبی نۆستالژی دیاری کردووە، بە پێویستی دەزانین لە خوارەوە بە خاڵ، ئاماژەیان پێبکەین:

((١. دڵتەنگی و بیرکردنەوە بۆ ڕابردوو، ڕابردوویەك، کە ئیتر لە دەستچووە و گەڕانەوەی شتێکی مەحاڵە.

٢. حەزێکی لە ڕادەبەدەر و شێتانەی گەڕانەوەیە بۆ وڵات، ئەمەش بە هۆی غوربەت و دوورە وڵاتی و تاراوگە و مەنفا، یان هەستی نامۆیی و غەریبی، ئەگەر لەناو وڵاتیش بێت.

٣. گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی و یادکردنەوەی ڕۆژە خۆشەکانی بەداخ و حەسرەتەوە.

٤. نووسینەوەی بیرەوەرییەکان بە ئەفسووس و حەسرەت خواستنەوە.

٥. گرینگیدان بە شوێنەوارە دێرینەکان، چونکە یادگاری ڕۆژانی ڕابردووی خۆشن و بەگەڕانەوە بۆیان، لە ئێستای بێتاقەتیدا، شاعیر دڵی خۆش دەبێت.

٦. ئەفسانەسازی و بەکارهێنانی ئەفسانەکان و زیندوو کردنەوەی ئەفسانەکان، جا چ ئەفسانەی خۆماڵی بن، یان ئەفسانەی میللەتان.

٧. بە خەیاڵ وێناکردنی شاری نموونەی، "المدینه الفاظلة"، چونکە واقیعی تاڵ بەوە نەبێ لەبیر ناچێتەوە.

٨. سکاڵا کردن و ڕەتکردنەوەی ئێستا و یاخیبوون لێیەوە، هەروەها ئاوات خواستن بۆ داهاتوویەکی باشتر لە بارودۆخی ئێستادا))[٥٢].

((٩. گەڕانەوە بۆ سروشت و ڕاکردن لە شارە گەورە و پیشەسازییەکان))[٥٣].

١٠. باسی مردن و ژیان و پیری و مووی سپی و پایزی تەمەن و بەهاری عومر، هەمیشە بێزاربوون لە خراپیەکان و ڕاکردن بۆ ئەوانەی نەهاتوونەتە پێش و مایەی دڵخۆشی و لەبیر چوونەوەی ناخۆشیەکانن.

١١. لاوانەوە و شین و ڕۆ ڕۆ بۆ خۆشەویستان و دۆست و ئازیزان و کەسە نزیکەکانی ناو خێزان.....تاد.

((١٢. ئەلبوومی وێنەکان و سەیرکردنیان.

---

(٥٢) یوسف علی عباس آباد، غم غربت در شعر معاصر، نشریه علمی، شماره(٦)، ١٣٨٧، ص ١٥٧.

(٥٣) فەرهاد پیربال(د)، ڕێبازە ئەدەبیەکان، چاپخانەی دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، ٢٠٠٤،ل ٦٤ و ٨٣.

١٣. نامــە و کەلوپەلــەکانی دیــاری نێــوان دڵــداران و ئــازیز و هاوڕێیان.....تاد.

١٤. دەفتەری بیرەوەری و یادگارییەکان.

١٥. مۆم و دوکەڵی جگەرە و خەیاڵی شەو.

١٦. مەشروب و جامی نەی و چای خەست.

١٧. کەناری دەریا و شەپۆڵەکانی دەریا))[٥٤].

ئەمانــە و چــەندین دیمــەن و شــتی دیکــە، لــە ڕاســتیدا نیشــانە و ڕەمزەکــانی ئــەدەبی نۆســتالژی زۆرن، بــەڵام ئەمانــەی ئاماژەمــان پێکردن لە نیشانە دیار و بەرچاوەکانی دەقی نۆستالژیان.

لەم ڕێگایەوە دەتوانین بەرهەمەکانی نۆستالژیا باشتر بدۆزینــەوە، کەواتە دەتوانین بۆ ناسینەوە و پەنجە خستنە سەر دەقی نۆســتالژی ئەم هێڵــکارییەی خوارەوە بیخەینە ڕوو:

(٥٤) حمید نفیسی، نوستالژی مهاجر، فصلنامه گفتگو، شماره (١١)، تهران، ١٣٧٥، ص ٦٢ – ٦٣.


بەرەو ڕابردوو، بەرەو داهاتوو
نۆستالژیا
دڵتەنگی و حەسرەت بۆ لە دەستچووەکان
شاری نموونەیی
ئارکائیسم
ونبوو
بەکارهێنانی ڕێسا
و
ڕێزمانی زمانی ڕابردوو
ڕاکردن لە کاتی ئێستادا
گەڕان بە دوای
ئەفسانە
بەکارهێنانی کەسایەتی
و ڕووداوەکان و کەڕەستە
و ڕەمزە ئەفسانەیەکان
بە هیوای دۆزینەوەی دنیایەکی جوان
ڕۆمانتیک

## ١- ٦ هۆکارەکانی سەرهەڵدانی نۆستالژیا

نۆستالژیا پەیوەستە بە مرۆڤ و لایەنی سۆز و هەست و دڵ و دەروونی کەسایەتی مرۆڤەوە، کە لە واقیع و ئەزموونەکانی ژیانیدا ڕووبەرووی دەبێتەوە، بۆیە هۆکارگەلێك هەن بۆ سەرهەڵدان و دروستبوونی بابەتی نۆستالژیا، لە بەرهەمی نووسەر و شاعیرانەوە.

دیارە نۆستالژیا و خەمی نۆستالژی و گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و یادەوەرییەکان بە شێوەیەك لە شێوەکان لە لای هەمووانەوە بوونی هەیە و هەستی پێ دەکرێت، بەڵام لە لای نووسەر و شاعیران جیاوازترە و هەستکردن بە نۆستالژیا و خەم و حەسرەت هەستیارتر و کاریگەری زیاترە و خەم و حەسرەت و گەڕانەوەیەکی ئاسایی نییە. لێرەدا هەوڵدەدەین هۆکارەکانی دروستبوونی نۆستالژیا لەم چەند خاڵەی خوارەوە کورت بکەینەوە و بیانخەینەڕوو:

١. (لە دەستدانی یەکێك لە ئەندامانی خێزان، یان خۆشەویستێك لە ژیاندا، کە ببێتە هۆی گریان و لاوانەوە و گۆشەگیر و خەم و حەسرەتێکی زۆر و.....تاد.

٢. کۆچکردن و پەناهەندەی: جا کۆچکردنەکە بە ئارەزوو بێت، یان کۆچێکی بەزۆرە ملیٚ.

٣. بیرهاتنەوەی بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵی و گەنجی. بۆ نموونە **"لەتیف هەڵمەت"** دەڵێ:

**((کە منداڵ بووم، خانۆچکەم بە وردە بەرد، دروست دەکرد و**
**منالآنی لە خۆم گەورەتر دەیان ڕووخان**
**ئەم شەو خەوێکی خۆش و ناخۆشم بینی..))**(٥٥)

٤. زیندانکردن:

ئەو کەسەی، کەوا بە هەر هۆکارێك لە هۆکارەکان بێت، تووشی زیندان دێت و لە زێد و وڵاتی خۆی دوور دەخرێتەوە، ئەو کەسەش لە ئێستایی زیندانی ناخۆشی، دوێنێی ئازادی و خۆشی بیردێتەوە، حاڵەتی نۆستالژیای بۆ دروست دەبێ.

٥. چێژە ئەفسانەییەکان:

کاریگەربوون بە ژیانی پاڵەوان و ڕووداوەکان و کەرەستەکانی ناو ئەفسانە کۆنەکان هۆکارێکی دیکەی، سەرەکییە بۆ گەڕانەوە و نووسینی نۆستالژیا و دەقی نۆستالژی.

٦. دووری لە مەعشوق(دڵدار):

جا ئەم دڵدارە دڵدارێکی نەستی بێت، یان دڵدارێکی هەستی و مەجازی بێت.

---

(٥٥) لەتیف هەڵمەت، دیوانی لەتیف هەڵمەت، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٤٣٦.

٧. هۆکارە ڕووحی و دەروونییەکانی مرۆڤ.

٨. خەم و ژانی پیری و بیرکردنەوە لە مردن.

٩. سکاڵاکردن و ناڕەزایی لە ژیانی ئێستادا، ئەم سکاڵایە بووەتە هۆی حەسرەت و خەم و ئازاری زۆر بۆ ڕابردوو)[*].

((١٠. هۆکار و جووڵانەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئایینی...))[٥٦].

"دکتۆر عەزیز گەردی" دەڵێ: ((بە هۆی گۆڕانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و باری گشتی هەر نەتەوەیەك هەندێ زاراوە و واتای نوێ لە زمانەکەوە پەیدا دەبێت))[٥٧]، کەواتە بەکارهێنانی کۆمەڵێك وشە و دەستەواژە لە زمان و ئەدەبی کوردی، وەك: (خەم، غوربەت، حەسرەتی ڕابردوو، تاراوگە، هەندەران، دووری و.....تاد)،

---

(٥٦) الیاس نورایی(د) و مهدی شریفیان(د) و علی اصغر آذر پیرا، رویکردهای نوستالژیك در شعر م.سرشك، ص ٢٨٠.

(*) بۆ (٩)خاڵی سەرەتایی هۆکارەکانی سەرهەڵدانی نۆستالژیا بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێنەوە سەر ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:

١. مهدی ممتحن و حسن مجیدی و سکینه صارمی گروی، تطبیق نوستالژیا در اندیشه جبران و نیما، ص٥،٦،٧.

٢. محمد ریحانی و ربابه قصابان شیروان، نوستالژیك "دووری معشوق" در شعرهای منوچهر آتشی، فصلنامه علمی پژوهشی زبان و ادب فارسی، شماره(١٠)، ١٣٩١، ص٩١،٩٢.

٣. مهدی شریفیان(د) بررسی فرایند نوستالژی در اشعار سهراب سپهری، مجله زبان و ادبیات فارسی، دانشگاه سیستان و بلوچستان، سال پنجم، بهار و تابستان، ١٣٨٦، ص٥٢،٥٣.

(٥٧) عەزیز گەردی (د)، ڕوخسار و ناوەرۆك لە هۆنراوەدا، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)، ساڵی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧١، ل ١٢.

دەکرێت لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکاریانەی، کە "د.عەزیز گەردی" باسی دەکات داتاشرابێت.

هەروەها "علی عباس آباد"ی، پێی وایە بۆ دیاریکردنی گرینگترین هۆکارە کاریگەرەکان لەسەر دروست بوون و سەرهەڵدانی بەرهەمی نۆستالژیا لەلای نووسەر و شاعیران، دەبێت ئاماژە بە هۆکارەکانی ((سیاسی، کۆمەڵایەتی، کێشەی تاکەکەسی، تایبەتمەندی ڕووحی و دەروونی، کاریگەری مۆدێرنیسم و تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی جیهان و هاوچەرخ لەسەر پەیوەندی و دەروونی مرۆڤەکان))[٥٨] بکەین.

١١. لەناوچوون و وێران بوونی شوێنەوارە دێرینەکانی وڵات: جا بە هەر هۆکارێك بێت، وەك شەڕ و جەنگ و داگیرکردن، یان پرۆژە و گۆڕانی نەخشەی شار.

١٢. ڕۆڵی هەستەکان لە دروستکردنی نۆستالژیا: هەستەکانی مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی و هەستی بینین (ڕەنگ) و بیستن (گوێ) و هەستی بۆنکردن(بۆن) هۆکاری گرینگ و دیاری بەرهەمهێنانی دەقی نۆستالژیان، چونکە بۆن بزوێنەری نۆستالژیاییە، کە شاعیر یادگارییەکانی لە بۆن و بەرامی دڵدارەکەی، یان شوێنی زێد و گوند و دەنگی مەڕ و ماڵات و قاز و قولینگ و.....تاد، وەردەگرێ، وێنەیەکی

(٥٨) خلیل پروینی(د) و سجاد اسماعیلی، بررسی تطبیقی نوستالژی در شعر احمد عبدالمعطی حجازی و نادر نادرپور، فصلنامە نقد و ادبیات تطبیقی، شمارە(٢)، ١٣٩٠، ص ٤٤.

لە روخساری خۆشەویستەکەی زیندوو دەکاتەوە. ((بەمەش شاعیر لە لایەك شیعرەکەی خۆی دەڕازێنێتەوە، لەو لاوەش دەگەڕێتەوە ژوانی کۆن، یادگاری ڕابردووی بە بیر دەهێنێتەوە و داخ و خەم و حەسرەت دایدەگرێت و پڕی دەکات لە نۆستالژیا و لەبەرهەمەکەیدا ڕەنگدەداتەوە...))[59].

ئەگەر سەیری ئەم دەقەی **"فەرهاد پیربال"** بکەین تەواو هەست بە نۆستالژیا لە ڕێگەی بۆنەوە دەکەین:

**((دیوار و دەرگە و بنمیچ بۆنی دوورییان**

**لێ دێت،**

**نوێنەکانم بۆنی دوورییان لێ دێت...))**[60]

لەم شیعرەدا، دەبینین چۆن (بۆن) بۆنێکی ئاسایی نییە، بەڵکو پەیوەستکراوە بە دووری و جۆرە دەربڕینێکی هەستی پڕ لە تەنیایی، کەواتە لێرەدا هێزی (بۆن) زاڵکراوە بەسەر هەستەکانی دیکەدا.

لەبارەی (ڕەنگ) و هەستی بینینی و غوربەت و گەڕانەوەی ڕابردووی منداڵیش، **"فەرهاد پیربال"** دەڵێ:

(٥٩) محمد ریحانی و ربابه قصابان شیروان، نوستالژیك (دوری معشوق)، در برخی از اشعار منوچهر اتشی، فصلنامه علمی پژوهشی زبان وادب فارسی، شماره(١٠)، بهار١٣٩١،ص ٩٦.

(٦٠) فەرهاد پیربال، ئکسل (Exil)، ئەنیستیوتی کورد، پاریس، ١٩٩٢، ل ٧٨.

**((کە گوێ هەڵدەخەم**

**منداڵیم**

**لایەکی سپی و لایەکی دیکەی نارنجی بوو))[61]**

هەردوو ئەم نموونانە دەبینین، چۆن کاتێك هەر هۆکارێك لە هۆکارە زۆرەکان دەبنە هۆی دروستبوونی بابەتی نۆستالژی، ئەم هەستانەی "بینین" و "بۆن" دەورووژێن و لە ڕێگەی ئەم وروژانەوە بابەتە نۆستالژیاکە دروست دەبێ، خۆ بە بێ ئەم دووانە، بیرە نۆستالژیاکە نایەتە بەرهەم و دەقەکانی سەرەوە نابن بە دەقی نۆستالژی.

ئەگەر سەیری مێژووی دێرینی میللەتی کورد بکەین، ئەوا میللەتێك بووە، لە سەدەی بیستەمدا لەلایەن شۆڤێنیەکانەوە، بۆ ماوەیەکی درێژ هەوڵی لەناوبران و سڕینەوەی نەژادی و زمان و وێرانکردنی نیشتیمانەکەی دراوە، بەڵام هەمیشە و بەردەوام خۆ ڕاگر و لەبن نەهاتوو بووە، کوشتن و بڕین و ڕاگواستن و بە عەرەبکردن و بە تورککردن و بەفارس کردن و سڕینەوەی ناسنامە و وێرانکردنی بە هەزاران گوند و زێدی لە دایکبوون و جینۆساید و زیندە بە چاڵکردنی گەنج و منداڵ و پیرانێکی زۆر، هەموو ئەمانە چۆکیان بەم گەلە دانەداوە.

---

(٦١) سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠.

دیارە هەریەکە لەو هۆکارانەی باسیان لێوەکرا، بوونەتە هـۆی دروستبوونی بابەتی نۆستالژی و وێنەی زۆریان لە ئـەدەبی هاوچـەرخ و نوێی کوردی دروست کرد.

## ١- ٧ سوودەکانی نۆستالژیا لە ئەدەبدا

هیچ بابەت و بەرهەمی ئەدەبی و هونەری و میتۆدێکی ڕەخنەیی نییە، لە دنیای ئەدەبیاتدا سوود و گرینگی و بایەخی خۆی نەبێ. ئەگەرچی لە هەموو سەردەم و قوتابخانە و ڕێبازە ئەدەبی و بەرهەمی نووسەر و شاعیران، کەسانێك هەن ڕەتیدەکەنەوە و لەبەرانبەریشدا هەندێ کەسی دیکە بەکارێکی باش و سەرکەوتووی لە قەڵەم دەدەن و قبووڵی دەکەن.

سەبارەت بە نۆستالژیاش، ئەگەرچی هەندێك پێیانوایە، ئەم بابەتە گەڕانەوەیەکی مەترسیدارە و بۆ بەرەو پێشچوون و هێنانەکایەوەی کۆمەڵگەیەکی مۆدێرن و شارستانی نابێت، ئاوڕ لە ڕابردوو بدرێتەوە و جارێکی دیکە بگەڕێنەوە سەری، بەڵکو تەنیا ڕوو لە ئێستا و بەرەو ئاییندە هەنگاو بنێین و لە داهاتوو بڕواندرێت. وەك "ڕۆلان بارت" دەڵێ: ((مۆدێرن بوون واتای ئەوەیە، کە بزانین چ شتەگەلێك ئیتر نالوێن، مرۆڤی مۆدێرن لە ڕوانگەیەکی نوێوە دەروانێتە جیهان))[٦٢]، کەواتە گەڕانەوەی نۆستالژی و سەردەمی کۆن و باوباپیران و سەدەکانی ناوەڕاست بە پێ دژایەتی و گرفت

(٦٢) محەمەد.س.ڕۆستەم زادە (نامۆ)، هونەر و تەکنەلۆژی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ٢٠١٢، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای موکریان، ل ٣٨.

نــەبووە، بــەڵام لــەولاوەش بەشــێکی دیــار و بەرچــاوی شــاعیر و نووسەرانی قوتابخانەی ڕۆمانسـیزم بـە گـرینگ و پێویسـتی دەزانـن، وەك ڕێگە چارەیەك بۆ ڕاكردن و ڕزگار بوون لە واقیعی تـاڵی ژیـان و بــە ئــامێرکردنی مــرۆڤ و.....تــاد، بــۆ نموونــە"ئــەلس چــاندلەر Chandlierh" دەڵـێ: ((زیندووكردنـەوەی چـاخی نێوەنـد، كـە وردە وردە ئامادەییـەكی چـاكی بـە خـۆوە دەگرێـت، لەلایـەن خۆیـەوە هەستێكی دروستكرد، كە بە گشتی مایەی قبووڵكردن بـوو، هـەروەها جیا بوو بەوەی، كە لە سەدەی ناوەڕاست هەبوو، بەوەی دامەزرانـدی ڕابردوو كیانێكی خەیاڵی سـەربەخۆ و بـە ژیـانی تایبـەت دروسـتكرد، ئیــدی كۆچــی خــەیاڵ بــۆ ڕابــردوو لــە زەینــی ڕۆمــان و ئەدەبــدا ئەنجامدرا...))[٦٣].

یان، وەكو ئەوەی "كۆبیت Kobit"، جەختی لەسـەر دەكـردەوە، لــەبارەی خراپــی و گرفتــی ســەدەی هەژدەهــەم، لــە كتێبەكــەی بـەناوی"پیاسـەی گونـدینی" لـە سـاڵی(١٨٣٠)، دەڵـێ: ((سیسـتەمی كۆمەڵایەتی چاخی ناوەندی تاكە چارەسەرییە))[٦٤]، كەواتە دەتوانین سوودەكانی نۆستالژیا بە كورتی لە چەند خاڵێكدا بخەینەڕوو:

(٦٣) كەریم دەشتی، ئەدەب و فەلسەفە، چاپی دووەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣، ل ٥٠.

(٦٤) سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١.

١. نووسەر و هونەرمەند کەسێکی پڕ لە ئازار و ژانە، بۆ کەم کردنەوەی ژانەکانی هات و هاوار دەکات و پەنا دەباتە بەر بیرەوەرییەکان، بە شێوەیەکی ژیرانە خۆی ئارام دەکاتەوە.

٢. لە کاتی پیربوون و تێکچوونی تەندروستی مرۆڤ، لە یەکەمین پەرچە کرداریدا هەوڵدەدات ڕێگەیەك بۆ ڕاکردن بدۆزێتەوە، ئەگەر نەتوانێ لە واقیعدا ئەمە بدۆزێتەوە، ئەوا ئارەزووی ڕابردووێك دەکات، کە تێیدا ژیانێکی خۆشی هەبووە، بەوە دەیەوێ ئەم واقیعە تاڵەی ئێستای پێ لە بیر بکات.

٣. پتەوکردنی ڕەسەنایەتی ڕابردوو، کە نووسەر دەیەوێ هەمیشە خۆی لەناو ئەم ڕەسەنایەتییە بدۆزێتەوە.

٤. نووسەر دەیەوێ کەموکورییەکانی ئێستای، بە باشییەکانی ڕابردووی پڕبکاتەوە.

٥. هێنانەوەی نموونەی شاعیرانی کۆن و کەسایەتییە نەتەوەیی و ئەفسانەییەکان و حیکایەت و پەند و ئامۆژگاری کۆن، بۆ سوود و مەبەستی ئامۆژگاری و بە بیر هێنانەوەی بۆ نەوەی نوێ و لەناو نەچوون و هەمیشە مانەوەی، وەك ڕەمز و کولتوورێکی نەتەوەیی و ئەخلاقێکی نیشتیمانی. ئەوەتا "ڕەسووڵ هەمزە تۆڤ " لەبارەی شیعر و بەرهەمی ئەدەبیەوە پێیوایە، دەبێ دوو عیشقی تێدا بێت، لێرەدا تەنیا باسی یەك عیشق دەکەین کە پەیوەندی بەکرۆکی بابەتەکەی ئێمەوە هەیە، کە دەڵێ: ((عیشقی یەکەم: کەلەپوور و

شوێنەوارە، واتە ئەو شتانەی لە باوانەوە جێ ماون، بۆیە تا ئێستا ئەو کڵاوەم پاراستووە، کە چیاییەکانی داغستان لەسەری دەنێن، مومکین نییە شاعیری کەلەپووری خۆی گوم بکات))[٦٥].

٦. یەکێك لە سوودە دیار و گرینگەکانی نۆستالژیا لە غوربەتدا تاکە دەرمان و چارەسەری دەردی غوربەت و دێوەزمەیی مەنفا و تاراوگە، گەڕانەوەیە بۆ بیرەوەرییەکانی وڵات و شوێن و یادگارییەکانی ڕابردوو.

٧. یەکێکی دیکە لە سوودەکانی نۆستالژیا خۆ بەتاڵکردنەوەی هەست و دڵ و دەروونی خودی کەسایەتی نووسەرە، لە ڕێگەی وشە و دەستەواژەی نۆستالژی.

٨. سوودێکی هەرە گرینگ و بەرچاوی نۆستالژیا لە بواری ئەدەب و هونەردا دروستکردن و بەرهەم هێنانی ئەندێشەی داهێنەرانەی دەقی ئەدەبییە، لەو ڕێگەیەوە وێنەیەکی تەژی لە ئێستێتیکا و هونەری بەرز و پڕ لە ڕامان و پێدانی گیانێکی زیندوو بە دەقەکە لە فۆرمێکی بەرزی هونەریدا بەرجەستە دەبێت، وەك ئەوەی "شێڤینمۆنوسی" دەڵێ: ((نۆستالژیا دەکرێ وزەی داهێنان بێت،

(٦٥) عەبدولرەحمان فەرهادی، دیداری غوربەت و زامداری نیشتیمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل ١٣.

کاتێـك نـەتوانێت بـە بـیرت بێتـەوە، نـاتوانیٚ یـاخیش ببێـت، بۆیـە نۆستالژیا زۆرجار داهێنەر گەرانەیە))[٦٦].

٩. نۆستالژیا دەبێتە هۆی بە فـەنتازیا کردنـی دەقـی ئـەدەبی بـە تایبـەتی ئـەو شـیعرانەی هـەڵگری شـوێنی یۆتۆپیـا و داهـاتووێکی نموونەیی و بەدی نەهاتوون.

١٠. سوودێکی دیکەی نۆستالژیا و گەڕانەوەکانی پێدانی چـەمکی شیعرییەتی دەقـە، واتـە دەقـەکانی لـە ئاسـتی هونـەری و بنیـاتی دا دەبێتە هۆی کۆ کردنەوەی ژانرە جۆر بە جۆرەکانی لەناو یەك دەقدا، کە ئەویش دەقی نۆستالژییە.

(66) http:// agora.qc./doss:ery/Nostalgie paul-marievouteaux,2002, 2/4/2013

## ١- ٨ نۆستالژیا وەکو هۆکارێك بۆ داهێنانی ئەدەبی

داهێنان پرۆسەیەکی گشتگیرە و پەیوەستە بە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤەوە، چونکە هەمیشە داهێنان بە واتای شتی نویێ و بەرهەمهێنانی بەرهەمی نویێ دێت، بەڵام داهێنان لە هەر بوارێکدا جیاوازە و پێویستی بە کەرەستە و میکانیزمی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ نموونە داهێنان لە بواری زانستیدا کەرەستە و پێداویستی جیاوازی پێویستە، وەك لە داهێنان لە بواری ئەدەبیدا، لەبەر ئەوەی ئەدەب بە هەموو ژانر و جۆرەکانییەوە، پەیوەستە بە داهێنان و دنیای وروژاندن و خەیاڵ و ئەندێشەی بەرزی هونەریەوە.

کەواتە، وەك گوتراوە "ئەدەب ئاوێنەی ژیانە" و ژیانیش تەژییە لە دیاردەی فرە چەشن و شانۆیی تۆمارکردنی ڕووداو و بەسەرهاتە جیاوازەکانە لە قۆناخ و سەردەم و شوێنە جیاجیاکانی مرۆڤەوە، بۆیە ئەرکی ئەدیب لە داهێناندا ئەرکێکی ڕووکەش و سادە و ئاسان نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی قورس و ئاڵۆزە.

"عەبدولموتەڵیب عەبدوڵڵا" لەبارەی داهێنانەوە، دەڵێ: ((من هەمیشە پێموایە پرۆسەی نووسینی شیعریی ئیبداعی پرۆسەیەکی ئاڵۆز و پڕ پەنادان و ڕەمز و ئاماژەی دیار و نادیارە، چونکە بەشی

زۆری خـەیاڵ و نەسـت ڕابەرایـەتی دەکـات))[٦٧]. کەواتـە نـاکرێ بـە هەموو شتێك بگوترێ داهێنان، بەتایبـەتی لـەبارەی داهێنـانی دەقـی ئەدەبیەوە، چونکە پەیوەستە بە کۆمەڵێك هۆکار و دیاردەی تایبـەت بـەزەوق و بـیر و ویـژدانی مرۆڤـەوە، کـە لـە ژیانیـدا لـەناو زەیـن و بیرەوەریدا دروست دەبێت و دەمێنێتەوە.

" دییو" دەڵـێ: ((هـەموو شـێوەکانی داهێنـان جـا هۆکارەکـەیان هەرچی بێ، هەموو پێکهاتە و هۆیەکانی هەڵچوونی کاریگەریان بەسەر داهێنانـەوە هەیـە))[٦٨]. کەواتـە ژیـان و ڕووداوەکـانی ژیـانی تـاك هۆکاری سەرەکی داهێنانن، ژیانی ئادەمیزادیش پڕیەتی لە دیاردە و خـەم و غوربـەت و حەسـرەت و ناخۆشـی و دووری لـە یـار و خۆشەویستان و مەرگ و مردنـی ئـازیزان و خـەون و خـەیاڵ و ئاواتـە لەبن نەهاتووەکانی مرۆڤە و.....تاد. ئەمانەش هەموویان حەسرەت و ئـاخ و داخ و ئـاوات و بابـەتی ئێمـەن، کـەوا نۆسـتالژیا لەسـەرخانیان دروست دەبێت، چونکە ((هەرچەندە هیچ مرۆڤێك نییـە بـۆ کاتێـك لـە کاتەکان بە جۆرێك لە جۆرەکان، ئەگەر بۆ ماوەی چەند چرکەیەکیش بێ هەست بە نامۆیی نەکات لـە ژیانـدا))[٦٩]، دواجـار ئـەم غوربـەت و

(٦٧) عەبدولموتەڵیب عەبدوڵڵا، داهێنان سەر بە کەشفکردن و خەون و دنیـا بینییـە، چـاپی یەکـەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢، ل ١١١.

(٦٨) فازیڵ شەورۆ، دوو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، چـاپخانەی حـاجی هاشـم، هـەولێر، ٢٠١٣، ل ٧١-٧٢.

(٦٩) سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١.

نامۆیی و نەهامەتی و دوورییە دەبێتە هۆکارێك بۆ داهێنـان، چـونکە نووسەر بۆ دەربڕین و خستنەسەر کاغـەزی یادەوەرییـەکانی، بێجگـە لە دەقی ئەدەبی و دنیای ئەدەب شتێك باوەشی بۆ ناکاتەوە، تاوەکو خەم و حەسرەتەکانی تێیدا بنێژرێت. لە ڕاستیدا ئێمە بە شـێوەیەکی ڕەها و بە موتڵەقی ناڵێین، هەموو دەقێکی ئەدەبی و هەموو شـیعرێك ئەگـەر نۆسـتالژیا و بابـەتی نۆسـتالژیا لـە خـۆی نـەگرتبێت دەقێکـی داهێنەرانە نییە و نابێتە دەق، نەخێر، بەڵکو نۆسـتالژیا و جۆرەکـانی هۆکارێکە لە هۆکارە گرینگ و بە بایەخەکانی داهێنانی دەقی ئەدەبی و وێنەی هونەری بەرز و خەیاڵاوی و ئەندێشەی بنیادنانی دەقەکەیە و بـە ئاشـکرا و بـە زەقـی دیاردەکـانی نۆسـتالژیا لـەناو بەرهەمەکـەدا پێکهاتەی سەرەکی دەقەکە پێکدەهێنێت.

بۆ نموونە **"محەمەد حەمەباقی"** لە شیعری (چاوشارکێ) لە کۆ شیعری (ژوان)دا، دەڵێ:

**(((چاو شارکێ)**

**بیرمە کاتێ منالیش بووم**

**حەزم لە بینینیت ئەکرد...**

**هەموو ڕۆژێ، ئەهاتمە بەر پلووسکی**

**هەنگوێنی تریفەی چاوت...**

**ئەی شەمامەی بێستانی سەوزی سووتاوم**

**وەرە لە پرسەی ئاواتی منالی گەورەبوونمانا**

**چاو شارکێیەکی تر فێر بین))**[٧٠]

ئەوەتا (گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی) بووەتە پێکهاتەیەکی سەرەکی داهێنانی دەقەکە و تێکەڵکردنی دوو وێنەی دژ بە یەك، لەلایەك گرێدان و بەستنەوەی سەردەمی منداڵی بە سەردەمی گەورەیی شاعیر و لە لایەکی دیکە ئاوێتە کردنی کاتی ڕابردووی بەسەر چوو، بە ئێستای ئامادەیی و ... .

وەك پێشتر لە چەمك و پێناسە و جۆرەکانی نۆستالژیادا ئاماژەمان پێکردووە، کەوا غوربەتی نیشتیمان و دووری و مەنفا و تاراوگە و گەڕانەوە بۆ ڕابردووی سەردەمی منداڵی و وشە و

---

(٧٠) محەمەد حەمەباقی، کۆشیعر (ژوان)، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ١٩٨٠، ل ٥٥–٦٠.

دەســـتەواژە کۆنـــەکانی نەتـــەوەیی و.....تـــاد، بابـــەت و ڕووحـــی نۆستالژیان، بۆیە دەکرێت لێرەدا ئاماژە بە چەند نووسەر و شاعیرێك بکەین، کەوا غوربەت و تاراوگە و گەڕانـەوەکانی ڕابـردوو بـە هۆکـاری سـەرەکی و داهێنـانی بەرهـەم و شـاکاری ئـەدەبی دادەنـێن، چـونکە دەبـێ ئەمـە لـەبیر نەکـەین، کـە داهێنـەری ئـەدەبی پێویسـتە سـێ خەسڵەتی هەبێت، ئەوانیش:

((١. کەسەکە ئەدیب، یان هونەرمەند، یان شاعیر بێت.

٢. داهێنەر بێت.

٣. له ژیانی غوربەت و نامۆیدا قاڵبووبێتەوە))[٧١].

"فرۆیـد" دەڵـێ: ((داهێنـان پەیوەنـدی بـە سـەردەمی منـداڵی و خەفــەکردنی ڕەمــەکی و حــەز و ئــارەزووە سێکســیە خەفــەکراو و تێرنەکراوەکانەوە هەیە))[٧٢].

هەروەها فرۆید زۆر گرینگـی بـە داهێنـان و هۆکارەکـانی داهێنـان لەلای نووسەر و هونەرمەندانەوە داوە، له لێکۆڵینەوەکانیـدا، پێیوایـە ((پەیوەندیـەکی بـەهێز لـە نێـوان تاقیکردنـەوە و بەسـەرهات و ڕووداوەکـانی سـەردەمی منـداڵی کەسـی داهێنـەر و بەرهەمـەکانیان

(٧١) فازیڵ شەوڕۆ، دوو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ل ٤١.

(٧٢) کـەریم شـەریف قەرەچـەتانی(د)، داهێنـانی هونەرمەنـد و ئـەدیبان لـە ڕوانگـەی سـیگمۆند فرۆیدەوە، گۆڤاری کاروان، ژمارە(١٣٥)، هەولێر، ١٩٩٩، ل ١٣٦.

هەیـە...))[٧٣].فرۆیـد لـە کتێبـی ((لێکدانـەوەی خەونـەکان، باسـی کۆمەڵێك بەرهەممان بۆ دەکات، کە پەیوەندی بە ڕابردوو، گەڕانەوەی سەردەمی کۆن و ڕووداو بەسـەرهاتەکانی سـەردەمی منـداڵی و مێـرد منداڵیەوە هەیە، لەوانەش:

"لیۆنـــاردو دافنشـــی ١٤٥٢–١٥١٩" و "دوستوفیســـکی ١٨٢١–١٨٨١" و شکسپیر "١٥٦٤–١٦١٦" و "سۆفلکیس" و چیرۆکی (٢٤ کاتژمێر لە ژیانی ئافرەتێك) و.....تاد.

کاتێـك باسـی نـامۆیی و غوربـەت دەکـەین، مـەرج نییـە کەسـانی دووره وڵات و تاراوگـە هـەموویان ئـەم خەسـڵەتەیان هـەبێت، چـونکە غوربـەت، چ غوربـەتی دووره نیشـتیمان بێـت، چ غوربـەتی نـاوەوەی نیشـتیمان بێـت هـەر غوربەتـە. "ڕەسـووڵ هـەمزە تـۆف" شـوێنی لەدایکبوون و زێدی خۆیی و دووربوون لێیەوە، کە گوندی "تسادا"یـە لـە "داغســتان"، دەکاتــە هۆکــارێکی ســەرەکی داهێنــان و لــە بەرهەمەکانی خۆیدا، دەڵێ: ((گوندی تسادای داغستان، کـە تێدا لـە دایکبووم و پەروەردە بووم و زۆر شتی پێویستی پێ بەخشیووم، ئەو زمانەی، کـە پێـی دەنووسـم، یادگـاریی بەچـێژی لابـەجێ هێشـتووم. بیرەوەرییەکی وەك تاوێری داومەتێ، کە ئێستا پەکی نەخستووم...، شیعر بە بێ داغستان لای من بوونی نییـە، مـن بـێ داغسـتان نـاتوانم

(٧٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٨.

شیعر بنووسم، داغستان هەموو شتێکی پێ بەخشیووم...))[٧٤]،
کەواتە نووسەر دان بەو ڕاستییە دەنێت، کەوا غوربەت و گەڕانەوە بۆ زێدی خۆی لەناو بەرهەمەکانیدا بووەتە هۆی داهێنان و هونەری بەرز و ناوازە. ئەگەر سەیری ئەم شیعرەی **"محەمەد عومەر عوسمان"**یش بکەین، لە دیوانی (لە غوربەتا) هەست بە داهێنانی هونەری دەکەین، کە بە هۆی غوربەت و نۆستالژیاوە، چ وێنەیەکی تراژیدی و ورووژێنەری داهێناوە.

**((ئیسماعیلێکم ئێستاکە... نەك چەقۆی ئیبراهیمی باوك**
**چەقۆی دەستی دێوی غوربەت سەرم ئەبڕێ**
**چ فریشتەیەك گیانداریێ ئەکاتە قۆچی قوربانی**
**ئەم غوربەتە؟!))**[٧٥].

دەبینین چۆن لە ڕێگەی سوود وەرگرتنی لە ڕەمزە ئایینیەکان و گەڕانەوە بۆیان وێنەیەکی فەنتازیی لە وشەی سادە و فەرهەنگی ڕۆژانەدا داهێناوە، بەلاّم پێدانی مانا و مەغزایەکی دەلالی بەرز بەو دیاردەیە، کە غوربەت، لە ڕێگەی دەستەواژەی (چەقۆی دێوی غوربەت)، چ وێنەیەکی تراژیدی و چ ترسێکی غوربەتمان پێدەناسێنێت، خود لێرەدا خۆی وا دەناسێنێت، کەوا دێوی غوربەت

(٧٤) عەبدولرحمان فرهادی، دیداری غوربەت و زامداری نیشتیمان، ل ١٣–١٤.

(٧٥) محەمەد عومەر عوسمان، لە غوربەتا، چاپخانەی نەورەس، سلێمانی، ١٩٨٥، ل ٦٨–٦٩.

سەری دەبڕێت، دەبینین، کەوا چۆن خەسڵەتێکی دڕندەی و بێ ڕەحمی (دێو) دەبەخشێتە شتێکی مەعنەوی و خودی کە غوربەتە.

لەبارەی کاریگەری تاراوگە و خەمی نیشتیمان لەسەر داهێنانی ئەدەبی "عەبدوڵڵا سەڕاج"، دەڵێ:((لەوەتەی هەم خۆم لەگەڵ خۆمدا غەریبم، غوربەت بووەتە حاڵەتێکی هەمیشەیی لە ژیانمدا، وەلێ دێوەزمەی غوربەتم بە کارکردن و هونەر بەزاندووە، لەوێ کاتم پڕە هەست دەکەم، دەتوانم شتی بە سوود بنووسم...، باوەڕ بکە بەقەد زەرەرەکە قازانجم کردووە،... من گلەیش لە ئاوارە بووندا ناکەم، چونکە وای لێکردووم بە ئەتلەسی بیرکردنەوەمدا بچمەوە و لەوێ هەموو شتێك لە بەردەستە...))[٧٦]، کەواتە هەرچەندە غوربەت و غەریبی و مەنفا هەستێکی ناخۆش و جەرگ بڕە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە، هۆکارێکی گرینگ و دیاری داهێنانی بەرهەمی نووسەر و شاعیرانە.

"شێرکۆ بێکەس" لەبارەی شوێن و غوربەت و سەردەمی منداڵی و بایەخ و گرینگی لەسەر داهێنانی دەقی ئەدەبی، دەڵێ: ((شوێن پێناسەی بوونی هەریەکێکمانە، ئەو کاتەی شوێن بزر ئەبێ، هەست ئەکەیت خۆتت بزر کردووە، هەست ئەکەیت لە درەختێکی هەڵکێشراو ئەچیت، تەنانەت شتە هەرە بێ بایەخەکانی ڕابردوو بایەخ پەیدا ئەکەنەوە، غەریبی لە تەمەن هەڵکشاودا ئازارەکانی سەختتر و

(٧٦) عەبدوڵڵا سەڕاج، دیدار بینییەکانم، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٣، ل ١٠٦ و ١٥٧.

قورسترە، چونکە سەر لە نوێ ڕوانەوەی ئەو لە شوێنی تر مەحاڵە، مرۆڤ لە مەنفا شتە ناشیرینەکانی ولاّتی لا جوان ئەبێتەوە...))[٧٧].

کەواتە، داهێنان ((ڕەنگدانەوەیەکی ئیلهام ئامێزی ناوەخت نییە، بەڵکو ڕەگ و ڕیشەی شۆڕبووەتەوە بۆ ناو ئەو بارە کۆمەلاّیەتیەی، کە نووسەر تێیدا ژیاوە))[٧٨]. کەواتە بەشێکی زۆری شاکارە ئەدەبیە مەزنەکانی جیهان لە هەناوی ئازار و ژاندا لە دایك دەبن، بۆیە دەگوترێت: کاتێك هەموو توخم و تیرێژ و بنەماکانی داهێنان لە مێشك و هزر و دڵ و دەروونی شاعیر، یان ئەدیب کۆ دەبنەوە و غوربەت و نامۆیش دەبێتە مامان و داینگەی ئەو هزر و بیرە، ئەوا شاکاری زیندوو ڕووحی دێتەبەر و بۆ هەمیشە چێژ و جوانی و هونەر و مەعریفەت بە مرۆڤایەتی دەبەخشێت.

"دانتی"، کە ((یەکێکە لە شاعیرە مەزنەکانی سەدەی ناوەڕاست، نموونەیەکی دیکەی نامۆیی و غوربەتە، کارەکەی بەناوی (ژیانێکی نوێ) توێژینەوەیەکی پوختە لەبارەی نامۆ بوونی خود))ە[٧٩]، هەروەها (گەردەلوول)ی "گۆتە" و (نامۆیی)ی "کامۆ" و.....تاد، دەتوانین بڵێین: دەقی داهێنەرانە ئەو دەقەیە، کە تەواو بوون

(٧٧) سەمیرە عەلی، شێرکۆ بێکەس، گۆڤاری (سورێنی نوێ)، ژمارە(٤)، ل ٤٨.

(٧٨) فازیڵ شەورۆ، دوو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ل ٧٥.

(٧٩) محمد عباس یوسف(د)، الاغتراب و الابداع الفني، ص ٩٦.

ناناسـێت و بـەردەوام لـە دووبـارە خـۆ بەرهەمهێنانـەوە دایـە، ئیستاتیکیەت و فەزا فرە ڕەهەندەکانی درێژ دەکاتەوە.

"باشلار" هەمیشە پێی وابووە، تەنیایی و غوربەت خۆی لە خۆیدا داهێنانە، کاتێك دەڵێ: ((مرۆڤ هەر بە سەلیقە دەزانێت ئـەو شـوێنەی بـە تەنیاییەکەیـەوە پەیوەنـدارە شـوێنێکی داهێنـەرە))[٨٠]. زۆرن ئەوانـەی لـە ڕێگـەی غوربـەت و دووری مـەنفاوە شـاکاری مـەزن و داهێنـانی گـەورەیان ئەنجامـداوە و ئـەدەبێکی زینـدوویان داهێنـاوە، ئەوەتا شاعیری بەناوبانگی عەرەب **"بدر شاكر السياب"** لـە شـیعری (جیکور) ـ کە ناوی گوندی زێدی شاعیرە ـ شاعیر دەیکاتە جیهانێکی هێندە مەزن و گەورە، دڵۆپە مێژووی ئـەم گونـدە بچووکە، دەریـایی مێژووی جیهان لە خۆیدا نقووم دەکات و چـەتری سـێبەری (جیکـۆر) شوێنی گۆی زەوی لە ژێریدا جێدەبێتەوە:

**جەیکور، جەیکور ئەی کێڵـگەی ڕۆشنایی ...**
**ئەی دەرگای ئەفسانەکان**
**ئەی دەرگای لە دایکبوونمان،...**[٨١]

---

(٨٠) جاستر باشلار، جماليات المكان، ترجمه: غالب هلسا، كتاب الأقلام، دار الجاحظ للنشر، بغداد، ١٩٨٠، ص ٤٧.

(٨١) کۆواری کۆڕی زانیاری (دەستەی کورد)، بەرگی ٢٩–٣٠، چاپخانەی کۆڕی زانیاری بەغدا، ٢٠٠٢، ل ٩٣.

یـــان **"پۆشـــکین"**ی بـــاوکی ئـــەدەبی ڕووســـی (١٧٩٩-١٨٣٧)لە چامەی (گوند)دا، ئاوا وەسفی ئەو شـوێنەی زێـدە و مـۆمی تەمەنی منداڵی تێدا کوژاندۆتەوە، دەکات:

**ڕۆژ باش ئەی مەڵبەندەکە**

**ئەی کونجی ئارامی و کار و ئیلهام**

**ئەی ئەو شوێنەی لە کۆشینیدا**

**بەختەوەری و فەرامۆشی و**

**چەمی پەنهانی ڕۆژانی ژینم تێ ئەپەڕێ...**(٨٢)

کەواتــە بــە خســتنە ڕووی ئــەم بەرهەمانــەی، نووســەر و شاعیرانی بیانی، هەروەها نووسەر و شـاعیرانی کـوردیش، گەیشـتینە ئەو ڕاستییەی، کەوا نۆستالژیا و ڕوواڵەتـەکانی کاریگـەر و هۆکـارێکی گرینگی ئەدەب و داهێنانی ئەدەبین، ئەمەی خستمانەڕوو مشتێکە لـە خەرمانێك، لە کاریگەری و هۆکارەکانی نۆستالژیا.

(٨٢) س.م.پترۆڤ، پۆشکین (ژیان و بەرهەمی شاکاری)، و: محەمەدی مەلا کـەریم، چـاپی الحـوادث، بەغدا، ١٩٨٣، ل ٢٢٩.

بەشی یەکەم

# تەوەری دووەم

## ٢-١ پەیوەندی نۆستالژیا بە ئەفسانەوە

ئەفسانە بەرهەمی کۆنە و زادەی بیر و هزری مرۆڤە، ڕەشماڵێکە، یان چەترێکە، توانای داپۆشین و لەخۆگرتنی زۆربەی بابەتەکانی هەیە. لێرەدا دەمانەوێت لایەك لە ئەفسانە بکەینەوە، بۆ ئەوەی بتوانین بەشی خۆمان لەناو ئەفسانەدا بەدەست بخەین و بەدەست بەتاڵی نەڕۆینەوە، چونکە دەبینین پەیوەندیەکی قووڵ لە نێوان ئەفسانە و شیعردا هەیە، ئەمەش کارێکی سەیر نییە، لەبەر ئەوەی ئەفسانە بەرهەمی لە مێژینەی هەموو مرۆڤایەتییە و بەرهەمێکی هەمە لایەنەیە و لە ئەنجامی پێویستییەکانی ژیان و حەز و ئارەزووە لەبن

نەهاتووەکانی مرۆڤ، کەڵەکەی کردووە و کۆبووەتەوە و گەیشتووەتە ئەمڕۆ، ئەوەتا دەگوترێ: ((ئەفسانە تەمەنی بە قەد کۆنی تەمەنی مرۆڤە لەو ڕۆژەوە، کە مرۆڤ توانای کار و بیرکردنەوەی پەیدا کرد، دەستی کرد بە ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی کۆمەڵ، ئەم گوتارە لە بووەتەی ئەفسانە و نەخش و پەیکەرتاشی و سەما و.....تاد، نەوە لە دوای نەوە لێکیان وەرگرتووە و دەیدەنەوەیەك))[٨٣]، کەواتە پەیوەندی نێوان شیعر و ئەفسانە پەیوەندیەکی لەمێژیینە و کۆنە، چونکە ئەفسانەکان بەرهەمی هزر و بیری مرۆڤی سەرەتایین، پڕیەتی لە حەز و هیوا و ئاوات و ئارەزوو و پیرۆزکردن و.....تاد، بە هەمان شێوەش شیعر بەرهەمی بیر و هزری مرۆڤە، کەواتە سەرچاوەی هەردووکیان، یان باشترە بڵێین، سەرچاوەی دەربڕین و گۆکردنی هەردووکیان مرۆڤ خۆیەتی.

نۆستالژیاش حاڵەتێکە پەیوەستە بە دڵ و هزر و دەروون و ناخ و حەز و ناخۆشی و دەرد و ژان و حەسرەت خواستن بۆ شتە لەدەست چووەکان و خەم بۆ خواردنیان لە لایەن مرۆڤەکانەوە، لەبەر ئەوەی ((نۆستالژیا هەستێکی سروشتی و گشتییە و تەنانەت غەریزەییە لە نێوان نەسڵی مرۆڤایەتی، بە شێوەیەکی گشتی لە نێوان هەموو

(□□) مەولوود ئیبراهیم حەسەن(د)، پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی،٢٠٠٧، ل٦٠.

مرۆڤـەکان))[٨٤]، کەواتـە نۆسـتالژیاش گرێـدراوە بـە مـرۆڤ و خـەم و حەسرەتی مرۆڤەکان و گەڕانەوە بۆ ئەو ژیانەی پێشوو، خەم خواردن لەم ژیان و سەردەمەی، کەوا تێیدا دەژییێت لە ئێستادا.

زۆرن ئەوانـەی باسـی پەیوەنـدی نێـوان شـیعر و ئەفسـانەیان کـردووە، بـۆ نموونـە "ڤیکتـۆر شکلۆفسـکی" دەڵێـت: ((ئەفسـانە شـێوەی یەکـەمی شـیعرە))[٨٥]، هـەروەك لـەم پێناسـەیەدا دیـارە ئەفسانەکان بەشێکی دانەبڕاون لە شیعردا.

ئەگەر ئەفسانە لە سەرەتادا بریتی بووبێت لە شتی پـڕ و پـووچ و خورافیات و درۆی گەورەی میللەتانی سـەرەتایی، هەڵبەتـە ئەمـە بـە ڕاوبۆچوونی کۆمەڵێك نووسەر و زانـای زانسـتی و مێـژووی و ئـایینی، کەوا ئەفسانە لە ڕوانگەی ئەمانەوە تەنیا شتی بێ بایـەخ و خـەیاڵاوی و پـڕ و پووچـن. ئـەم بـۆ چـوونە زیـاتر بـە سـەرهەڵدانی زانسـت و ڕووبـەڕوو بوونـەوەی زانسـت لەگـەڵ شـێوە کۆنـەکانی بیرکردنـەوەی ئەفسانەیی لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدە و نۆزدەم ڕوویانـدا لەسـەر دەستی "بیکۆن و دیکارت و نیـوتن"، ئەوانـەی دیکـە هـەر دەبووایـە زانسـت بـۆ بەگژداچـوونەوەی شـێوە کۆنـەکانی بیرکردنـەوەی ئەفسـانەیی و سـیحری بـەکاربێنن، ئـەم بـیرە بەشـێوەیەکی پتـەو

---

(٨٤) مهدی شریفیان(د)، بررسی فرێند نوستالژی در اشعار سهراب سپهری، ل ٥٣.

(٨٥) مەولوود ئیبراهیم حەسەن(د)، گەڕان بـە دوای نەمرییـدا، چـاپخانەی ئـاراس، هـەولێر،٢٠٠٢، ل ٢٣.

کۆلەگەکانی خۆی داڕێژێت. (بیرۆکەکەش ئەوە بووە ناکرێت، کە زانست تەنها لە ڕێگەی جیهانی هەستەکانەوە هەبێت، دنیای هەستکردن، دنیایەکی وەهمییە و دنیایی ڕاستەقینەش تەنیا بە عەقڵ دەتوانین لێی تێبگەین، کە بە شێوەیەکی سەیر لەگەڵ ئەو بەڵگە ساختانە ناکۆك بوو، کە هەستەکان پێشکێشیان دەکرد...)[٨٦]، بەڵام لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتایی سەدەی بیستەم، گرینگییەکی زۆر بە ئەفسانەکان درا و لێکۆڵینەوەی زۆریان لەبارەوە کرا، ئەم لێکۆڵینەوانە پانتایەکی فراوانی لەناو ئەدەبدا، داگیرکرد، ئەگەر سەیری ئەدەبی هاوچەرخ بکەین، هیچ ژانرێك نادۆزینەوە، کەوا سوودی لە ئەفسانە و ڕەهەندە ئەفسانەییەکان وەرنەگرتبێت، شیعری نوێ بووە، هەڵگری چەمکی ئەفسانەی و مۆتیڤی ئەفسانەیی و پڕیەتی لە کارەکتەر و بیر و هزری ئەفسانەیی، چونکە ((شیعر بەشێکی گرینگی ئەدەبە و ئەدەبیش لکێکی سەرەکی هونەرە و ئەویش پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ ئەفسانە میللییەکاندا هەیە، بۆیە گەلێك لە ڕەخنەگرانی ئەدەبی هاوچەرخ لەو بڕوایەدان، کە شیعر و ئەفسانە پەیوەندیەکی بەهێزیان لە نێواندا هەیە، هەردووکیان لە بنچینەدا دەچنەوە سەر یەك چاوگە، چونکە ئەفسانە لەو

---

(٨٦) کلۆد لیڤی شتراوس، ئەفسانە و واتا، و:خالید عوسمان، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ١٦.

سەردەمەدا، پەیدا بووە، کە میللەتان نەك بە بیری ئاسایی، بەڵکو بە وێنەی شیعری بیریان دەکردەوە و لە شت تێدەگەیشتن)).[٨٧]

گرینگی دان بە ئەفسانە یەکێکە لە بابەتە گرینگەکانی شیعری هاوچەرخ، ئەمەش بەرهەمی هۆشیارییێکی قووڵە بۆ سروشتی ئەفسانە، ((ئەم هۆشیاریەش پشت بە دەسکەوتەکانی زانستی، وەکو دەروونناسی و ئەنترۆپۆلۆژیا دەبەستێت)) [٨٨] شاعیرانیش پەنا بۆ ئەفسانە دەبەن، چونکە بەشێکە لە پێکهاتەی بیر و تێگەیشتنەکانیان و لە ئەدەبەکەیاندا دەردەکەوێت. ئەگەر سەیری چەمك و هزری شیعری ئەمڕۆمان بکەین، دەبینین هەڵگری هەمان هزر و بیری ئەفسانەکانن، کە بریتی بوونە لە (گەڕان بە دوای بەخت و دڵداری و گەڕان بە دوای نەمریی و ژیان و مردن و ڕاکردن لە مردن و خۆ ڕزگارکردن لێی و خۆشگوزەرانی و ململانێ...).

بایەخی ئەفسانەکانیش دوای ئەم هەوڵ و تێکۆشان و توێژینەوانە ڕەنگی دایەوە، کە لە بوارەکانی دەروونی و کۆمەڵناسیەوە دران، چونکە ئەوان پێیان وابوو ئەفسانەکان بەرهەمی بێ ئاگایین و بە بێ ئاگاییەوە هاتوون، پەیوەستن بە نەست و دەروونی مرۆڤەکانەوە، هەروەك "یۆنگ و فرۆید" جەختیان لەسەر دەکردەوە. کەواتە لەبەر

(٨٧) کەریم شارەزا، کەرەستەی ئەفسانە لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، گۆڤاری (نووسەری کورد)، ١٩٧٣، ل ٤٤.

(٨٨) رمضان الصباغ(د)، في النقد الشعر العربي المعاصر، دار الوفاء، ط(١)، مصر، ٢٠٠٢، ص ٣٤٤.

ئەوەی نۆستالژیاش سەرەتا بابەتێکی دەروونی بووە و پەیوەندی بە دەروونی مرۆڤەکانەوە هەبووە و پاشان لە زانستی دەروونناسیەوە هاتووەتە ناو ئەدەب و ئەدەبیات، ئێستاش بە شێوەیەکی بەرچاو لەلایەن میللەتانەوە، گرینگی پێدەدرێت و توێژینەوەی لەبارەوە دەکرێت، نووسەر و ڕەخنەگرانی ئەدەبی بەخۆیەوە خەریکردووە، بەڵام بۆ ئەدەبی کوردی لایی لێ نەکراوەتەوە، یان زۆرکەم باسی لێوە کراوە.

ئەفسانە هەوڵدانە بۆ تێگەیشتنی ئەو دیاردانەی پێیەوە پەیوەستن، یان لێکدانەوەیە، کە بۆ ئەو کارەسات و مەینەتیانەی ڕوودەدەن، بۆ ئەو هەموو دیاردانەی، کە یەکتر تەواو دەکەن، کەواتە جیهانی ئەفسانە بەربلاوە و زۆر بوار دەگرێتەوە، بۆیە شاعیر خەیاڵی خۆی ئاوێتەی ئەفسانەکان دەکات و لە ڕێی ئەفسانەکانەوە خۆی دەگەینێتە دیاردەکان، هەروەکو لەم بارەیە "ڕۆلآن بارت" دەڵێت: ((شیعر خۆی بریتییە لە دارشتنەوەی ئەفسانە، یان بەرهەمهێنانی ئەفسانەی نوێ))[٨٩] ،کەواتە بە پێی ئەم بۆچوونانە، شیعر گێڕانەوەی بیرەوەری و ڕووداوە مێژوویەکان نییە بە ڕووتی، بەڵکو خەیاڵاوی کردنی هەموو دیاردەیەکە، لە بەرگێکی ئەفسووناویدا.

(٨٩) هاوژین سلێوە عیسا، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعرەکانی شێرکۆ بێکەس دا، چاپخانەی سەردەم، ل ٣١٩.

ئەگەر نۆستالژیا گەڕانەوە بێت بۆ ڕابردووی کۆن و گەڕانەوە بێت بۆ سەردەمی منداڵی و مێرد منداڵی و گەنجییەتی، یان گەڕانەوە بێت بۆ زەمەنی زوو، شتەکۆن و کولتووری نەتەوەیی و شارستانیەتی کۆن و مەسەلەی ژیان و مردن و پیری و ترسی مردن و خەم خواردن بۆ داهاتوویێکی باڵا و نموونەی و.....تاد.

ئەوا خۆی لە خۆیدا ناوهێنانی ئەفسانە نۆستالژیایە، چونکە یەکێك لە لایەنە بەرچاوەکانی خەمی غوربەت، ئەفسانە سازییە، لە ڕاستیدا ئەفسانەکان، سەر لە نوێ بنیادنانەوەی جیهانی سەرەتایی، یان هەمان بەهەشتی لەدەستچووە، بەم تێڕوانینەوە، ئەفسانەش باری نۆستالژیای تایبەت بە خۆی هەیە، ((ئەفسانە بەشێك لە ژیانی زەمەنی منداڵی مرۆڤایەتییە، کە تەواو بووە و بە شێوەیەکی پۆشراو ئارەزووەکانی زەمەنی منداڵی مرۆڤ بە خۆیەوە دەگرێت))[٩٠]، یەکێك لە خاسیەتەکانی دەقی نۆستالژیاش، بریتییە لە: ((ئاوڕدانەوە و گەڕانەوە بۆ ڕابردووی کۆنی پڕ سەروەری و بە پیرۆز سەیرکردنی ڕابردوو))[٩١]، ئەفسانەش بەشێکە لە ڕابردوو، بۆیە شاعیری ئەڵمانی "شیللەر (shiller)" لە شیعرێکیدا ((هیواخواز بووە، کە چاخ و

(٩٠) کارل آبراهام، رؤیا و اسطوره، ترجمه: جلال ستاری، جهان اسطوره شناسی، تهران، مرکز، ١٣٧٧، ص ١١٦.

(٩١) علی باقر طاهری نیا(د) و نسرین عباسی، بررسی پدیده نوستالژی (غم غربت) در اشعار ابن خفاجه، پژوهشنامه ادب غنایی،ص١٥٣.

سەردەمی شاعیرانی یۆنانی بگەڕێتەوە، کە ئەوسا ئەفسانە لایان هێزێکی زیندوو بووە))[٩٢]. هەر لەم بارەیەوە "ریتا عوض"، دەڵێت: ((شیعری عەرەبی ڕەسەن لە کولتوورەوە ڕەگی داکوتاوە و لك و پۆپەکانیش لە هەوای ڕۆژگار هەڵدەمژن، بەرهەمەکەش لە ئەنجامی بە یەکگەیشتنی ڕابردوو و ئێستا دایە و بەرهەم دێت))[٩٣]، کەواتە ئەفسانەکان دنیایەکی پڕ لە نهێنی و داهێنانیان لەخۆ گرتووە، چونکە سەرچاوەکانیان خەم و ناخۆشی و حەسرەت و ئارەزووە لەبن نەهاتووەکانی مرۆڤە، لێرەوەش ئەفسانە دەبێتە کەرەستەیەك شاعیری نۆستالژیا نووس، گەلێ جار سوودی لێ وەردەگرێت.

بۆ سەلماندنی بوونی پەیوەندی لە نێوان نۆستالژیا و ئەفسانە پەنا بۆ کۆنترین دەقی جیهانی دەبەین، کەوا ئەفسانەی سۆمەرییەکان و داستانی ئەفسانەیی "گلگامێش"ە.

نۆستالژیا لەناو ئەم دەقە ئەفسانەییە، نەك هەر بوونی هەیە، بەڵکو ئەم دەقە دەقێکی نۆستالژی و لێوان لێوە لە نۆستالژیا، چونکە بابەتی سەرەکی، یان بیر و هزری سەرەکی ئەم داستانە "گلگامێش"، گەڕانە بە دوایی نەمریی و خۆ ڕزگار کردنە لە مەرگ و

(٩٢) کەریم شارەزا، ئەفسانە لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چاپخانەی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ١٣-١٤.

(٩٣) ریتا عوض، أسطورة الموت و الإنبحاث فى الشعر العربى الحديث، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت، ط١، ١٩٧٨م، ص ٨.

مردن، ئەوەتا ترسی مردن وا لە گلگامێش دەکات بە دوایی گیایی نەمریی دا بگەڕێت و خۆی و شارەکەی پێ ڕزگار بکات، بە تایبەتی دوایی مردن و بینینی مەرگی هاوڕێکەی "ئەنکیدۆ"، ئەگەر بە جۆرێکی دیکە و لە دیوێکی دیکەدا ڕاڤەی بۆ بکەین، دەبینین ڕەتکردنەوەی شتێك واتە قبوولکردنی پێچەوانەکەیەتی، بۆ نموونە کاتێك گلگامێش بەدوای نەمریی دادەگەڕێت، بێگومان پێچەوانەی قبووڵ نییە، کە مەرگ و مردنە. ئەمەش بابەتێکی بەرچاوی نۆستالژیاییە و قسەی زۆری لەبارەکراوە، چونکە یەکێك لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی و دروستبوونی نۆستالژیا، بریتییە لە ((دەردی پیری و خەم و حەسرەت بۆ گەنجییەتی و ترسی مەرگ و مردن))[٩٤]، دەردی "گلگامێش"یش ئەمەیە، ئەوەشی ئەم ئەفسانەیە دەکات بە دەقێکی نۆستالژیا، ئەوا ئەو هێزە خودییەیە، کە لە ناخی گلگامێشدا پەنگی خواردووەتەوە و کردوویەتی بە کەسێکی نۆستالژی، چونکە لە ناخەوە خەریکی خۆخواردنەوە و لەناو چوونە و تەواوی ژیانی پڕ دەبێت لە حەسرەت خواردن و خەمی قووڵ و نەبڕاوەیی و ڕەشبینی و تامەزرۆیی و ئاواتخواستن بۆ گەیشتن بەو شتانەی، کەوا لە ڕابردوو هەبووە و لەدەستدانی خۆشەویست و ئازیزانی، وەکو: یار ــ هاوڕێ ــ منداڵ ــ خێزان...، ئەمانەش هەموو

(٩٤) مهدی شریفیان(د)، بررسی فرایند نوستالژی در اشعار سهراب سپهری، مجلەی زبان و ادبیات فارسی، شمارە(٥)، ص ٥١–٧٢.

کرۆکی بابەتی نۆستالژیان و لە گلگامێشدا هەن. بەتایبەتی دوایی لەدەستدانی "ئەنکیدۆ"ی هاوڕێ و برای، دەبینین حاڵی "گلگامێش" چی بەسەر دێت و چۆن لە ناخەوە دەسووتێ و کڵپەی ناخی و حەسرەت و شەیدایی بینینی هاوڕێکەی چی بەسەر دێنێ، تەواوی ژیانی دەکات بە گەڕان بە دوایی هاوڕێکەی و داوا لەخودا دەکات، سێبەری "ئەنکیدۆ"ی هاوڕێی، بۆ یەکجاریش بێت نیشانی بدات و قسەی لەگەڵدا بکات، وەکو پێشتر ئاماژەمان پێیدا، لە دەستدانی ئازیزان خاڵێکی گرینگی نۆستالژیایە. گلگامێش، دەڵێت: ((**ناوم گلگامێشە، لە شاخەکانی ئەنووە بۆ ئێرە هاتووم، ڕێگایەکی یەکجار زۆر درێژ، ڕێگای شەمشم بڕیوە... ئێستا (ئوت نەپیش تیم دوور)**(*) **سەرەنجام نیگای چاوەکانم کەوتە سەر تۆ، ئوت نەپێش تیم دوور بە گلگامێشی گووت: بۆچی ڕوخسارت وەها ژاکاوە بۆچی نێو چاوانت وەها ڕەش هەڵگەڕاوە؟ بۆچی دەروونت وەها شێواوە؟ بەژنت وەها چەماوەتەوە؟ بۆ چی ئازارت لە گیانتدا لانەی کردووە؟ ... بۆچی... ؟ بۆچی... بۆچی...؟.**

**پاشان گلگامێش بە ئوت نە پیش تیم دوور دەڵێت: چۆن ڕوخسارم نەژاکێ و چۆن نێو چاوانم ڕەش دانەگەڕێ! ؟ چۆن دەروونم نەشێوێ و چۆن بەژنم نەچەمێتەوە؟چۆن ئازار لە گیانمدا لانە نەکا! چۆن، هەروەکو هەڵوەدایی ڕێگا دوورەکان نەیەمە بەرچاو...، چۆن**

---

(*) ئوت نە پیش تیم: خوداوەندی دۆزینەوەی ژیان و بەختەوەری لەناوداستانی گلگامێشدا.

**لە دوورەکان لە دەشتە دوورەکانەوە، بە لەز بۆ ئێرە نەیەم؟!...،برا بچووکەکەم، پڵنگی دەشت "ئەنکیدۆ"ی هاوڕێ گەنجەکەم، کە خۆی لە هیچ شتێ درێغی تا لە کێوی سەدر بۆ سەرێ هەڵکشاین، تاکەڵەگای ئاسمانمان گرت و لە خوێنمان گەوزاند تا (خۆمبەبا)(*) یان ئەوەی کەماڵی لە جەنگەڵی پیرۆزی بوو...، ئەنکیدۆ ئەوەی من خۆشمدەویست، ئەوەی من زۆرم خۆشدەویست... شەش شەو وشەش ڕۆژ بەسەری گریاوم و نەمخستە خاکەوە، تا ئەوساتەی کرمی کەوتێ، من لە مەرگ تێ گەیشتم و فێری ترسان لە مەرگ بووم، هەر بۆیە ڕووم کردە دەشتەکان...، چارە نووسی هاوڕێکەم یەکجار گران لەسەر من کەوت...، چۆن دەتوانم خامۆشبم؟ چۆن**

**دەتوانم هاوار بکەم؟ هاوڕێم بووەتە خاك، ئایا نابێت منیش ئارام ببمەوە و ئیدی تا ئەبەد را نەبمەوە؟!))(٩٥)**

ئەگەر سەیری ئەم دەقە بکەین لە داستانی ئەفسانەی "گلگامێش" دەبینین دوای لەدەستدانی ئازیزترین هاوڕێی گلگامێش، کە تەنانەت بە برای بچووکی خۆی ناوی دەبات، چ گریان و فیغانی لەناو ناخی و دڵ و دەروونی گلگامێشدا دروست دەکات و هەستی

(*) خومبەبا: پاسەوانی جەنگەڵی کاژ (دارستانی پیرۆز) بوو، کە لە لایە (ئنلیل) خواوەندی خاك و سەر زەوییەکان ئەم ئەرکەی لەناوداستانی گلگامێشدا پێبەخشرا بوو.

(٩٥) ئەحمەد شاملوو، داستانی گلگامێش، و: ئیدریس شێخ شەرەفی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٥٣.

پێدەکرێت، چۆن هەموو هەوڵێکی دەبێتە گەڕان بۆ دۆزینەوەی ڕووحی هاوڕێکەی و گەڕان بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك بۆ نەمریی و ژیان و بەردەوامی ژیان، ئەمەش ئەو پەڕی نۆستالژیایە، نۆستالژیای لە دەستدانی ئازیزان ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکەی ترسی مردن و لەناوبردنی گلگامێش لە لایەن مەرگ و ترسی مردن و خۆ ڕزگارکردن لە لایەکی دیکەیە. ئەگەر مانا دەلالییەکانی ئەم دەقە بخەینەڕوو، دەبینین هەڵگری ڕامان و هزری ئەو دیوی شتەکانن، ئەفسانەکان خۆیان واتا دەبەخشن بە شتەکان، هەر ئەمەش بوو، کەوا "لیڤی شتراوس" جەختی لەسەر دەکردەوە، کاتێك دەیگووت: ((ئەفسانەکان هەڵگری واتا نین، بەڵکو خۆیان واتانە))[٩٦].

لەشوێنێکی دیکەی ئەم ئەفسانەیە، گلگامێش بە تەواوی حەسرەت بۆ ڕابردووی لە دەستچوو دەخوات، دەگەڕێتەوە سەردەمی گەنجییەتی و سەردەمی هێز و توانا و دەسەڵات داری، بە تایبەتی کاتێك گیای نەمریی دەدۆزێتەوە دڵخۆشی دەردەبڕێت و دەڵێت: ئەوجا گەنج دەبمەوە و بەهێز دەبمەوە، وەکو سەردەمی گەنجی، کەواتە گلگامێش لێرەدا پیری دەترسێت ، چونکە واتای خوێندنەوەی وشەکان و واتا دەلالییەکانی ئەو دیو وشەکان هەڵگری ئەو مانایەن، کە دەبینین لێرەدا نۆستالژیا دەبێتە ژیانی گلگامێش، کاتێك مارەکە

---

(٩٦) رانیا سەمارە، ئەفسانە و ئەدەب، و: حوسێن سابیر عەلی، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٣٢.

ڕووەکەکەی لێدەخوات، هەموو هیوا و حەز و دڵخۆشی و ئاواتەکانی گلگامێش لە گۆڕدەنێت و سەرتاپای دەکات بە بڵقی سەر ئاو. دەبینین چۆن هەستی نۆستالژیایی گلگامێش بۆ گەڕانەوەی بۆ نیشتیمانی "ئوور" و نەمریی بەخشین بە هاوڕێ و هاونیشتیمانیانی لە دەستدەدات و بەمەش حەسرەت و دەرد و ناخۆشی و ڕەشبینی بە چارە و ژیانی گلگامێش دیاردەبێت، ژیانی لێدەکات بە دۆزەخ، تاوەکو بەو داخ و ئاواتەوە سەردەنێتەوە، چونکە ڕووالەتێکی نۆستالژیا بریتییە لە ((خەم و ژانی پیر و مردن و ترسی مردن))[٩٧] ئەمە یەکێکە لە هۆکارەکانی دروستبوونی نۆستالژیا لە لایەن مرۆڤ بە گشتی، بە تایبەتی کاتێك ((**گلگامێش بە ئوت نە پیش تیم دوور دەڵێ: ئێستا دەبێ چی بکەم؟ ئەی ئوت نە پیش تیم ڕوو لەکوێ بکەم؟ خەو وەکو دز ڕفاندوومی مەرگ لە خەودا دانیشتووە، لە (کۆلیتەکەم)[*] و لە هەر جێیەك بم مەرگ لەوێ ئامادەیە؟!**))[٩٨].

هەر وەکو ئاشکرایە مرۆڤ کاتێك بێزار دەبێت لەو ساتە وەختەیی، کەوا تێدا دەژیت، ئەمە وای لێدەکات سکاڵا و گلەیی و گازاندە لەم ڕۆژگارەی ژیانی بکات و حەز بکات بگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو، ئەو

---

(٩٧) مهدی شریفیان، بررسی فرآیند نوستالژی در اشعار سهراب سپهری، مجلەی زبان و ادبیاتی فارسی، ص ٥٢.

(*) کۆلیتەکەم: بە مانای شوێنی مانەوە شوێنێکی ناخۆش و بچووك، زیاتر بە شوێنی مریشك و سەگ و کۆتر و سەگ،،،تاد.دەوتری .

(٩٨) ئەحمەد شاملوو، داستانی گلگامێش، و: ئیدریس شێخ شەرەفی، ل ٦٣.

ساتانەی دڵی خۆشبووە و ژیـانی پـڕ بـووە لـە خۆشـگوزەرانی و ئـەو کاتەی تەمەن بەسـەر نەچـوو بـوو، گەنجیـەتی هێـز و توانـا و هیـوای هاتنــەدی ئومێـدەکان بـوو، چـونکە ڕوواڵـەتێکی دیکـەی نۆسـتالژیا، بریتییـە لـە ((گەڕانـەوە بـۆ ڕابـردووی گەنجیـەتی و منـداڵی و مێـرد منداڵی، یان حەسرەت خواستن بـۆ ڕابـردوو))[99]. دوای لـە دەسـتانی گیــای نــەمریی، دەبیــنین، گلگــامێش چــۆن ســکاڵا دەکــات و لــەم بارودۆخەی ئێسـتایی، بێـزار دەبێـت و ئـاواتی گەڕانـەوە دەخوازێـت، بەڵام مەحاڵـە و ئـیتر تـەواو، تـازە دوێنـی بـوو بـە ڕابـردووی ئـەمڕۆ، ئەمڕۆش دەبێتە نۆستالژیایی بەیانی و هەروەك ئەو کاتەی گلگـامێش بە "ئورشە نەبی" دەڵێت: **((ئەوەتا گیایەکـە لێرەیـە، لـە لای منـە! ئەوە ئەو گیایەیە، کە گەنجییەکی نەمریی دەبەخشێ، حەسرەتی بە سۆی ئادەمیزاد ئێستا دێتەدی... ئەوەتا ئەو گیایەیی، کە هێزەکانی گەنجێتی دەپارێزێـت و دەمـەوێ بیبەمـەوە بـۆ ئـوروکی بـە شـوورە دەوردراوی خـۆم دەمـەوێ دەرخـواردی هـەموو پاڵەوانـەکانی خـۆم بدەم... ناوەکەی بەم چەشنەیە (پیر، جارێکی دیکە گەنج دەبێتەوە) من لێی دەخۆم بۆ ئەوەی هێزەکانی گەنجیتیم بێتەوە بەرم...))**[100].

(٩٩) مهدی شریفیان(د)، بررسی فرآیند نوستالژی در اشعار سهراب سپهری، مجلەی زبـان و ادبیـاتی فارسی، ص ٥٢.

(١٠٠) ئەحمەد شاملوو، داستانی گلگامێش، و: ئیدریس شێخ شەرەفی، ل ٦٤.

وەکو دەبینین وشەکانی: (پیری ــ گەنجیەتی ــ نەمریی ــ مردن ــ گەڕانەوە بۆ گەنجیەتی ــ غوربەتی درێژ و گەڕانەوە بۆ گەنجیەتی ــ غوربەتی درێژ و گەڕانەوە بۆ نیشتیمانی خۆی زێدی یەکەم دایك (ئوروك)...، تادیکە). لەم دەقەی سەرەوە بوونیان هەیە، ئەمەش ڕێك و ڕەوان بابەتی ئێمەیە و بناخە و هۆکاری سەرهەڵدانی هەستی نۆستالژیان، دواتر گلگامێش بە نائومێدی لەم غوربەتە دەگەڕێتەوە وڵاتی خۆی و مردن لە ئامێزی دەگرێت.

لەڕاستیدا نموونەی ئەفسانە زۆرن بۆ هێنانەوەی، وەکو بەڵگەی بوونی نۆستالژیا و خاسیەتەکانی نۆستالژیا. هەروەکو: "ئەلیادە و ئودیسا"، یان ئەفسانەی (میرمح ــ مه)، کە ئەفسانەیەکی کوردی ئێزیدییە، چەندین نموونەی دیکە هەن، بەڵام بە باشمان زانی تەنیا "گلگامێش" بکەین بە نموونە، چونکە لای هەمووومان ئاشکرا و ناسراوە.

سوود وەرگرتنی ئەفسانە بۆ نووسینی شیعری تازە، لە سەردەمی پەرناسیەکانەوە بایەخی زۆری پێدرا و گەڕانەوەی شاعیر بۆ ڕەگەزی کەلەپووری و ئەفسانەی کۆن، سەرەتا لە ڕۆژئاوا دەستی پێکرد، ((شاعیری ئینگلیزی "ت.س.ئیلیەت" یەکەم کەس بووە ئاوڕی لە نرخی ئەفسانە داوەتەوە لە شیعری نوێدا، لە ئەدەبی عەرەبیش "بدر شاکر السیاب" و " عبدالوهاب الباتی" دوو شاعیری سەرکەوتوو بوون لە سوود وەرگرتنی لە ئەفسانە، "خلیل حاوی" و" ئەدۆنیس"یش،

ئەوانیش کەوتوونەتە بەر کاریگەری شاعیرانی ڕۆژئاوا...))[١٠١]. ئاوڕ دانەوەی شاعیرە هاوچەرخەکانی جیهانی لە سەدەی بیستەم بۆ ئەفسانە، ئەوە دەسەلمێنێت، کەوا ئەفسانە هەستێکی نوێی لەلایی شاعیرانی هاوچەرخ دروستکردووە، بەرانبەر بە ڕابردوو و هەموو ئەو ڕووداوانەی، کە لە ئەنجامی پەیابوونی تەنگ و چەڵەمەی ژیان و لەسایەی شارستانیەت و زانست و تەکنیکی نوێوە هاتووەتە بوون، چونکە ((ئەفسانە بووەتە خاسیەتێکی بەرچاوی شیعری هاوچەرخ، شاعیر بە هۆیەوە دەتوانێ سۆز و ئاواتەکانی هەندێ جاریش مەترسیەکانی بە ڕەمزی ئەفسانەی دەربڕێت))[١٠٢].

کەواتە: لێرەدا دەگەین بەو ڕاستیەی، کەوا ئەفسانە و شیعر دوو ڕووی یەك دراون، چونکە هەردووکیان بەرهەمی زادەی هزر و خەیاڵی مرۆڤن لە سەردەمە جیاجیاکان، لەبەر ئەوەی مرۆڤایەتیش هەر لە سەرەتاوە، واتە لە بەرهەمە ئەفسانەیی و داستان و فۆلکلۆر و ئەدەبی میللی و تادەگات بە ئەدەبی هاوچەرخی ئێستامان، تەژییە لە بابەتی خەم و دووری و حەسرەت و ناخۆشی و گەڕانەوە، بۆ ژیانی پێشوو، خەمی لەدەستدانی ئازیزان و بیرکردن لە مەرگ و مردن و گەڕان بە دوایی نەمریی و بەدەستهێنانی دڵدار و خەمی نیشتیمان

(١٠١) کەریم شارەزا، کەرستەی ئەفسانەی لەشیعری هاوچەرخی کوردیدا، ل١٥.

(١٠٢) سەرچاوەی پێشوو، ل١٦.

و.....تاد، ئەمانە هەمووی بابەت و پێکهاتەی دیار و بەرچاوی نۆستالژیان و نۆستالژیایان لەسەر دامەزراوە، نۆستالژیای ئەفسانەیی، یان کولتووری، یان مێژووی، یان ناوداران و.....تاد، بەشێکی گرینگ لە شیعری زۆربەی شاعیران داگیر دەکات، بەکارهێنانی ئەفسانە بەم شێوە بڵاوە لە شیعری هاوچەرخدا بەو مانایە دێت، کەوا شاعیرەکان ئاواتە خوازی ئەو سەردەمەن و بە پیرۆز و باڵا لە قەڵەمی دەدەن و پێیان وایە، کەوا ئیتر دووبارە بوونەوەی مەحاڵە و هەرگیز ناگەڕێتەوە، بوون بە ڕابردوو، بوونە بە نۆستالژیا، چونکە نۆستالژیا ((بەو روئیایە دەگوترێت، کە لە ڕابردووی پڕ سەروەری سەرچاوە دەگرێت، ڕابردوویەك، کە ئیتر بوونی نییە و سەر لە نوێ بنیادنانەوەی کارێکی مەحاڵە))[١٠٣]. ئەگەر ئاوڕێك لە ئەدەبی کوردی بدەینەوە دەبینین، بەکارهێنانی ئەفسانە و سوود وەرگرتنی ئەفسانە لە شیعری نوێی کوردیدا هەر لە "گۆران"ی شاعیرەوە بە شێوەیەکی بەرچاو دەست پێدەکات، تا دەگاتە ئەمڕۆش بەردەوامە، بەڵام گرینگی و بایەخی ئەفسانە و کەلەپووری کۆن و فۆلکلۆر و حەکایەتە میللیەکان، لە دوای دەرکەوتنی گرووپی (**ڕوانگە: جەلالی میرزا کەریم، شێرکۆ بێکەس، حوسێن عارف، جەمال شارباژێڕی، کاکە مەم بۆتانی** )، هەروەها گرووپی (**کفری: لەتیف**

(١٠٣) محسن میر صادق، نوستالوژی در شیعری قیصر امین پور، حوزه، سزی ستان مرکزی، ص٥٣.

**هەڵمەت، فەرهاد شاکەلی، ئەحمەد شاکەلەی)**ەوە، زیاتر دەرکەوت، لەوانەش ئەگەر سەیری شیعرەکانی "شێرکۆ بێکەس، لەتیف هەڵمەت" بکەین، دەبینین بەرهەمەکانی پڕن لە وێنە و بیر و هزری ئەفسانەیی، دواتر لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم زیاتر و بەرچاوتر سوود لە ئەفسانەکان وەرگیران بە تایبەتی دوایی سەرهەڵدان و دەرکەوتنی گرووپی (**پێشڕەو: جەلال بەرزنجی، سەباح ڕەنجدەر، دڵشاد عەبدوڵڵا، ئەنوەر مەسیفی، هاشم سەڕاج، عەباس عەبدوڵڵا یووسف)**کەوا کۆمەڵێك لە شاعیری هاوچەرخی لە خۆگرتبوو.

## ٢- ٢ پەیوەندی نۆستالژیا بە سۆز وعاتیفە/خولیاوە

سۆز و خولیا کاریگەریەکی زۆر و بەرچاوی بەسەر شیعر و ئەدەبیات بە گشتی و لە شیعری نۆستالژیدا بە تایبەتی هەیە، چونکە سۆز و خولیا پاڵنەری نووسەرە بۆ نووسینی بەرهەمەکە و داهێنان لەناو دەقەکانیدا، بوونی سۆز لەناو هەر دەقێکی ئەدەبی ڕووحێکی زیندوو بە دەقەکە دەبەخشێ، بە تایبەتی ئەگەر ئەم دەقە، شیعرێکی نۆستالژی بێت و هەڵگری خەم و حەسرەت و گەڕانەوەی سەردەمە پڕ شانازییەکانی نووسەر و نەتەوە پیشان بدات، ئەمە جگە لە هەموو ئەمانەش، وەکو ئاشکرایە (سۆز) یەکێکە لە ڕەگەزە زۆر گرینگەکانی داهێنانی دەقی ئەدەبی. "عەبدلقادر ئەبو شریفە" بە نموونەیەکی سادە کاریگەری سۆز لەسەر دروستکردنی وێنە و دەقی نۆستالژیا دەخاتە ڕوو، دەڵێ: ((چوون بۆ باخ و باخچە فکرێکە، بەڵام حەزکردن بۆ چوون و تێپەڕاندنی کاتێکی خۆش تێیدا سۆزە))[١٠٤] ، ڕاستگۆیی سۆز و خولیا لە پتەوترین هۆکاری جوانی شیعرە، هۆکارێکی کاریگەر و زەقترە لەوانی دیکەدا، لەوەی کەوا شاعیری کورد لە غوربەتدا، یان لەناو وڵات، بە تەواوەتی خۆی بە

(١٠٤) عبدالقادر ابوشريفه، مدخل الى تحليل النص الادبى، دار الفكر، عمان، ١٩٩٩،ص ٢٥.

وڵاتەکەی بەستووەتەوە، وڵاتێك، کە وەکو گیانی خۆشی دەوێت و دڵی بۆ عشقی ئەو لێدەدات، ئیدی لە شیعرەکانیشیان بۆن و ڕەنگی نۆستالژیا بەدی دەکرێت، چونکە دێرە شیعرەکانیان، هەڵگری چەمك و واتایی نۆستالژیان.

هەر بەهۆی (سۆز)ەوە، هێندەی دیکە، دەقە شیعرییەکان چێژ و ئیستاتیکی بەهێزتر و لێوان لێو لە نۆستالژیا دەبن، چونکە ((دێرە شیعرەکان بە کۆمەڵێك وشە و دەستەواژەی ڕازاوە و ڕەنگین و هەڵگری تایبەتمەندی داپۆشراون، کە دەلالەتی حەسرەت و خەم و ناخۆشی و لاوانەوەی لە دەستدانی ئازیزان، بۆ نموونە: لە کاتی لاواندنەوەی خۆشەویستان و خەم و خەفەتی خۆی، بە بێ هیچ زمان لووسی و خۆ خۆشەویستکردن، دەری دەبڕێت لە دووری سەفەری مەعشووق، دەربڕینی سادە و نەرم، کە شیاوی غەزەل بێت هەڵدەبژێرێت...))[١٠٥].

بۆ نموونە ئەگەر سەیری شاعیرانی هاوچەرخی کورد بکەین، بە تایبەتی ئەوانەی لە دەرەوەی وڵات (تاراوگە) دەژیان، یان ژیاون، ئەم بەرهەمانە بە ڕوونی دەبینین، ئەوەتا ئەگەر سەیری ئەم شیعرەی **"سەلام محەمەد"** بکەین، بە ناوی "بەفر و فرمێسك"، کە لە (بەرلین) نووسیویەتی، دەبینین، کەوا چۆن سۆزی نیشتیمان دەکاتە هەناسە و ژیان و دڵ بۆ جەستەی شیعرەکەی، چۆن نیشتیمان دەکاتە

(١٠٥) نورالدين حسن محمد، ابن خفاجه شاعر شرق الاندلس، بيروت، ١٩٩٠، ص ١٠٥،٨٣،٥٥.

تەختی شانۆی ژیان و بەهەشتی جاویدانی. ئەم شیعرەی شاعیر لێوان لێوە لە بێگەردیی و هاواری بە تەوژم و هەست و سۆز و شیعرییەت و چڕ بوونەوەیە لە دەربڕیندا، لەم دەقەدا تێدەگەین، کەوا سۆز و خولیا چەندە گرینگ و کاریگەرە لەناوبەرهەمی نۆستالژیادا، چونکە هەم دەبێتە هۆی جوانکردن و بەخشینی ئێستێتیکایەکی بەرز و هونەری، هەمیش پڕە لە بەفەنتازیا کردنی زمان و لادانە زمانییەکان و داهێنانی شێوازی تایبەت و جیاواز بە خودی نووسەر خۆی. کاتێ شاعیر دەڵێت:

**(بەفر و فرمێسك)**

**((شەوە ئاسمانەکەی بەرلین**

**پەڵە هەوری سپی سپی داپۆشیوە**

**بەفر ورد ورد دێتە خوارێ**

**وەك پەرییەك...**

**کراسێکی تەنك و سپی لەبەردا بێت**

**منیش لەم دیو پەنجەرەوە**

**لەگەڵ شیعرێکی ((گۆران)) و**

**پەرداخێکی نیوە پڕ و**

**پشکۆ داگیرساوەکانی وڵاتی خوێن و زریانا**

**بوومەتەوە**

دڵدارە چۆغە لەبەرەکەی جاری جاران
سەر چۆپی ئاهەنگی شایی
گوندە دوورەکەم گرتووە...
ئۆخەی گیانە ئەوەتانێ
بۆنی رنووە بەفری دووری
کوردستانیش لەگەڵتا دێ))[١٠٦].

ئەگەر سەیری ئەم دەقە بکەین، کەوا سۆز و خولیا چۆن چۆنی دڵ و دەروونی شاعیر دەخرۆشێنێت و ناخی شاعیر ڕوو لە هەڵچوون و تەژی لە سۆز و غەریبی و دوورە وڵاتی دەکات و دەیگەڕێنێتەوە، بۆ ئەو کاتانەی لە وڵات بووە، دیمەنی بەفر بارین و خۆشی و شادی خەڵك و شەڕەتۆپەڵ و.....تاد، بەمەش فەزایەکی هونەری ئیستاتیکی بە دەقەکە بەخشیووە، چونکە زۆرجار ((سۆزی قووڵ و برین کولانەوە و لە نیشتیمان هەڵکەنان و هەستی غەریبی کردووە، بە هونەر، هونەری ئاخاوتنی شیعر لەناوئێستێتیکادا. هونەریش تەنیا بە خاڵ و هێڵی ئێستێتیکا پێوانە دەکرێت، ئێستێتیکا هەموو ئاسۆیەك لە بوونی دەقدا پێ دەگەینێت، بۆ درەوشانەوە و هیچ

(١٠٦) سەلام محەمەد (دیوان)، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ١٤٢،١٤٣، ١٤٥.

تروووسکەیەکی درەوشانەوەش ناکوژێت...))[107]. کەوا بێت لەم دەقەی **"سەلام محەمەد"**دا، سۆز پەیوەندی بە ڕابردووەوە هەیە، لەم جۆرە شیعرەدا جەخت لەسەر هاواری بە تەوژم و سۆز و هەست بەنامۆیکردن دەکرێت، ناڵان و فیغانی غوربەت و دووری و سۆزی دووری، دەقێکی پڕ لە نۆستالژیای بەرهەم هێنانەوە.

شیعر تا سۆزدارتر بێت ئەوەندە زیاتر خۆی دەخزێنێتە ناو دڵ و دەروونەوە شۆڕ دەبێتەوە بۆ ناوەوەی مرۆڤ، ئەو دەقەی سۆزێکی بەرزی تێدا بێت زیاتر لە موعانات و کێشەی کەسەکان دەدوێت و ئەو کەسەی بەرهەمەکە دەخوێنێتەوە، وا هەست دەکات ئەم دەقە بۆ ئەو نووسراوە، بە واتایەکی دیکە، دەبێتە دۆزینەوەی خودی خوێنەرە تێیدا، چونکە مرۆڤ لە زۆربەی هەست و سۆزەکان یەکدەگرنەوە و زۆربەی کێشەکانیش گشتین و لە تاکەوە دەردەچن و هەمان کێشە و گرفت لای کەسانی دیکە دەبینندرێت. کەواتە ((مەبەست لە سۆز ئەو هەڵچوون و حاڵەتە حەماسییەیە، کە شاعیر بە هۆی ڕووداوێکەوە لە خۆیدا هەستی پێدەکات و دەیەوێت لەو هەست و سۆز و ئیحساسەی خۆیدا، خوێنەر/بیسەر لەگەڵ خۆیدا هاودەم و هاوبەش بکات...))[108] هەر بۆیە ئەگەر سۆز لەناو

(١٠٧) سەباح ڕەنجدەر، سێ کتێب لەبارەی شیعرەوە، چاپخانەی بینایی، سلێمانی، ٢٠١٣، ل ٢٢٩ ـ ٢٣٠.

(١٠٨) محمد رضا و شفیعی کدکنی (د)، صور خیال در شعر فارسی، ص ٢٤.

شیعرێکدا بوونی نەبوو، یان لاواز بوو، ئەوا دەقێکی لاواز و مردوو دێنێتەکایەوە، لەبەر ئەوەی ناتوانێت  وروژێنەر بێت و کاریگەری لەسەر خوێنەر بەجێ بهێڵێت و ڕاستیەکانی ناخی شاعیر بدۆزرێتەوە و هەستی پێبکرێ، چونکە ((حەقیقەت خۆی لەناوسۆزدا شاردۆتەوە))[١٠٩] ، هەندێك جاریش لە دەستدانی ئازیزان و مردنی کەسە نزیکەکان هۆکاری سەرەکین بۆ هەڵچوونی سۆزی شاعیر و دروستبوونی نۆستالژیا و دەقی نۆستالژی، ئەویش لە  ڕێگەی سۆز و هەستی شاعیرەوە لەناو دەقە شیعرییەکەوە ڕەنگدەداتەوە و دەبێتە بەرهەمێکی نۆستالژی، چونکە مەرگ و مردن دەبنە هۆی هەڵچوون و هەست و سۆز و حەسرەت خواستن و لاوانەوە و شین و ڕۆ ڕۆ و.....تاد، جا چ جای ئەوەی ئەم مردن و لەدەستدانە، مردن و لەدەستدانی کەسێکی لاو بێت، بێگومان لێرەدا کاریگەر و حاڵەت و دیاردەی نۆستالژیاکە بەتینتر و پتەوتر و بەهێزتر دەبێت و زۆر دەرەنگتر شوێنی ئەم کۆست و برینە سارێژ دەبێ. چونکە لاو لەگەڵ پیر و دنیا دیتە لەیەك جیانە، وەکو "سیرون" دەڵێ: ((ئەگەر مردنی گەنج لەناکاو و غەمگینانە بوو، چونکە ئەگەر گیانی پیر شەمعێکە، کە گەیشتووتە کۆتاییەکەی، مەرگی گەنج چرایێکە، کە لە سەرەتای هەڵگیرسانیەتی، یان میوەیەکی کاڵە، کە بە قەهرەوە لە داری ژیان

---

(١٠٩) هاوژین سلێوە عیسا، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری (شێرکۆ بێکەس)دا، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ٦٨.

جیای کردوونەتەوە...))[110]، کەواتە لە دەستدانی ئازیزان، کە یەکێك لە دیاردە هەرە دیار و بابەتە گرینگەکانی واقیعە، هۆکارێکی دیکەی بەرهەم هێنانی دەقی نۆستالژیایە، بۆیە شاعیر ئەو گەنجەی مردووە، لە ژیاندا بووە و یادگاری و بیرەوەری خۆش و ناخۆشی هەمیشە لەبەر چاوە و دەبێتە ڕابردووی بەسەرچوو، دەبێتە هۆی دروستکردنی بەرهەمێکی نۆستالژیا. بۆ نموونە **"حەسیب قەرەداغی"** دوای لەدەستدانی "کەژاڵ"ی، کچی، کەوا لە هەولێر قوتابی بووە، لە تەمەنی گەنجیدا دەمرێت، سۆز و کاریگەریەکی زۆری کردووەتە سەر شاعیر و دەقەکانی و بیرەوەرییە ڕابردووەکانی هەمیشە لەبەرچاوە.

**((منی جگەر سووتاویش هەر چاوەڕێی "کەژاڵ"م**
**کەی دێتەوە لە "هەولێر" بەری ڕێی بۆ بماڵم**
**لەبەر دەرکیماڵەوە دوو تۆپەڵی تێ گرم**
**جانتای ماندوو بوونی ڕێی بەخەندەیەك لێ گرم))[111].**

(110) مهرانگیز کاظمی، روانشناسی مرگ، مجله اطلاع رسانی همگانی، شماره (191)، سال 1381، ص 62و 65.

(111) حەسیب قەرەداغی، دیوانی فەرهەنگی خەم 2، چاپخانەی دار الحریه للطباعة، بغداد، 1989، ل 75.

## ٢- ٣ پەیوەندی نۆستالژیا بە بیرەوەرییەوە

لەڕاستیدا نۆستالژیا پەیوەندییەکی قوولّی لەگەلّ بیرەوەریدا هەیە، بە واتایەکی دیکە یەکێك لە کۆڵەگە و ستوونەکانی نۆستالژیا بەبیر هێنانەوەی بیرەوەرییەکانە.

بەبیرهێنانەوەی بیرەوەرییەکان پەیوەندی نێوان ئێمە و ڕابردوو دروستدەکات و بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە، هەبوونی بیرەوەری لەلایەن هەرکەسێك شتێکی ئاسایی و سروشتیە، بەلاّم کاتێك بە بیرهێنانەوەی بیرەوەرییەکان بۆ کەسانێك بگاتە ڕادەیەك، کەسەکە بەرانبەر بە واقیع ڕەش بین و نیگەران بێت، ئەوا کەسەکە هەست بە نۆستالژیا و حەسرەتی دووری و دلّ تەنگی دەکات.

بێگۆمان مێشکی مرۆڤ هەزارەها ئەزموون و هەلّوێستێکی خۆش و ناخۆش و تالّ و شیرینی تێدا تۆمار دەکرێت، هەندێکیان کاریگەریەکی گەورەی هەیە لەسەر باری دەروونی و لایەنی هەست و سۆز و خولیای مرۆڤ و هەندێکیشیان کاریگەری لاوەکی، بۆیە مرۆڤ هەر لەو ڕۆژەی لەدایك دەبێت، بەم هەموو ئەزموون و ڕووداوانەدا تێپەڕ دەبێت، کە کاریگەریان لەسەر دەروون و کەسایەتی و هەلّوێستی مرۆڤ لە ژیانیدا هەیە، ئەمەش بە پێی تەمەن و ڕەگەز و هۆکارە ئابووری و کۆمەلاّیەتییەکان و بارودۆخی کەسایەتی تاك و

جـــــۆری بیرکردنـــــەوە و ڕادەی مانـــــەوەی بیرەوەریـــــەکان و بەبیرهێنانـــەوەیان دەگۆڕێـت و جیـاوازن. بـۆ نموونـە شـیکردنەوە دەروونییـەکان باسـیان لـە قۆنـاخی هـەڵگرتن و هەسـت پێکردنـی بیرەوەرییەکان کردووە، چونکە منداڵی هەر لە ساڵانی بەرایی تەمەنی و لـە ڕێگـای هەسـتەکانیەوە، لەگـەڵ ئـەم ئـەزموون و هەڵوێسـتانە ڕووبـەڕوو دەبێتـەوە، بۆیـە دەروونناسـان لـەبارەی بیرکردنـەوە و بیرەوەرییەکان و مانەوەیان، دەڵێن: ((پێنج ساڵی بەرایی تەمـەن زۆر کاریگـەرن و شـوێنەواریان لـە قـووڵایی هـۆش و هەسـت و نەسـتدا دەمێنێتەوە، هەرچەندە کپ و شاراوەن، بەڵام کاریگەرن...))(١١٢).

کەواتە: بیرەوەری و یادگاریە کۆنەکانی مـرۆڤ هـەر لـە سـەرەتایی ژیانیـەوە، وەك پارچـەیەکی جەسـتەیی مـرۆڤ ئـاڵوودەی بـووە، ناتوانـدرێت لێـی ڕابکـەین و نکـۆڵی لێبکـەین، جـا ئـەم بیرەوەریانـە بیرەوەری تاك و پەیوەندیان بە تاکەوە هەبێت، یان بیرەوەری گشتی و پەیوەندی بە سەروەری نەتەوەیی و بیرەوەری هاوبەش بن، کەواتە لێـرەدا، دەتـوانین بڵـێین: بـیرەوەری و بەبیرهێنانـەوەی یادەوەریـە کۆنەکان لە ژیانی مرۆڤدا زۆر گـرینگ و تەنانـەت لـە بـواری ئـەدەب و لەناو دەقی ئەدەبیـدا شـوێنێکی دیـار و ڕۆڵێکـی کاریگـەری هەیـە لـە دروستکردن و داهێنانی وێنەی شیعری جۆراوجۆر و خەیاڵی فەنتازی.

(١١٢) عومـەر یاسـین جـەباری(د)، دەروونزانـی، بـەرگی یەکـەم، چاپخانەی زانکـۆی سـەلاحەددین، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ١٩.

زانـای دەرونـزان "نایسـر" دەڵـێ: ((بیرهاتنــەوە بناخــەی پرۆســە عەقڵییەکانی مرۆڤە و ئەو هێزەیـە، کـە هـەموو پرۆسـە عەقڵییـەکانی دیکە بەکاردەخات، چونکە بێ بیرهاتنەوە هـەموو ڕووداوەکـانی ژیـان بریتی دەبێت، لە دووبارە بوونەوەیەکی بێ سوود و مـرۆڤ تێیـدا هـیچ فێر نابێت، هەر بۆیەش بیرهاتنـەوە بـە یـەکێك لـە پرۆسـە مەعرفییـە گرینگـــەکانی ژیـــان دەژمێردرێـــت))[113]. کەواتـــە بـــیرەوەری و بەبیرهاتنەوە پرۆسەیەکی عەقڵییـە، لـە ڕێگەیـەوە زۆربـەی زانیارییـە کۆنـەکانمان دەهێنێتـەوە یـاد، هـەروەها بـە پرۆسـەیەکی ئـاڵۆزیش دەژمێردرێت، چونکە چەند پرۆسەیەکی دیکەش لەخۆ دەگرێـت، وەك ((هەڵگرتن، ناسینەوە، هێناوە، درك پێکردن، هۆش، حەسرەت و داخ و خەمی ڕابردووی کۆن و لەدەستچووەکان و.....تاد))[114]، بەڵام بـە پێــی بۆچــوونی مەعریفییــەکان بــۆ بیرهاتنــەوە و گرینگــی بــەبیر هێنانــەوەی یــادەوەری و زانیــاری کــۆن و گەڕانــەوە بــۆ ڕووداو، دیمەنـــــەکانی ڕابـــــردوو زیـــــاتر گرینگیـــــان بـــــە بنـــــەمای هێنانەوە(Retrieral) داوە، کە ئـەویش لـە ڕێگـەی سـێ حاڵەتـەوە دەبێ، ئەوانیش:

---

(١١٣) عزەدین ئەحمەد عەزیز، بنەماکانی دەروونزانی گشتی، چاپی چوارەم، چاپخانەی ڕۆژهـەڵات، هەولێر، ٢٠١٢، ل ٩٤.

(١١٤) عزەدین ئەحمەد عەزیز، بنەماکانی دەروونزانی گشتی، ل ٩٤.

((١. پرۆسەی دووبارە گەڕاندنەوە (Reca).

٢. ناسینەوە (Recognition).

٣. دووبارە فێربوونەوە (Relearning) ))[١١٥]

لەناو دنیای لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و ڕەخنەی ئەدەبیدا توێژەران بیرەوەری و بەبیرهێنانەوەیان لە بابەتی نۆستالژیا و پەیوەندی بە نۆستالژیاوە، بۆ سەر دوو جۆر دابەش کردووە، ئەوانیش:

١. بیرەوەری تاك(تاکەکەسی).

٢.بیرەوەری گشتی(کۆ).

(١١٥) سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٩.

## یەکەم// بیرەوەری تاك (تاکەکەسی):

ئەم جۆرە بیرەوەرییە پەیوەستە بە دەروونی مرۆڤ و حاڵەتە نەستی و هەستەکانی تاك، چونکە ((لە بیرەوەری تاکەکەسیدا بە زۆری گرینگی بە لایەنی بێ ئاگایی کەسەکە دەدرێت، هەر هەمان ئەوەی، کە "فرۆید" باسی دەکات))[116]، واتە نووسینی ئەم جۆرە بیرەوەریە بە نووسینی حالأت و ڕووداو و بەسەرهاتگەلێك، کە لە ئەنجامی بەبیر هێنانەوەیان و باسی چۆنیەتی ڕوودانیان لەلایەن خاوەن بیرەوەرییەکە و باسکردنی کات و شوێنی ڕوودانیان، پەیوەستە بە خودی زەین و بیرەوەری تاکەوە، چونکە مرۆڤ لە مێشکی خۆیدا، کە دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو، شتی خۆش و ناخۆشی بیر دێتەوە، سەرکەوتن و شکستی بیردێنێتەوە، تووشی حاڵەتێکی خەم و ژان و خەفەت و حەسرەتی تێکەڵ بە جۆری لە چێژی سەرخۆشکەر دەبێت، وای لێ دێت لە بەرانبەر واقیعدا هەندێجار ڕەشبین بێت و کەسەکە هەست بە نۆستالژیا و دڵتەنگی بکات.

(١١٦) الياس نورايى(د) و مهدى شريفيان(د) و على اصغر آذر پيرا، رويكردهاى نوستالژيك در شعر م.سرشك، ص ٢٨٣.

لە ڕاستیدا ئەگەر باسی نووسین و تۆمارکردنی بیرەوەری بکەین لە ئەدەبی کوردی، ئەوا لەو بوارەدا کتێبخانەی کوردی زۆر هەژارە، ئەگەرچی کۆمەڵێك هەوڵ و کۆمەڵێك نووسەر باسی ئەزموون و ژیانی خۆیانیان بە بیرەوەری تۆمار کردووە، لەوانە "مەسعوود محەمەد" و "د.مارف خەزنەدار" و"سەعید ناکام" و "شێرکۆ بێکەس" و "کاکەمەم بۆتانی" و "عزەدین مستەفا ڕەسووڵ" و .....تاد، بەلاَم لە ڕاستیدا نەیانتوانیوە لە قاڵبە تەقلیدی و لاساییە کۆنەکان دوور بکەونەوە، چونکە زیاتر بیرەوەری سیاسی و ژیانی ئاسایی ڕۆژانە و ڕووداوی مێژووی و.....تاد، تۆمار کردووە، ئەویش بە شێوەی گوتارێکی هەواڵی، یان خستنەڕووی کۆمەڵێك زانیاری مێژووییە، نەك بەرجەستەکردنی هونەرێکی بەرز و تەکنیکی شیعر، یان پەخشانی و زمانێکی ئەدەبی، کەوا بیرەوەرییەکانی بە فۆرمێکی تازە و نوێ و بەشیعر نووسرا بێتەوە، ئەگەر بیرەوەرییەکانی **"لەتیف هەڵمەت"** و **"هەژار موکریانی"**و**" کاروان عومەر کاکە سوور"** لێ دەرکەین، کە ئەم سییانە یەکەمیان بە شیعر و دووەم و سێیەمیان بە پەخشان نووسراون و حاڵەتی ئەدەبییان بەسەردا زاڵە، بیرەوەری و یاداشتەکانی دیکە، زۆربەیان تەنیا گێڕانەوەی ڕووداوە سیاسی و کۆمەلأیەتییەکانی خاوەنەکانیانن و وەکو دەقی ئەدەبی سوودێکی ئەوتۆیان لێ وەرناگیرێ.

"ڕای (Ray)" لـــە وتارێکـــدا لـــە ژێـــر ناونیشـــانی (بـــیرەوەری، فەرامۆشی و نۆستالژیا لە چارەسەری بنەماڵە)دا، دەلێـت: ((هەسـتی دڵتـــەنگی بـــە یـــەکێك لـــە گـــرینگترین هۆکـــاری گـــۆڕان و پـەیوەنـدی بنەماڵەکان دەزانێت))[117].

(117)Ray,yveline(1996) memoire, oubliette, nostalgiaen.therapie: vademander a mammy, eiie terecontera, Journal-Article.

## دووەم// بیرەوەری گشتی(جمعی):

(("موریس هالبواکس M.Halbowax" کۆمەڵناسی فەڕەنسی لە کتێبێك بەناوی (بیرەوەری گشتی) ))[١١٨] بە شێوەیەکی قووڵ گرینگی بە چەمکی بیرەوەری گشتی دەدات و لە لایەنە جیاوازەکانی دەکۆڵێتەوە. ئەو ئەم ڕاستیە بە بیردەهێنێتەوە، کە سەرەڕای تایبەت بوونی بیرەوەرییەکان، بەڵام لەگەڵ کەسانی دیکە دابەشیان دەکەین.ئەو بیرەوەرییەی، کە لەگەڵ کەسانی دیکە دابەشیان دەکەین، دەگەینە پلەیەکی کۆمەڵایەتی، واتە ئەگەر من دەتوانم بیرەوەرییەکانم بلێمەوە لەبەر ئەوەیە، کە گووتنەوەیان کارێکی کۆمەڵایەتییە. لە هەمان کاتدا بیرەوەری کەسێك لەگەڵ بیرەوەری کەسێکی دیکە دەچەسپێنێت و دەبێتە هۆی دروستبوونی شتێك، کە دەتوانین ناوی ئاڵوگۆڕکردنی بیرەوەری لێ بنێین. کەواتە، کاری وتنەوە، یەکەمین کەناڵی پەیوەندی نێوان بیرەوەری تاکەکەسی و گشتییە.

(١١٨) مهدی شریفیان(د)، بررسی فرایند نوستالژی در اشعار سهراب سپهری، ص ٥٧.

لـەم جـۆرە بیرەوەریانـە، کـە بـیرەوەری گشـتین، گرینگـی بـە بێئاگایی نەتەوەیی دەدرێت. "کـارۆل گۆسـتاف یـونگ" بـۆ یـەکمجار بڵاوکردنـەوە و بـەکارهێنانی ئـەم تیـۆرە، بـە پێـی بـیر و بۆچـوونی "یۆنگ"، ناهۆشیاری نەتەوەی ((دەبێتە هۆی دروستبوونی وێنەیەکی هەتاهــەتایی و لــە ئــەدەبیات و هونــەردا ڕەنگدەداتــەوە، وەك ئەفسانەکان نموونەگـەلێکن بـەردەوام دووبـارە دەبنـەوە، کـە ڕەگ و ڕیشەیان بۆ ناهۆشـیاری گشـتی دەگەڕێتـەوە))[119]، کەواتـە بـە پێـی تیۆریەکەی "یۆنگ" نموونەی هەتاهەتایی پێیوایە، کە ((بنەما و ڕەگ و ڕیشەی ناهۆشیاری نەتەوەیی مرۆڤایـەتی بـە گشـتی، بـۆ کۆمـەڵێك وێنەی هاوشـێوەی وەکیـەکی جیهـانی دەگەڕێتـەوە، کـە بـە فـۆڕم و شێوەی جیاواز لە نێوان نەتەوە جیاوازەکاندا بوونیان هەیە))[120].

بەپێی ئەم قسانەی "یۆنگ" هەندێك لە بیرەوەرییـەکان لـە نێـوان نەتەوەکان هاوبەشن و لە دەروون و زەینی مرۆڤەکانـدا هـەن، ئەگـەر هات و شاعیر، یـان هونەرمەنـد بـە شـێوەیەکی لەڕادەبـەدەر و زیـاتر سـوودیان لــێ وەربگــرێ، دەتــوانین بڵــێین: تووشــی نۆســتالژیای بیرەوەری گشتی بووە.

بیرەوەرییەکانیش بە پێی گرینگی و بایەخی لەلایەن مرۆڤەوە، لـە هەست و نەست و زەین و مێشکی مرۆڤدا دەگۆڕێت و جیاوازن، جاری

(١١٩) سیماداد، فرهنگ اصطلاحات ادبی، تهران، چاپ مروارید، ١٣٨٧، ص ٤٨١.

(١٢٠) سەرچاوەی پێشوو، ص ٤٨٨.

واهەیە بیرەوەریەکە بیرەوەریەکی هەستیە، واتە لە ڕێگەی هەستەکانی بینین، بیستن، دەست لێدان، بۆنکردنەوە تۆمار دەکرێت و لە مێشك گەڵاڵە دەبن، هەندێك جاریً دیکەش بیرەوەرییەکە کورت خایەنە، یان بیرەوەرییەکە بیرەوەرییەکی درێژخایەنە و ماوەیەکی درێژ تەنانەت، تا کۆتایی تەمەنی مرۆڤ لەگەڵیدا دەمێنێتەوە.

## ٢-٤ پەیوەندی نۆستالژیا بە دەروونناسییەوە

نۆستالژیا زاراوەیەکی دەروونناسییە، کە هاتووەتە ناو ئەدەبیات و بەشێوەیەکی گشتی هەڵسوکەوتێکی ناهۆشیارییە، کە لەلای شاعیر، یان نووسەر سەرهەڵدەدات، بێئاگای گشتی (Cellectire Concious) لە دەروونناسی "یۆنگ"دا، بریتییە لە ((ئەزموونی باوك و باپیرانی ئێمە لە ماوەی ملیۆنەها ساڵی ڕابردوو، کە بەشێکی زۆری نەوتراون، یان بریتییە لە ڕەنگدانەوەی ڕووداوە جیهانییەکانی پێش مێژوو، کە بە تێپەڕبوونی هەر سەدەیەك تەنیا بەشێکی کەمی لێ زیاد دەکات))[١٢١]. نائاگایی گشتی لە نێوان هەموو مرۆڤەکاندا هاوبەشە بە شێوەی هەمیشەی لەخۆیدا هەڵدەگرێ. کەواتە نۆستالژیا پەیوەندیەکی هەمیشەی و تۆکمەی بە دەروونناسیەوە هەیە، چونکە خۆی بابەتەکە کارکردنە لە هەست و سۆز و هەڵچوونەکانی دەروونی مرۆڤ و کاریگەرییە دەروونییەکان، لەگەڵ دەرکەوتنی لێکۆڵینەوەکان لە بواری دەروونناسی و قوتابخانەی دەروونشیکاری لە لایەن "فرۆید و یۆنگ و ئەدلەر" زیاتر بابەتە ئەدەبییەکان بە گشتی و نۆستالژیا بە تایبەتی ڕۆڵی بە

---

(١٢١) آلن آراس، روانشناسی شخصیت، ترجمەی: سیاوش جمال فر، چاپ دوم، نشر روان، تهران، ١٣٧٥، ص ٩٨.

دیارکـــەوت و کەوتـــە بـــەر بـــاس و لێکۆڵینـــەوەی ئـــەدەبی و ڕەخنەیەکانەوە.

کەواتـە: نۆسـتالژیا لـە ڕوانگـەی دەروونییـەوە، ئـەو کاتـە بـەهێز دەبێ، کەوا کەسەکە لە ڕابردووی خۆی دوورکەوێتەوە و تووشی کۆچ و تەنیایی و غوربەت ببێت، بۆیە جگە لە گەڕانـەوە بـۆ ڕابـردوو، هـیچ چارەیەکی دیکەی لەبەردەمدا نییە.

"تیلبۆرگ Tilburg" پێـی وایـە ((هەسـتی غوربـەت لـە لای مـرۆڤ حاڵەتێکی دەروونی و ئاسـاییە، کـە لـە ڕێگـەی غـەمگینی و سـکاڵای لەشی و بەبیرهێنانەوە، بیرەوەری ڕابردوو لە بارەی ماڵ و ئـارەزووی گەڕانەوە، بۆ ماڵ و شوێنی ئاشنا، دەردەکەوێت))[١٢٢]، واتە هەسـتی غوربەت دەکرێ کۆمەڵێك چەمکی دیکەی بۆ دابندرێ و بەکار بێت لـە زانستی دەروونناسی، وەك: دڵەڕاوکێی جیابوونەوە، خەم و حەسرەت و غەمگینی(griea) و خەفەت و داخ و ئەفسوون (Depressin)، بـەڵام ئـەوەی، کـە لـە دروسـتبوونی هەسـتی غوربـەت لـە لای مـرۆڤ ڕۆڵـی سەرەکی دەبینێت و زۆربەی دەروونناسـانیش لـەو بڕوایـەدان هـەمان دوورکەوتنەوە لە فەزای ماڵ، یان وڵاتە.

ناسـینەوەی تیـۆرە نوێیـەکانی دەروونناسـی، کاریگەرییـەکی زۆری لەسەر ڕەخنە و لێکدانەوەی بەرهەمـە ئەدەبییـەکان هەیـە، بـە

(122) Tilburg,1997,p 802.

ڕادەیەك کە لە دنیای ئـەمڕۆدا بەشـێك لـە ڕەخنـەی ئـەدەبی تایبـەت کراوە بە ڕەخنەی دەروونناسی.

لەم جۆرە ڕەخنەیەدا، دەتوانین لە بەرهەمێك لە ڕوانگەی دەروونشـیکارییەوە بکۆڵینـەوە و لـەو ڕوانگەیـەوە بـە تێگەیشـتن و دەستکەوتی نوێ سـەبارەت بـە بەرهەمـە ئەدەبییەکـە بگـەین، بۆیـە یـەکێك لـە تایبەتمەندییـەکانی ئـەم جـۆرە ڕەخنەیـە، لێکۆڵینـەوەی بەرهەمەکانـە لـە دیـدێکی نۆسـتالژیکی، لەوانەیـە نۆسـتالژیا لـە واتـا گشتییەکەی خۆیدا، هەر جۆرێ لە هەسـتکردن بـەم خەمـە بێـت، کـە هەموو دەروونی مرۆڤ بە خۆیەوە سەرقاڵ دەکـات، هەسـتێك، کـە لـە دەروونی هەموو مرۆڤێکدا بوونی هەیە، لەو ڕوانگەیەوە، کە نۆستالژیا سـنووری هاوبەشـی لەگـەڵ ئـەدەبیات و دەروونناسـیدا هەیـە، بۆیـە هەندێ باسکردنی ئەم بوارە (دەروونناسی) بە پێویست دەزانـین. بـۆ نموونە، دەگوترێت: ((هەڵقوڵینی زەینـی ئـەدیب لـە ئـەنجامی ئیلـهام وەرگرتن لە ئەزموونە عەقڵی و دەروونییەکانی، بەم شـێوەیە ئـەدەب ئاوێنـەی عـەقڵ و دەروونـی ئەدیبـە و ڕەخنـەگرە ئەدەبییـەکان لـە ڕاسـتییە دەروونناسـیەکان، کـە خـاوەنی دەسـتەواژەی تایبـەتن لـە شرۆڤەکردنی بەرهەمە ئەدەبیەکان، سوود وەردەگرن))[١٢٣].

لـــە ســـەدەی بیســـتەمدا، بـــە ڕادەیـــەك دەقـــە دەروونناسییەکان کاریگەرییان بەسەر ئەدەبیات و هونەر هـەبوو، کـە

(١٢٣) عبدالعزیز عتیق، فی النقد الادبی، دار النهضة العربیه للطباعة، بیروت، ١٩٧٢، ص ١٣.

بەدەگمەن دەقێك دەدۆزیتەوە، كە سوودی لە دەروونناسی وەرنەگرتبێت. ئەم كاریگەرییە، چ لەڕوخسار و چ لە ناوەرۆك، بەلاًم زیاتر لە ناوەرۆكدا، تاڕادەیەك، كە ناتواندرێت دەقی ئەدەبی لە دەقی دەروونی جیا بكرێتەوە، زۆربەی دەروونناسان لە پێشەكی هەر بەرهەمێكی هونەر و ئەدەبیدا، ئاماژە بەم خاڵە دەكەن، كە ناسینی بەها جوانناسییەكانی هەر كارێك دەبێت، لە لایەن ڕەخنەگری ئەدەبییەوە ئەنجام بدرێت، چونكە ((بۆ ڕەخنەگرێكی هونەری پێكهاتە و فۆرمی هونەری كارەكە گرینگترە و بۆ دەروونناسێك بە زۆری ناوەرۆكەكە گرینگە، بەلاًم ناوەرۆك لە بەرهەمێك، كە "كارێكی هونەری ڕەسەن و بەبەهایە" بە شێوەیەك ڕوخسارەكەی خراوەتەڕوو، كە لەگەڵ یەكتری گونجاون، واتە گۆڕینی یەكێك، دەبێتە هۆی گۆڕینی ئەوی دیكە))[١٢٤]، كەواتە وشە و دەستەواژەكانی تایبەت بە نۆستالژیا، كە پەیوەستن بە دڵ و دەروون و هەستەكانی مرۆڤ و لایەنی سۆز و خولیاوە و پەیوەستیشە بە دەروونناسی و لێكۆڵینەوەكانی، جگە لە دەوڵەمەندكردنی ناوەرۆكی بەرهەمە ئەدەبیەكان، دەبێتە هۆی دروستكردن و ئەفراندنی وێنەی هونەری جوان و تەكنیكی نوێ و جوانناسی ئێستێتیكیەوە، لە ڕووی فۆرم، ڕوخسارییەوە.لەبەر ئەوەی خەیاڵ، وێناكردن، لایەنی واتایی،

(١٢٤) محمد صنعتی، تحلیلهای روانشناسی در هنر و ادبیات، چاپ دوم، نشر مركز، تهران، ١٣٨٢، ص ٨٢.

سۆز لە چەمکەکانی زانستی دەروونناسین، بەمەش زۆربەی قوتابیانی بواری ئەدەبیات بە پێی گرینگیدان بە چەمك و دەستەواژەکانی ئەم بوارە بە شێوەیەکی گرینگ دەڕواننە ئەدەبیات و ڕەخنە، چونکە ((زانستی دەروونناسی لە ژیانی مرۆڤدا، کە لە چەند پێکهاتەیەکی پەیوەندیدار بە یەکتر پێکهاتووە، دەکۆڵێتەوە))[(١٢٥)]. ئەدەبیات کار لەگەڵ زمان و گوتار و خەیاڵ دەکات و دەروونناسیش لەم بوارەدا سوودێکی زۆر وەردەگرێت.

ئەدەبیات بۆ شیکردنەوەی ناوەرۆك و زمان و وێنەی شاعیرانی خۆی پێویستی بە دەروونناسییە و دەروونناسیش بە هونەر و ئەدەبیات، واتە لە سەدەی نوێدا ئەدەبیات سوودێکی زۆر گرینگ و کاریگەری لە شیکردنەوە دەروونی و قوتابخانە دەروون شیکارییەکان بینیوە، چونکە بووەتە هۆی شۆڕبوونەوە بۆ ناو ناخی کارەکتەر و دیوی ناوەوەی نووسەر و شاعیرانمان بۆ دەخاتە سەر پشت و بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەبی لە دەرەوەی دەق بۆ ناوەوەی دەق و ناوەرۆك و پەیوەندی بە دەق نووسەوە کەشف دەکات و دەیخاتەڕوو.

کەواتە: ئەم هاوکاری کردنە دوو لایەنە واتە، ئەدەبیات و دەروونناسی لەم سەدەیەی کۆتایەدا، لە لایەك بووەتە هۆی بەرەو پێشچوونی دەروونناسی و لە لایەکی دیکەشدا، بووەتە هۆی بەرەوپێشچوونی ڕەخنە و شرۆڤەکردنی دەقە ئەدەبییەکان.

---

(١٢٥) عبدالعزيز عتيق، في النقد الادبي، ص ٢٣.

## ٢- ٥ پەیوەندی نۆستالژیا بە هونەرەکانەوە

نۆستالژیا بە دیاردە و بنـەماکانی خـۆی، پەیوەندیـەکی بـەهێز و پتەوی لەگەڵ هونەرەکانی دیکەدا هەیە. هـەر هونـەرەو بـەجۆرێك لـە جۆرەکانی هەڵگری بنەما و بابەتی نۆستالژیان. دیـارە ئـەدەب وەکـو یـەکێك لـە هونــەرە جوانــەکان پەیوەنـدی پتــەوی بـە هونــەرەکانی دیکەشـەوە هەیـە، هـەر خۆشـی وەکـو هونـەرێك کۆمـەڵێك ڕوواڵـەتی هونـەری هەیـە، سـنووری نێوانیـان زۆر نییـە و تەواوکـەری یـەکترین، ئەوەتا زۆرێکی تەکنیکە نوێیەکانی ژانر و جۆرەکانی دیکـەی ئـەدەب سوودیان لەیەکتر بینیـوە و بـەکاریان هێنـاون. بـۆ نموونـە: مۆنتـاژ و فلاشباك و لێکدانی دیمەنـەکان و.....تـاد، هونـەری سـینەمان، بۆنـاو چیرۆك و ڕۆمان، تەنانەت شیعری نوێش سوودی زۆریان لێ بینیوە.

هونەر زادەی بیر و هزر و خەیاڵ و هەست و سۆز و دڵ و دەروونی مرۆڤە. واتە سەرچـاوەی داهێنـانی خـودی مرۆڤـە لـە دڵ و دەروونـی هونەرمەنـدەوە هەڵـدەقوڵێت و باسـی خـەم و ژان و حـەز و خولیـا و ئاواتەکانی تاکە لەناو تابلۆ و وێنـە و مۆسـیقا و گـۆرانی و سـینەمادا. کەواتە، ئەدەب بە هەموو هونەرەکانی پەیوەندیەکی زەق و ئاشـکرای هەیــە لەگــەڵ نۆســتالژیادا، ئــەوەش لەبــەر ئــەوەی سەرچــاوەی

هەردووکیان دڵ و دەروون و هەست و سۆز و خەم و ژانی مرۆڤە لە ڕۆژگاری ژیاندا.

لە خوارەوە بەکورتی تیشک دەخەینەسەر بەشێك لە هونەرەکان و پەیوەندیان بە نۆستالژیا و بنەما دیارەکانی نۆستالژیاوە، دەستنیشان دەکەین.

## ١. پەیوەندی نۆستالژیا بە هونەری سینەماوە

نۆستالژیا پەیوەندیەکی باشی بە سینەما و فیلمە سینەماییەکانەوە هەیە، بە تایبەتی ئەو فیلم و بەرهەمانەی دەرهێنەرەکانیان خەڵکی وڵاتی دیکەن و لە وڵاتانی ئەورووپا و ئەمریکا کاری بەرهەمهێنان دەکەن، ئەوا ئەم غوربەت و دووری لە نیشتیمان و نامۆیی و گۆشەگیریەیان لە بەرهەمەکان و ئەکتەری فیلمەکانیاندا ڕەنگیداوەتەوە و خستوویانەتەڕوو.

یەکەم کەس، کەوا لەم بوارە کاری کردبێت و گرینگی بە نۆستالژیا دابێت لە بواری سینەما و بەناوی ڕاستەوخۆی ((نۆستالژیایەوە، فیلمەکەی بەرهەمهێنا بێت دەرهێنەری ڕووسی "ئەندرێ تارکۆفسکی"یە، کە لە ساڵی (١٩٨٢) فیلمی (نۆستالژیا)ی، بەرهەم هێناوە))[١٢٦].

ئەم فیلمە باسی شاعیرێکی ڕووسی دەکات، کە بۆ نووسینی ژیاننامەی مۆسیقاژەنێکی ڕووسی دەچێتە ئیتالیا، بەڵام لەوێدا هەست بە غەریبیەکی زۆر و دڵتەنگی بۆ وڵاتەکەی (ڕووسیا) دەکات.

---

(١٢٦) جست و جو www.imdb.com

فیلمی (نۆستالژیا) یەکەمین بەرهەمی "تارکۆفسکی"یە، کە لە دەرەوەی ڕووسیا و بە زمانێك جگە لە زمانی ڕووسی بەرهەمی هێناوە. "تارکۆفسکی" لە فیلمی (نۆستالژیا)دا پشتی بە شیعرەکانی باوکی بەستووە، بۆیە ((بەرهەم هێنان لەم فیلمەدا، نەك تەنیا شیعرەکانی باوکی تێهەڵکێشی فیلمەکانی خۆی کردووە، بەڵکو دەوری ڕەمزی بە کارەکتەری فیلمەکە داوە، لە ڕێگەی شیعرەکانەوە))[١٢٧]، سانسۆری سۆڤیەتیش، وەکو نەریتی خۆی هەر بەقەدەغەکردنی بەرهەمەکانی کوڕەکەی نەوەستا، بەڵکو کەوتە شالاو بردنە سەر باوکیشی و چەردەیەك بەند و باویان بۆ هەڵبەست و کتێبەکانی باوکیشیان چنینەوە، لە ژێر ئەو پاڵەپەستۆیە و دوورکەوتەوە لە وڵات و لە غەریبایەتی کەوت.

"تارکۆفسکی" دەڵێ: ((ویستم شتێك بەدەست بهێنم لەبارەی نۆستالژی ڕووسی، لەبارەی خۆشەویستی و پیربوونی نیشتیمانی ڕووسی، لەبارەی ئەو شتە تایبەتانەی، کە پەیوەندی هەبوو بە نەتەوەی ڕووسی و ئەو کەسانەی، کە دوورن لە وڵاتی خۆیان. ئەوەش بۆمن کارێکی نیشتیمانی بوو...، بەڕاستی ویستم پەیوەندیەکی زۆرم بە پێشینەمەوە هەبێت، لەگەڵ ناوەرۆکی

(١٢٧) ئەنوەر قادر محەمەد(د)، لە ئەدەبی ڕووسیەوە، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ١٠٦.

نیشتیمانی ڕووسی و ڕۆشنبیری و شوێنە کۆنەکان و ناو و کەس و کار و هاوڕێیانەوە...))[١٢٨]

"تارکۆفسکی" پێی وابوو، خەڵکی ڕووسیا کەمتر لە وڵاتانی دیکە، گرینگی دەدەن بە غەریبی و غوربەت و نامۆیی، ڕووسیەکانی تاقەتی تۆمار کردن، یان بە ئەدەب کردنی ئەمەیان نییە، ئەوەش بوو، وایکرد ژیانێکی دیکە دروست بکەم.

"تارکۆفسکی" دەڵێ:

((چی بکەم و چۆن بتوانم نۆستالژیا بەرجەستە و جێبەجێ بکەم، هەستەکانم زۆر بە پەرۆشبوون بۆ وڵات، تا دوایی ژیانم ئەم نەخۆشیە گەورە و بە ئازارە، خۆشەویستی و بیری وڵات لەناو ناخمدا بوونی هەیە))[١٢٩].

لەناو سینەما و فیلمە کوردیەکانیشدا، کۆمەڵێك کار و بەرهەمی نۆستالژیامان هەن، کە بەو ساڵانەی دوایی بەرهەمهێنراون، هەرچەند زیاتر سیاسین و زیاتر باسی زوڵم و زۆرداری ڕژێمەکانی حوکمڕانی عێراق دەکەن، دژ بە ویست و ئیرادەی گەلی کورد، بەڵام هەر چۆنێك بن پڕن لە ڕەگەزی نۆستالژی، چونکە باسی ڕابردووی پڕ ئیش و ئازاری نەتەوەیی دەکەن، وەکو نۆستالژیای گشتی دەخرێنەڕوو. بۆ نموونە فیلمی (ژانی گەل)، کە شاکاری "ئیبراهیم ئەحمەد"ە، یان

(١٢٨) أمين صالح، نوستالجيا تاركوفسكي، مقاله حيث يلتقى الماء و النار، ترجمه لعربيه.

(١٢٩) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢.

زنجیرە درامای "گـەردەلوول" کـە بـە سـێ بـەش لـە لایـەن "جـەلیل زەنگەنـە"وە، سـیناریۆ و کـاری دەرهێنـانی بـۆ کـراوە، هـەروەها زنجیرە درامای "مەمی ئالان" لە لایەن "ناسر حەسەن"وە، بەرهـەم هاتووە. ئەمانە و چەندین بەرهەم و بابەتی دیکە، هـەڵگری ڕەهەنـد و دیدی نۆستالژیان لە فیلمە کوردیەکاندا.

## ٢. پەیوەندی نۆستالژیا بە مۆسیقا و گۆرانییەوە

کۆمەڵێك گۆرانیبێژ و مۆسیقاژەنی زۆر لە بەرهەمەکانیاندا باسی ڕابردووی کۆن و خۆشی و ژوان لەگەڵ یار و شوێنە خۆشەکانیان دەکەن، کلیپەکانیان پڕن لە دابڕان و بەجێهێشتنی یار و بێ وەفایی و ڕۆژانی بەسەرچوو و لەگەڵ نەخشەدانان بۆ دوا ڕۆژ و ناولێنانی یەکەم منداڵ و خەونی جوان لەگەڵ یەکتری بۆ داهاتوودا دادەڕێژن و.....تاد، لە بەرهەمە جیهانیەکاندا نموونەی ئەمانە وەك ((شووبێرت Schubert و شۆپان Chpin و بێرلیۆز Berlioz و ...تاد))[١٣٠].

دیارە مۆسیقا و گۆرانی و دەقی ئەدەبی پەیوەندیەکی لێك نەبڕاوەیان لە نێواندا هەیە و ناتواندرێت بەبێ مۆسیقا و ئاواز بخرێنەڕوو، بۆیە دەگوترێت: ((ئەگەر شیعر پڕ بێت لە وێنەی نایاب و وەسفی جوان و ڕێکوپێك، بەلاَم کەم و کورتی لە هەست و سۆزی بەهێز و ڕوخساری کەسایەتی دا هەبێ، ئەو کات بۆ باشترین ئاواز دانەریش هیچ دەرفەتێك نامێنێ، کە بەهرەی خۆی تێدا بخاتەڕوو))[١٣١]. کەواتە، ڕێژە و ڕادەی کەم و زۆری سۆز و هەڵچوون

---

(١٣٠) فەرهاد پیربال(د)، ڕێبازە ئەدەبیەکان، ل ٦٨.

(١٣١) ئامانج غازی، پەیوەندی نێوان بەرهەمە ئەدەبیەکان و مۆسیقا، گۆڤاری سبەی، ژمارەی (١)ی جۆزەردانی ساڵی (١٩٩٣)، هەولێر، ل ٤٣.

و هەستی شاعیر لەناو شیعرەکەدا، دەبێتە هۆی بەخشینی ئاوازێکی نایاب و پڕ لە نۆستالژیا. بۆ نموونە، گوێگرتن لە جۆرێك لە نەی و شمشاڵ دەمانباتەوە سەردەمی گوند و ژیانی کشتوکاڵی و شوانکاری و دەشت و کێو و مەڕ و ماڵات و.....تاد.

مۆسیقا و گۆرانی ڕۆڵێکی گرینگ و پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ نۆستالژیا و دەقی نۆستالژیادا هەیە. وەکو پێشتر ئاماژەمان پێکردووە، سەرباز گەلێکی زۆر لەسەربازانی سوید و سویسرا، کە لە فەڕەنسا سەرباز بوون، لە کاتی گوێ بیستبوونی جۆرێك لە ئاوازی نەی و مۆسیقای وڵاتەکەیان بە چۆك دادەکەوتن و تووشی نۆستالژیا و خەم و حەسرەتی ڕابردووی ژیانی گوند و دەشت و دەر و مەڕ و ماڵاتی خۆیان دەبوون، بەتایبەتی ((سەربازەکانی "ئوسکۆتلەندی"، کە دەنگی مۆسیقای ئوسکۆتلەندیان بەرگوێ دەکەوت بەڕادەیەك تووشی نۆستالژیا دەبوون لەگەڵی تێکەڵ دەبوون فیکە و هات و هاواریان دەکرد، بۆیە ئەفسەر و پلەدارەکانی سەربازگەکان فەرمانی قەدەغەکردنی ئەو جۆرە مۆسیقا نەتەوەییەیان دەکرد))[١٣٢].

لە ئەدەبی کوردیشدا، چ مۆسیقا، چ گۆرانییەکانیان شێوازێکی نۆستالژیان لەخۆ گرتووە، وەکو بەرهەمەکانی، **عەلی مەردان و حەسەن زیرەك و مامڵێ و سەید عەلی و ئایشەشان و مەزهەری خالّقی و سەلاح داودە و حوسێن عەلی و ئەحمەد شەماڵ و محەمەد جەزا و**

(١٣٢) صفدر تقی زاده، نوستالژی، نشریه بخارا، خرداد و تیر، شماره(٢٤)، تهران، ١٣٨١، ص ٢٠٣.

**ئۆمـەر دزەیـی و شـەهێن تاڵـەبانی و خـەلیل موراد‌وەنـدی و...تـاد.** ئەوەتا **"عەلی مـەردان"** لـە گۆرانییەکدا، کـە لەشـیعری پیرەمێـردە، دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ***کەی دێتەوە کـــەی دیـێـتەوە*** | ***کاتی لاویم کەی دێتەوە*** |
| ***لە دەستم چوو بەخوا هەرگیز*** | ***نـــائـێـتـــەوە نـائـێـتـەوە*** |

هــەروەها "ئۆمــەر دزەیــی" لــە گــۆرانی (دوو گرتکــان گونــدە جوانەکەم)دا، کـە گۆرانییـەکی هەسـت و پـڕ لـە نۆسـتالژیایە، ژیـانی سادەی گوند و تەمـەنی گـەنجی ژیـانی خـۆی لـەم گـۆرانی و کلیپـەدا خستووەتەڕوو، مۆسیقاژەنەکانیش زۆر بەسۆز بۆی دەژەنـن، هـەموو ئەوانە حاڵەتی نۆستالژی لەم گۆرانییەی "دزەیی" زەقتر دەکەنەوە.

مۆسیقا فۆلکلۆری و میللییەکانیش پڕن لە سۆزی غەریبی و دەبنە هێمای دەنگی بۆ بیرهێنانەوەی ڕابردوو، ئەوانەش دیسانەوە حاڵـەتی نۆستالژی لای بیسەر و بینەر دروست دەکەن.

## ٣. پەیوەندی نۆستالژیا بە هونەری شێوەکارییەوە

ئەگەر شاعیر بە وشە و دەستەواژەی زمانی و پەیڤی ئەفسووناوی خەم و حەسرەت و داخ و ئاخی خۆی بۆ ڕابردووی بەسەرچوو بنووسی، یان ئاواتەخوازی داهاتوویەکی نموونەیی و دەگمەن بێ، ئەوا شێوەکار و نیگارکێش لە ڕێگەی ڕەنگ و فڵچە و قەڵەم و دیوار و تابلۆکانیەوە، هەوڵدەدەن دڵ و دەروون و ناخی خۆیان وێنەبکێشن و ناوەوەی خۆیان بکەن بە تابلۆیەکی پڕ لە ئەفسووناوی و دنیایەکی دەگمەن و شارێکی پڕ لە شادی، یان پڕ لە خەم و حەسرەت و ناخۆشی و نەهامەتی، لەوێوە حەسرەت بۆ ڕابردووی پڕ لە خۆشی و سادەیی و ئارامی گوندمان پێ ئاشنا بکەن، ئیتر دێن تابلۆکانیان بۆ سروشتی کراوە و دەشت و دۆڵ و چیا و شوانکارەیی و.....تاد، تەرخان دەکەن.

لە نموونە جیهانیەکانی لەبارەی وێنەی نۆستالژیا و گەڕانەوە بۆ سروشت، شێوەکارانی، وەك: "توونەر Touyner" و "کۆنستابل Constable" و "بۆنینگتۆن Bonington" و "ولیەم بلاکی W.Blake"ی ئینگلیزی و "فرێدریکی Freidrich"ی ئەڵمانی و

(("پـــــــۆڤین دولاکـــــــرا Delacyol" و "ڕۆبێـــــــرت H.Robert" و...تاد))[١٣٣]ن.

لە ئەدەبی کوردیشدا نموونەی شێوەکاری زۆرمان هەن و بەشێکی زۆریان هەڵگری خاسیەتی نۆستالژیان، بەڵام لێرەدا تـەنیا ئامـاژە بـە هونەرمەندێکی شێوەکاری کورد دەکەین، کە بە تەواوی لەگەڵ باس و بابەتی ئێمەدا دەگونجێت، ئـەویش شـێوەکاری کـورد "مالڤـا*" یـە. "مالڤا" شێوەکارێکە، غەریبی و تەنیایی لەناو تابلۆکانیـدا شـوێنێکی زۆریان داگیر کردووە، تەنانەت تابلۆکانی تێکەڵ بەو ئەزموونی پڕتاڵی و تـەنیایی و دەردەکـانی بـووە، بۆیـەش داهێنـەرە، چـونکە توانـایی خســتنە گـــەڕی ڕابـــردووی هەیـــە، ڕۆژانـــی دێرینـــی بـــە هـــەموو وردەکاریەکەوە دەخاتەڕوو.

"مالڤـا" کـە یادەوەریەکـەی خـۆی دەنوێنێـت، بیرێـك خـۆی بـیر دێنێتـەوە، بیرێـك تێکـەڵ بـە شـتە وردەکـانی ژیانمـان دەبـێ، لەبـەر ئەوەشە "مالڤا" ڕەمزی واقیعـی بوونـە، ڕەمـزی نیشـتیمانە، ڕەمـزی خۆیـەتی و غوربـەت و تاراوگەیـە، ڕەمـزی دیمەنـە خۆشەویسـتی و قەدەغەکانە، ئەوانەی ختۆکەی بینەر دەدەن.

---

(١٣٣) فەرهاد پیربال(د)، ڕێبازە ئەدەبیەکان، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٦٧.

(*) "مالڤا" نـاوی (عومـەر حەمدیـە) شـێوەکارێکی کـوردە لـە کوردسـتانی سـوریا لـە دیمەشـق لـە دایکبووە و ژیاوە، دوای ئەوەی (٣٤) تابلۆی لە یەکێك لە گۆڕەپانـەکانی دیمەشـق دەسـووتێندرێت، دەچـێتە ئیتالیـا لـە غـەریبی دەژێـت، خـاوەنی کۆمـەڵێك تابلۆیـە، بـەناوبانگترین تـابلۆی (هـاوار Hawar)ە. چەندین پێشەنگای شێوەکاری بۆ تابلۆکانی خۆی لە ئیتالیا و پاریس کردۆتەوە.

ئەوانە ئەو زاراوانەن، کە ئەو هونەرمەندە بۆ دەوڵەمەندکردنی ڕۆشنبیری جیهانی هاندەدات و مانای پێ دەبەخشن. "د.دیتر سپراکی Ditter Schrakie" لە مۆزەخانەی نوێی ڤیەنناوە، دەڵێ: ((دروست نییە، هەر هونەری ئەورووپا بە تاقە هونەرێکی جیهانی بزانین، بەڵکو "مالڤا"، کە لە ئاسیاوە هاتووە، بە شێوەیەکی ڕاست ئەو حەقیقەتە دەسەلمێنێ، کە هونەر توانست و بڕوای خۆی لە ئازارەوە وەردەگرێت))[١٣٤].

کارە هونەرییەکانی ئەم دواییانەی "مالڤا" جۆرێکن لە خوێندنەوەی کوردی بە شێوەیەکی دانسقە و پڕ لە تەکنیك و ئاڵۆزی و ئەوین و ترس و شێتگیری و هەڵچوون...، لە ڕێگەی تابلۆ و ڕەنگەکانیەوە ئەزموونە دوور و درێژەکەی و ئارەزووە خودییەکانی، بزربوونی منداڵی و غوربەت دەخاتەڕوو. ئەمانە هۆکارێکی سەختن لە تێگەیشتنی تەوەرە سەرەکییەکانی بەرهەمەکانیدا.کەواتە شێوەکاریش، وەکو ئەدەب، تۆماری دیمەن و ڕوواڵەتە نۆستالۆژیەکانە لە شێوەی تابلۆ و وێنەکانەوە.

(١٣٤) لاوك سەلاح، مالڤا ڕابردوو و ئێستا، وەرگێرانی لە ئینگلیزیەوە، گۆڤاری سبەی، ژمارە(١)ی جۆزەردان، ١٩٩٣، ل ٥٢و٥٣.

## ٤. پەیوەندی نۆستالژیا بە هونەری فۆتۆگرافییەوە

هونەری فۆتۆگرافی هونەرێکی دیار و بەرچاوی ژیانی مرۆڤە، واتە مرۆڤ کاتێك وێنە دەگرێ لەو کاتەدا ئەم وێنەیە بریتییە "لە ڕاگرتنی ژیان و تەمەن و کات لە چرکە ساتێکدا". بۆیە ئەگەر سەیری هونەری فۆتۆگرافی بکەین، ئەوا دەبینین هەڵگری کۆمەڵێك چەمکی دەلالی و مانای جیاوازە لە ژیاندا. کاتێك مرۆڤ سەیری وێنەکان دەکات، ئەوا بەبێ ویست و خواستی خۆی ڕاستەوخۆ تووشی نۆستالژیا و گەڕانەوەی سەردەمی ڕابردووی شوێنی بە جێما و لە بیر چوو دەبێتەوە.

هەر یەکێك لە ئێمە لە کاتی سەیرکردنی هەر وێنەیەکی خۆمان، چ بە تەنیابین، یان لەگەڵ هاوڕێ و خێزان و خانەوادەی خۆمان بین. بێگۆمان کۆمەڵێك یادگاری و بیرەوەری لەناوئەم وێنانە خۆیان حەشارداوە و بەجێ ماون، بۆیە داخ و حەسرەت دەخۆین و دڵتەنگ دەبین بۆ ئەو ڕۆژە، کە ئەم وێنەمان تێیدا گرتووە. کەواتە، وێنەی مرۆڤ، وێنەی پێش گۆڕانی مرۆڤە لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکەی ژیان، ئەوە، چ لەڕووی گۆڕانکارییە جەستەییەکان و چ لە ڕووی فیکر و ئاستی مەعریفە و تێگەیشتنی ژیانەوەشبێ، بەهەموو ڕەهەندە جیاوازەکانەوە.

بۆیە نۆستالژیا پەیوەندیەکی کۆنکریتی لەگەڵ وێنە و ئەلبوومی وێنەکاندا هەیە، چونکە دواجار وێنەکە وێنەی مرۆڤێکە لەناو کۆمەڵگەدا گیراوە، لە کات و شوێنێکی دیاریکراوە، بۆیە بە هەڵدانەوەیان و دووبارە سەیر کردنەوەیان لەناوئەلبوومەکاندا، تووشی جۆرێك لە خەم و حەسرەت، یان خۆشی و شادی و هەستیاری نۆستالژیا دەبین، چونکە لەوانەیە ئەو کەسانەی وێنەت لەگەڵ گرتوون ئێستاکە نەماون و شوێنیان بەتاڵ و خاڵییە، یان لە تۆ دوورن، ئەوەی ماوە تەنیا ئەم وێنەیەیە.

بۆیە مرۆڤ هەمیشە، کە وێنەیەك دەگرێ لە پشتی وێنەکە دەنووسێت، بۆیادگاری ئەم وێنەیە لە ڕێکەوتی ئەوەندەی ساڵی ئەوەندە و کاتژمێر ئەوەندە لەگەڵ فلانەکەس لە فلان شوێن گیراوە، ڕۆژێکی خۆش بوو، یان ڕۆژێکی زۆر ناخۆش بوو. جا هەندێجار ئەم وێنەیە (وێنانە) دەبنە هۆی دروستکردنی هەستی گشتی، واتە کار لە هەست و نەستی کۆمەڵگە بە گشتی دەکەن و بە نەستی کۆ ناو دەبردرێ، کە (یۆنگ) جەختی لەسەردەکردەوە بۆ نموونە، وێنەیەکی سەرکردەیەکی نەتەوەیی، یان شاعیرێکی میللی و نەتەوەیی و.....تاد. زۆرجاریش دەگوترێت فۆتۆگرافی لە پەیوەندیەکی نەچەسپاو دایە بەو بوارانەی، کە نەستی گشتی مرۆڤەکانیان لێپێکهاتووە، وەك بەها کولتوورییەکان، یادەوەرییەکان، ئەفسانەکان، ئایین، غەریزەکان.....تاد.

## ٥. پەیوەندی نۆستالژیا بە هونەری پەیکەرتاشییەوە

ئەدەب بە گشتی و نۆستالژیا بە تایبەتی پەیوەندی هەیە، لەگەڵ هونەری پەیکەر تاشی، چونکە پەیکەری هەرکەسێك، کە دروست دەکرێت، وەکو بیرەوەری و یادگارییەك دەمێنێتەوە.

لە مێژووی نەتەوەیی و کولتووری هەر میللەتێك ئەم دیاردەیە بوونی هەیە، بەتایبەتی لە لای ئەوروپی و ئەمریکییەکان. بۆ نموونە پەیکەری کەسێکی ئایینی، یان، کەسایەتییەکی مێژوویی، یان سیاسی، یان وەرزشی، یان هونەرمەندێك و ئەدیبێك.....تاد، ئەمانە وەکو ڕەمزی نەتەوەیی و نۆستالژیایی گشتی و بیرەوەری گشتی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرێت لە بابەتی نۆستالژیا و دەقی نۆستالژیادا، چونکە گوزارشت لە کەسایەتی و ژیانی کۆن و ڕابردووی کەسایەتییەکی خۆشەویستی تێپەڕیو دەکەن.

دیارە بە شێوەیەکی گشتی پەیکەر بە زۆری دوای مردن بۆ هەندێ کەسایەتی دەتاشرێت، لە شوێنێکی شار دادەنرێت، وەکو هێمای خۆشەویستی و سۆز و مانەوەی ئاکار و سەرکەوتنەکانی خاوەنی کەسایەتی پەیکەرەکە، لە بیر و هزری کەسەکانی ناو کۆمەڵگە و نەتەوەکەی، ئەوەش دەبێتە یادگارییەك بۆ نەوەی نوێ و ئەوانەی لە سەردەمی ئەم کەسایەتیانە ژیاون. بۆ نموونە پەیکەری "غاندی" لە

هیندستان و بەشێك لە میللەتانی ژێردەست، یان، "گیڤارا"ی، شۆڕشگێری ئەرجەنتینی.

لەناو ئێمەی کوردیشدا، پەیکەری زۆرمان هەیە و پەیکەرتاشی بەناو بانگمان زۆرن لەم بوارەدا، وەك "دارا محەمەد" و "زیادەدین بەهائەدین" و.....تاد، پەیکەرەکانی نەتەوەیی کورد، وەك: "ابن موستەوفی" لەسەر قەلآت لە هەولێر، پەیکەری "نالی، سالم، پیرەمێرد، دیلان، گۆران" لە سلێمانی و "حاجی قادر کۆیی و خالید دلێر" لە کۆیە و "جواهیری" لە پارکی سامی عەبدولڕەحمان، پەیکەری وەرزشی "فەرەنسۆ هەریری" لەناو یاریگای هەولێر، گۆرانیبێژانی وەك، "تایەر تۆفیق" و "خاڵە سێوە" و.....تاد، ئەمانە نموونە و ڕەمزی نۆستالژیا و بیرەوەری میللەتن.

## ٢- ٦ پەیوەندی نۆستالژیا بە ئەدەبیاتەوە

ئەم زاراوەیەی نۆستالژیا لە سەرەتادا پەیوەست بوو بە بواری دەروونناسی و بۆ چارەسەرکردنی سەربازگەلێك بەکار دەهات، کە بە دوورکەوتنەوەیان لە ماڵ و حاڵ و خێزانەکانیان و وڵاتانی خۆیانی تووشی نەخۆشی نۆستالژیا ببوون.

بە تێپەڕبوونی (٥٠)ساڵ وردە وردە زاراوەی نۆستالژیا لە دەقە پزیشکییەکان نەما و لەناوچوو، ئیتر بۆ وەسفی ئاڵۆزی دەروونی نەخۆشەکان بەکار نەدەهات، هەر لەو کاتەدا، ئەم زاراوەیە هاتووەتە ناو دنیای ئەدەبیات.

کەواتە: زاراوەی نۆستالژیا لە بواری ئەدەبدا ((بە شێوازێکی نووسین دەگوترێت، بە پێی ئەم بنەمایە، شاعیر، یان نووسەر لە شیعر و نووسینەکانیدا بیر لە ڕابردوویەکی بەسەرچوو، یان وڵاتێك، کە لە بیریەتی و ناتوانێ لە بیری بکات، بە حەسرەت و ژانەوە، وێنەیان دەکێشێت و بەرهەمەکان دەخاتە ڕوو...))[١٣٥].

پاش ئەوە وردە وردە ئەم زاراوەیەی نۆستالژیا لە بوارەکانی دیکەشدا، بەتایبەتی بواری زانستی مرۆڤایەتی و هونەریش بەکارهات،

(١٣٥) حسن انوشه، فرهنگ نامه ادبی فارسی، جلد ٢، چاپ اول، سازمان چاپ و انتشارات، تهران، ١٣٧٦، ص ٦٠ و ١٣٥٩.

بۆیە ((ڕەخنەگرانیش لە بەرهەمی شاعیران و هونەرمەندان بە دوای تایبەتمەندییەکانی ئەم بابەتە و چۆنیەتی دەرکەوتنی ئەم هەڵس و کەوتە ناهۆشیارە کەوتن))[١٣٦].

چەندان توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە ئەنجامدا، دەریانخست لە دنیای ئەدەبیاتدا کۆمەڵێك بەرهەم هەن، هەڵگری نیشانەگەلێکی نۆستالژیان، وەکو شانۆنامەی ((ئودیبی پاشای سۆفۆلیکس))[١٣٧] ، هەروەها((کۆمار)ی "ئەفلاتوون" و (سیاسەت)ی "ئەرەستۆ" و (تۆتۆپیا)ی "تۆماس مۆر ١٤٧٧-١٥٣٥" و (شاری خوا)ی "ئۆگستینۆس" و (المدینە الفاضلة)ی "فارابی ٨٧٠-٩٥٠" و ڕۆمانی (لیس ثمة أمل لككاميش)ی "محەمەد عەبدالمعید" و ڕۆمانی (المخلوقات)ی "فاضل العزاوی" و ...تاد))[١٣٨]. ئەم بەرهەمانە بەشێکیان بەر لە ناسینی نۆستالژیا وەکو چەمك و پێناسە لەناو ئەدەبدا، وەکو بەرهەم و وەکو دیاردە بوونیان هەبووە، دەچنە خانەی شاری نموونەیی (نۆستالژیای شاری نموونەیی).

(١٣٦) یوسف عالی، غم غربت در شعر معاصر، ١٣٨٧، ص ٩٠. (http://yosefaali.blogfa.com)

(١٣٧) سەرکەوت سەعدی قادر، نامۆیی لە ڕۆمانەکانی "سەلاح عومەر"دا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١، ل ٧٥.

(١٣٨) سەباح ئیسماعیل، چەمك و ئێستێتیکای شوێن لە ئەدەبدا، چاپی یەکەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩، ل١١.

"تقی زادە" دەڵێ: ((هەرچەندە ئەو زاراوەیە تازە بەتازە هاتووەتە ناو بوارە جیاوازەکانی هونەر و ئەدەب، بەلاّم لە ڕاستیدا نوێ نییە، ئەم زاراوەیە دەروونناسییە و وردە وردە هاتووەتە ناو بوارەکانی دیکەی زانستە مرۆڤایەتییەکان، لەوانەش ئەدەبیات))[139]،کەواتە نۆستالژیا لە ئەدەبیاتدا نەخۆشییەك نەبووە، بەڵکو ئاماژەیەك بووە بەهەستێکی ڕۆمانسیکی و خەم و ژانێکی درەنگ لە دایکبوو، بۆ نموونە بەرهەمەکانی نۆستالژیا لە ئەدەبیاتی فەڕەنسی لە بەرهەمەکانی "هۆگۆ و بالزاك و بۆدلێر و لامارتین و ڕۆمانی نامۆیی ئەلبێر کامۆ و.....تاد" ڕەنگیداوەتەوە.

لە ئەدەبیاتی ئینگلیزیشدا لە بەرهەمەکانی "کولدریج ١٧٧٢-١٧٣٤" و "شیللی ١٧٩٢- ١٨٢٢" و "بوب رای" و "بایرون ١٧٨٨-١٨٢٤"))[140] و.....تاد، هەروەها لە بەرهەمی (دۆن کیشۆت)ی "سیرڤانتیس"ی ئیسپانیدا ڕەنگیداوەتەوە.

لە ئەدەبیاتی کوردیشدا نموونەیان زۆرن، وەك: (دوو چامەکە)ی "نالی و سالم" و (لاواندنەوەکە)ی "ئەحمەد بەگی کۆماسی" و هەندێ لە شیعرەکانی "مەولەوی" (دووئاوان)ی "پیرەمێرد" و (دوو گەشتەکەی قەرەداغ و هەورامان)ی "گۆران" و (ناڵەی جودایی)ی

(١٣٩) تقی زادە، نوستالژی، مجله فرهنگ و هنری بخارا، شماره (٢٦)، ١٣٨١، ص ٢٠٢.

(١٤٠) ڕەزا سەید حسینی، قوتابخانە ئەدەبییەکان، وەرگێرانی: حەمە کەریم عارف، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٧٠-٧١.

"هێمن" و (فه‌رهه‌نگی خه‌م)ی "حه‌سیب قه‌ره‌داغی" و (وتم به‌به‌ختی خه‌واڵوو)ی، "حاجی قادری کۆیی" و (غه‌ریبی)ی"سه‌لاح شوان"و (خه‌زان)ی" عوسمان شه‌یدا"و (زه‌ماوه‌ندی باوه‌ش پێداکردنه‌وه)ی"جه‌لالی میرزا که‌ریم" و (له‌ته‌وه‌ێڵی چیایه‌کدا ده‌گیرسێته‌وه)ی"عه‌بدولرزاق بیمار" و ڕۆمانی (ژانی گه‌ل)ی "ئیبراهیم ئه‌حمه‌د" و (هه‌ڵکشان به‌ره‌و لووتکه)ی "عه‌بدوڵڵا سه‌ڕاج" و (شار)ی "حوسێن عارف" و.....تاد.

## ٢- ٧ پەیوەندی نۆستالژیا بە ئەدەبی هاوچەرخەوە

نۆستالژیا لـە ئـەدەب و شـیعری هاوچـەرخدا مەودایـەکی فراوانـی داگیرکردووە، لەم جۆرە شیعرانەی نۆستالژیان، بەتایبـەتی شـیعرێك، کـە هەسـتی غـەمباری و خـەم و حەسـرەت و تـەنیایی و غوربـەتی لەگەڵدابێت، هەندێك جار ڕووداوی تاڵ و بارودۆخی تایبەتی زەمەنێك، کە شاعیر تێیدا ژیاوە و هەلو مەرجی ژیانی تایبەتی شاعیر زەمینـەی نا ئومێدی و غەمباربوون ئەوی بۆ لای ئاوازی ئەو زەمان بردووە.

خەمی غوربەت و حەسرەتی ڕابردووی لە دەستچوو، ئاواتخواسـتن بۆ داهاتووێکی نموونەی و بێ گرفت و ئارام، لـە شـیعری هاوچـەرخدا زۆر بایـەخی پێـدراوە. بۆیـە دەگـووترێ: ((سـەدەی بیسـتەم بـە یۆتۆپیا(*) دەستی پێکرد و بە نۆستالژیا کۆتایی پێ هات، نۆسـتالژیا وەك مۆدێلێکی ئەدەبی هاتـە مەیـدان و بـوو بـە بەشـێکی گـرینگ لـە ئـەدەبیاتی هاوچـەرخ، چـونکە نۆسـتالژیا پەیوەسـتە بـە ئەندێشـەی لەدەستدان و دوورکەوتنەوەی مرۆڤ...))[١٤١].

(*) (یۆتۆپیا ) : دوو وشەی لاتینیە بە واتای ئەو شوێنە دیت، کە بوونی لە ئەرزی واقیعدا نییە.
(141) SvetlanaBoym.Nostalgia and ItsDis contents,p25.

له شـیعر و ئـەدەبی هاوچـەرخدا، خـەمی غوربـەت و حەسـرەت و دڵتەنگی، کە سەرهەڵدەدات، بە چـەند شـێوەیەکی جیـاواز دەخرێنـە ڕوو.

یـەکێك لـە هۆکارەکـان، جۆرەکـانی بـەرەو پێشچـوونی خێـرا و سەرسوڕهێنەری شارستانییەت و پیشەسازی و تەکنەلۆژیایە. زانستی بەرەو پێشچوونی پیشەسازی و تەکنـەلۆژیا، لەگـەڵ ئـەو نوێگـەری و ئاسـانییەی، کـە بـە مرۆڤـی دەبەخشـێ، لـە هـەمان کاتـدا لـە دڵخۆشییەکان و سۆز و ڕابردوو و شتە پیرۆزەکانی مرۆڤ لەگەڵ خـۆی لەناو دەبات و مرۆڤ لە بەرانبەر شارستانیەت زۆرتـر و زووتـر تووشـی ترس و بێ ئومێدی دەبێت و دەبێتە هـۆی ئـەوەی مـرۆڤ بـۆ شکسـت پێهێنانی ئەم ترسە پەنا بباتە بەر ڕابردووی خۆی و حەسـرەت و داخ بەبیرە خۆیان بهێنێتەوە.

نۆستالژیا یەکێکە لەو دیاردانەی، کـە لـە جیهـانی هاوچـەرخ و لـە بـواری ئەدەبیاتـدا ڕای بـە شـێکی زۆری ڕەخنـەگرانی بـۆلای خـۆی ڕاکێشـاوە، چـەندین کتێـب و توێژینـەوەیان لـەبارەوە ئەنجامـداوە، بەتایبـەتی لـە سـەدەکانی بیسـت و بیسـت و یەکەمـدا. بـۆ نموونـە((کتێبـی " نۆسـتالژیا، حەشـارگەی واتـا Nostalgia Sanctuary of Meaning" بەرهەمی جینل ال.م. ویلسـون Jenell. L.O. Wilson.بابەتی ئەم کتێبە باس لە پەیوەندی نێوان نۆسـتالژیا و کەسـایەتی مرۆڤـە. هـەروەها کتێبـی " داهـاتووی نۆسـتالژیا

بەرهــەمی (ســوتلانا بــویم "The Future of Nostalgia Svetlana Boym) لە زانكۆی هارواردی ئەمریكی.

كتێبی "ئـەخلاق و نۆسـتالژیا لـە ڕۆمـانی هاوچـەرخدا Ethics and Nostalgia in the Contem porary,Novel بەرهـــەمی(جـــۆهن .جـــی.ســـو .John. J. Su) لـــە زانكـــۆی كامبریج...))[١٤٢].كە هەوڵی شـیكردنەوەی نموونـەكانی نۆسـتالژیا لـە ڕۆمانی هاوچەرخی داوە.

ڕۆمانی (نـەزانی – جەهالـەت)ی[*]، نووسـەری بـەناوبانگ "مـیلان كۆندرا"[**]، دەتوانین وەك بەرهەمێكی دیار و بـەناوبانگی نۆسـتالژیا ناوی ببەین.

---

(١٤٢) یوسف عالی أباد، غم غربت در شعر معاصر، نشریه علمی، پژوهشـی گـوهر گویـا، سـال دوم، شماره (٦)، تابستان، ١٣٨٧، ص١٥٦.

(*) ڕۆمانی (نەزانی/ جەهالەت/ Ignorancian ) وشەی (نـەزانین) وشـەیەكی فەرەنسـییە بـە واتـای دڵتەنگ بوون، یان نۆستالژیا: واتە دەردی نەزانین، كە ئاگاداربوونە لەو خاڵەی، كە دوور لەوان شتێك هەیە، ئەوان لێی بێ ئاگان، واتە: نـازانن لـە نیشـتیمان و زێـد چ بـاس و خواسـە. كەواتـە: (نـەزانی) مەبەستی واتا باوەكەی نییە، كە لە فەرهەنگ داهاتووە، بە واتای نەزانین و جەهل و نەفامیە، بـەڵكو لێرەدا بە واتای (نۆستالژیا) بەكارهاتووە.

(**) (میلان كۆندرا) لەساڵی(١٩٢٩) لە وڵاتی (چیك) لە دایكبووە، پاشان دەچێتە فەرەنسا و لەوێ دەژیت و نووسینەكانی بە زمانی فەرەنسە بڵاودەكاتەوە، یەكەم بەرهەمی كۆمەڵە شیعرێكی بە ناوی (مـرۆڤ، بـاغی مـەزن) لـە سـاڵی(١٩٥٣) بڵاوكردۆتـەوە، یەكـەم شـانۆنامەی بـە نـاوی (خاوەنـدارانی كلیلەكان) لە ساڵی (١٩٦٢) و یەكەم كتێبی چیرۆكی بە ناوی (عەشقە پێكەنییەكان) لەساڵی (١٩٦٤) بڵاوكردەوە، یەكەم ڕۆمانی لەساڵی (١٩٦٧) بە ناوی (گاڵتە) بڵاوكردەوە، لەگـەڵ چـەندین بەرهـەمی دیكـــەدا، دوا بەرهـــــەمی لـــــە ســــاڵی (١٩٩٩) نووســــیوە، ڕۆمانێكـــــە بـــــەناوی (نەزانی/جەهالەت/Ignorancian)و لە ساڵی (٢٠٠٠) لە ئیسپانیا بڵاوكرایەوە.

نــوێترین بەرهــەمی نۆســتالژی ڕۆمــانێکی عەرەبییــە بــەناوی (نوســتالجیا ) لەلایـەن "أسـامة شـاذلی" نووسـراوە، لـە ٢٠١٣/٥/٢٧، لە(دار نهضة) لە مصر چاپ و بلأوکراوەتەوە. کەواتە، وەك ئاشـکرایە بەشـێکی زۆری بەرهەمـەکانی ئـەدەبیاتی جیهـانی نۆسـتالژیایان بـە ناوەرۆکی سەرەکی کاری خۆیان داناوە.

ئەگـەر سـەیری ئـەدەبی هاوچـەرخی کـوردی بکـەین، بـۆ بابـەتی نۆستالژیا، ئەوا کۆمەڵێك بەرهەم و دیوانی شاعیران لە ئەدەبی نوێ و هاوچەرخدا دەبینین، کە هەڵگری مانای دەلالی نۆستالژیان، نووسەر و شاعیران لە ئەدەبی کوردیدا، بەشێکی زۆری ئەو دەقە ئەدەبیانەی لە ئەنجامی کۆچکردنی شاعیران و نووسەران بـۆ هەنـدەران و دەرەوەی وڵات بووە، جا کۆچێکی ئارەزوو مەندانە بووبێت، یـان کۆچـکردنێکی بە زۆرە ملێ و لەژێر پاڵەپەستۆی بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایـەتی و ئابووری و.....تـاد، بووبێـت. هۆکـاری سـەرەکین، بـۆ دروسـتبوون و ســــەرهەڵدانی بەرهــــەمی نۆســــتالژی و ڕەنگدانــــەوەیان لــــەناو بەرهەمەکانیاندا.

---

بۆ زیاتر زانیاری سوودم لە پێشەکی وەرگێڕانی ڕۆمانی (نەزانی ) وەرگرتووە، کـە (ئـەنوەر حەسـەن پوور) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی:

ــ میلان کۆندرا، ڕۆمانی (نەزانی)، ئەنوەر حەسەن پوور، چاپی یەکەم، چاپچانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٦.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین: کە بابەتی نۆستالژیا بـەهۆی بابەتــە سیاســی و کۆمەڵایەتییــەکان و کێشــە تاکەکەســییەکان و تایبەتمەندیە ڕووحی و دەروونییەکانی شاعیر و کاریگـەری مـۆدێرن و تەکنەلۆژیا و شارستانییەت و جیهانی هاوچـەرخ لەسـەر پەیوەنـدی و بـارودۆخی دەروونـی مرۆڤـەکان و هۆکارەکـانی دیکـە، دەبنـە هـۆی بــەکارهێنانی زاراوە و دەســتەواژەی خــەمی غوربــەت و حەســرەتی نیشتیمان و کاتی ڕابردووی پڕشکۆ، یان تاڵی و ناخۆشی، لە شـیعر و ئەدەبی هاوچەرخی کوردیدا ڕەنگی داوەتەوە.

دیـاردەی نۆسـتالژیا خـەم و حەسـرەت و تـاڵی و شـیرینییەکانی ژیانە، لە جیهـانبینی هـەموو مرۆڤێـك، بـە شـێوەیەکی گشـتی بـوونی هەیە و تووشی ئەم گەڕانەوەی ڕابردوو و غەریبی و خەمی غوربـەت و تەنیایی و تاراوگەییە دەبێت، بـەڵام لای شـاعیری و نووسـەر ئەمانـە ئەزموونی ژیانن لەناودەقەکانیاندا بەرجەستەی دەکـەن. واتـە ئەگـەر ئەمانــە بکــەین بــە ڕووداو، ئــەزموونی بکــەین ڕووداوەکــان ڕووداوی دەگمەن و شازن دووبـارە بوونـەوەیان کـارێکی ئەسـتەمە و مەحاڵـە، شیعریش، وەك ڕووداو هەمیشە ڕووداوی تاکە کەسێکە، کـە شـاعیرە، ناکرێ ئێمە بچینە شوێنی ئەو هەمان ڕووداو ئەزموون بکەین، کە ئـەو کردوویەتی(بەرهەمی هێناوە)، هەر ئەمەش خاڵی جیاوازی نووسـەر و شاعیر و خەڵکی ڕەمەکی و ئاسـایی نـاو کۆمەڵگەیـە. کەواتـە ئـەوەی

ئێمە ئەنجامی دەدەین و لەڕێگایەوە دەگەین بە ئەزموونێك بۆخۆمان، بریتییە: لە پرۆسەی خوێندنەوە و ڕاڤەکردنی بەرهەمەکە.

"ڕێبوار سیوەیلی" لەبارەی شیعری هاوچەرخی کوردی نەوەی هەشتا و نەوەدەکانەوە، دەڵێ:((شیعری دوو دەی ڕابردووی ئێمە، نەوەی ئەم تێکشکانە قووڵەیە، نەوەك لەناو مەترسی و ئاژاوەکانەوە، لەبەرەی پێشەوەی ئەو جەنگانەوە، کە دژ بە بەهاکانی ژیان هەڵگیرسابوون، خەیاڵە شیعریەکەی، وەکو هێزێکی شوناسکەر و بەرگریکەر لە ژیان و ئینسانییەت دەخاتەڕوو...))[١٤٣].

لەم جیهانە پڕ کێشمەکێشم و داماڵدراو لە بەها مرۆڤایەتی و ڕۆحییەکان، لەگەڵ هاتنە ئارای قەیرانی شارستانیەت و تەکنەلۆژیا و زاڵبوون و بالأدەستی ماددی شارستانیەت بەسەر لایەنە مەعنەوەیەکەی، پێچەوانە بوونەوەی ساتەکانی مرۆڤ لەگەڵ دەووروبەر و ساتەکانی خۆیدا، تووشی خەم و خەفەت و گۆشەگیری و تەنیایی و نامۆبوون دەبێ. کەواتە، شیعر و ئەدەبی هاوچەرخی کوردی هەڵگری چەمك و ڕەهەندە ئاڵۆزەکانی ژیانی مرۆڤە، بەو واتایەی شیعر دنیای خەمەکانە، شانۆی شادی و بەختەوەری و چیرۆکی ژیانە، تابلۆی ڕووح و جیهانی ناخە، بۆیە لەسەردەمی

(١٤٣) ڕێبوار سیوەیلی، نەتەوە و حەکایەت، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٥٠٦.

هاوچەرخدا دەگوترێ: ((شیعر تەواوی ژیان لەخۆ دەگرێ، لەگەڵ هەموو دژایەتی و ناکۆکییەکان))[١٤٤].

ئەگەر شیعر و ئەدەب بۆ میللەتانی ئەورووپی و ئەمریکی و وڵاتانی دیکە تەواوی ژیان بێ، ئەوا بۆ ئێمەی میللەتی کورد و شاعیر و نووسەرانی کورد لەمەش ئەولاترە، چونکە قەڵغانێك بووە، بۆ سینگی نووسەران و شاعیرانی کورد دژی نەیار و ناحەزانی کورد.

نووسەر و شاعیرانی کوردیش کۆمەڵێك بەرهەم و دیوانی پوخت و پڕ بایەخیان هەیە، تەنانەت هەندێك شاعیر و نووسەر خەمی غوربەت و گەڕانەوە، بۆ ڕابردوو و ڕاکردن لە واقیعی ژیان و بێزاربوون لە مۆدیرنە و بەرهەمی شارستانیەتە نوێکان، بووەتە خاسیەتێکی دیار و تایبەتی دەقەکانیان.

ئەگەرچی چەمکی تازەگەری و نوێخوازی هەڵوەستە و گومانکردنە لە کولتوور و کەلەپووری کۆن، بە ئامانجی تێپەڕبوونە لێی، بەلاّم نەیتوانیوە، ئاوڕ لەڕابردوو نەداتەوە و ورد و درشتی نەپشکنێ و لێی سوودمەند نەبێت، چونکە مێژووی دێرینی سەدەکانی ناوەڕاست و زەمەنی ئێستامان، وەك قۆناخی جیاجیاش بێ، سەرچاوەکانیان لە چوار ڕیانی ئاییندەدا لە زۆر ڕووەوە ڕەگەکانیان تێکدەئاڵێن، چونکە

(١٤٤) دانا سەعید سۆفی، دەقی هاوچەرخ، گۆڤاری(سبەی)، ژمارە(١)ی، جۆزەردانی ساڵی، ١٩٩٣، هەولێر، ل ٢٤.

هـیچ ئـەدەبێك لـە بـۆ شـاییەوە نایێتـە بـوون، واتـە نوێخـوازیش لـە بۆشاییەوە نەهاتووەتە ئاراوە.

بۆنموونە لە خوارەوە هەندێك بەرهەمی نووسەر و شاعیرانی کـورد دەخەینەڕوو:

(لە غوربەتا)ی "محەمەد عومەر عوسمان" و دیـوانی (فەرهـەنگی خەم)ی "حەسیب قەرەداغی" و (دەربەندی پەپوولـەکان)ی "شـێرکۆ بێکـەس" و (نەباغـەریبیٚ جێـت بگـریٚ)ی " ئـەژی گـۆران" و (ڕێگـا دوورەکـانی چـاومان)ی" جـەلالی مـیرزا کـەریم"و (سـەمای بـەفری ئێـواران)ی" جـەلال بـەرزنجی"و (تاڤگـەی مەنـد)ی "نـەژاد عـەزیز سـورمیٚ" و (شـەوێك لـە شـەوانی سـیمرخ)ی" سـەلاّح شـوان" و (نزاسـپییەکانی مـن)ی " عوسمـان شـەیدا" و (هـەولێك بـۆ کوشـتنی کات)ی "دڵشـاد عەبـدوڵلاّ" و (نالّـەی جـودایی)ی "هـێمن" و ڕۆمـانی (وێنـــەك لەســـەر ئـــاو)ی "ســـەلاّح عومـــەر"و (شـــاری مۆســـیقارە سپییەکان)ی "بەختیار عەلی" و (پێنجەمین کتێـب)ی "جـەبار جـەمال غەریب" و چیرۆکی (هەشت و نیوی بەیانی – هەشت و نیوی شـەو)ی "عەبـدوڵلاّ سـەڕاج" و کۆچـیرۆکی (بەپەنجـەکانم دەتبیـنم)ی"دڵشـاد مەریوانی".....تاد.

کورد و مرۆڤی کورد هەمیشە بەوە ناسراوە، کەوا سۆز زاڵە بەسەر عەقڵیدا، واتە تاکی کورد تاکێکی سۆزدار و پڕ هەست و عاتفیە، هـەر بۆیەش ئاساییە ئەدەبەکەشی ئەدەبێکی سـۆزدار و هەسـت و سـۆز و

عاتفی بێت. نۆستالژیا لە ئەدەبی هاوچەرخ و نوێخوازی کوردیدا، پانتایەکی فراوان و پڕ بایەخی تەنیووە، بێگومان ئەمە تەنیا شتێك نییە، تایبەت بە ئەدەبی کوردی، بەڵکو بەرهەمی نووسەر و شاعیرانی جیهانیشی. تەنانەت زۆرێك لە شاعیرانی هاوچەرخ و نوێی کوردیش نازناوەکانیان، ناز ناوی نۆستالژین، لەوانە: "پەشێو!! پەرۆش!! بێ کەس!! بێخەو!! ڕەنجدەر!! زامدار!! بیمار!! دڵزار!! شەیدا!!و.....تاد".

## ٢- ٨ پەیوەندی نۆستالژیا بە ڕێبازە ئەدەبییەکانەوە

### أ) پەیوەندی نۆستالژیا بە ڕێبازی کلاسیزمەوە

کلاسیزمی ئەوروپی لە سەدەکانی پ.ز، دەست پێ دەکات و تاکۆتایی سەدەی هەژدەم بەردەوام بووە، واتە، لە ئەدەبیاتی گریکی و لاتینی یەوە، دەست پێ دەکات و دواتر لە ئەوروپا بەلاسایکردنەوەی ئەدەبی یۆنانی و ڕۆمانی کلاسیزمی نوێ لە سەدەکانی پانزدە و شانزدە سەر هەڵدەداتەوە، تاکۆتایی سەدەی هەژدەم. گرینگترین سەرچاوەکانی بریتی بوون لە بەرهەمەکانی ئەرستۆ، هۆراس، بوالۆ... .

"هۆراس" دەڵێ: ((مەرجی تێگەیشتنی کلاسیزم و مەرجی بوونی لەگەڵ مەرجی گەڕانەوە بۆ کۆن گرێداوە))(١٤٥). دوای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ڕێنسانس لە ئیتاڵیا لە سەدەکانی پانزە و شانزە. سەرەڕای تازەگەری و داهێنانەکانیش، داهێنانەکانیشی لەسەر بنچینەی گەڕانەوە، بۆ ڕیشە شارستانییەکانی ئەوروپای کۆن دامەزرابوو ((زیندوو کردنەوەی کولتووری دێرین و ئەدەبیاتی کۆن بە

(١٤٥) فەرهاد پیرباڵ (د)، ڕێبازە ئەدەبییەکان، چاپخانەی دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٤،ل ١٩.

شێوەیەکی تازە و داهێنەرانە))[١٤٦]. بەمەش دەبێتە هۆی داهێنانی بەرهەمی زیندوو نەمر لە دنیایی ئەدەبیاتدا.

## گرینگترین بنەما و دەستوورەکانی کلاسیزم:

کلاسیزم خۆی لەسەر چەند بنەما و خاسیەتێکی گرینگ دامەزراندووە و کردوویەتی بە مەرجی دەقی بەرهەمی کلاسیکی ئەوانیش:

**١- لاسایی کردنەوەی سروشت:**

"بوالۆ"، دەڵێ: ((تەنانەت یەك چرکەش لە سروشت غافڵ نەبی))[١٤٧]. لاسایی کردنەوەی سروشت لای کلاسیزمەکان شتێکی جیاواز و تێڕوانینێکی دیکەی هەیە، لەگەڵ لاسایی کردنەوەی سروشت لەلای ڕۆمانسییەکان و ڕێبازەکانی دیکە دا.

سروشت لەلای کلاسیزمەکان تەنیا دەبووایە شتە باش و ناواخنە ئەخلاقیە بەرزەکانی لێ وەربگیرایە، کلاسیکییەکان سروشتیان بە شێوەیەکی وا لە بەرهەمەکانیاندا باس دەکرد، کە لەگەڵ ڕاستی و واقیع بگونجابایە و خزمەتی عەقڵ و ئەخلاقی باوی کۆمەڵی بکردایە، واتە وەکو ڕۆمانسیزم باسی شتە ورد و پەراوێزخراو ناشیرین و خراپەکانی سروشتیان نەدەکرد.

(١٤٦) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣.

(١٤٧) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨.

**٢- لاسایی کردنەوەی کۆنیینەکان:**

کلاسیزمەکان، دەڵێن: بۆ دۆزینەوەی جوانی نەمر، پێویستە لەناو بەرهەمی نووسەرە کۆنینەکاندا بگەڕێین، واتە بەرهەمەکانی یۆنـانی و ڕۆمـانی کـۆن، وەك: ((ئـۆرپیر، ڤێرژیـل و سـۆفۆکلیس و ئێـزۆب و هۆمیرۆس و هۆراس و.....تاد، **"هۆراس"**، دەڵێ: ((نووسەری ڕۆمانی دەبـێ بـە شـەو و بـە ڕۆژ لاسـایی شـاعیر و نووسـەرانی یۆنـانی بکاتەوە))[١٤٨].

**٣- کۆن گێڕانەوە:**

مێژوو و چیرۆکە مێژووییەکان، وەك کەرەستەیەکی گرینگ شانۆی کلاسیزم ڕێزییان لێناوە.

**٤- عەقڵانیەت:** دەبێت ئەوە لە بیر نەکەین، کەوا هەموو شتێك لە کلاســیزم دەبووایــە، لــەژێر کــۆنترۆڵی عــەقڵ دابوایــە و عــەقڵ سەرپەرشتی کردبووایە، چونکە دەیـان گـووت: عـەقڵ خـەیاڵی مـرۆڤ بەرەو ڕێگایەکی ڕاست ڕێبەری دەکات و سنوورێکی بۆ دادەنێ.

لە ڕاسـتیدا هـیچ بەرهـەمێك و هـیچ دەقێکـی ئـەدەبی نییـە، هەڵگری سۆز و خولیا و خەیاڵی ئەندێشـەی نووسـەر نـەبێت، کەواتـە

---

(١٤٨) هـۆراس، هونـەری شـیعر، وەرگێرانـی لـە ئینگلیزییـەوە(حەمیـد عـەزیز )، چـاپی دووەم، چاپخانەی چوار چرا، سلێمانی،٢٠٠٥،ل١١.

بەرهـەمی کلاسـیکیش بـەدەر نییـە، لـە خـەیاڵی جـوان و ئەندێشـەی هونەری و سۆزی کاریگەر و هەستی دەروونی مرۆڤ و ...تاد.

### ٥- بابەتی بوون: (*)

کلاسیزم بایەخی بە گشت و کۆمەڵ دەدا، نـەك تاکەکەسـی، واتـە باسی خەم و خەفەت و کێشە و گرفتـی کۆمەڵگـە بـە گشـتی دەکـرد، بۆیە تراژیدیای کۆمەڵێك خەڵك و کۆمەڵگە بوو.

بێگومان نۆستالژیای گشتی هەمان ئامانجی هەیە، کاتێك بـاس لـە خەم و حەسرەتی کۆ دەکات و ئەو شتانەی ڕەمز و هێمای نەتـەوەین و گشـتین و هــەموو تــاکێکی کۆمەڵگــە خاوەنیــەتی کاتێـك نووســەر بەرهەمی نۆستالژی خەم و حەسـرەت و داخـی بـۆ شـوێنەوارێك، یـان مێژووی کۆنی نەتەوەکەی، یان شاعیرێك، یان کەسایەتییەکی کۆنی و دێرینــی دەخاتــە ڕوو، لێــرەدا هــەمان ئــەرکی شــاعیر و نووســەرانی کلاسـیزمی لـە ئەسـتۆیە و بۆیـان دەگەڕێتـەوەو دەیانکاتـە نموونـەی بەرزی نەتەوەیی، بەڵام بێگومان بەتایبەتمەندی خۆی.

---

(*) بۆ بنەما و دەستووری کلاسیزم سوودم لەم سەرچاوانەی خوارەوە بینیووە:

١- فەرهاد پیربال (د)، ڕێبازە ئەدەبییەکان، ٢٠٠٤ هەولێر، ٢٠٠٩ سلێمانی.

٢- ڕەزا سەید حوسێنی، قوتابخانە ئەدەبییەکان، وەرگێڕانی، حەمـە کـەریم عـارف، چـاپی یەکـەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٦.

٣- هیمداد حوسێن، ڕێبازە ئەدەبییەکان، هەولێر ٢٠٠٧.

٤- ئیدریس عەبدوڵڵا (د)، قۆناخی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری کوردی (١٨٥١- ١٩٢١)،چاپی یەکەم، چاپخانەی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری هەولێر، ٢٠٠٦.

"علی رضـا نـوری و أحمـد رضـا صـیادی" لـەبارەی نۆسـتالژیا و ئــەدەبی کلاســیکییەوە، دەڵــێن: ((خـــەم و نیگــەرانی نۆســـتالژیا: بەردەوام عاتیفی نییە، بەڵکو عەقڵیش ڕۆڵی سەرەکی هەیە. عەقڵیش بەبینینی وڵات و ڕابردووی خۆی و بەسوود وەرگرتن لە ئەزموونەکانی لە بەرانبەر ژیان حەسرەت دەخوات. دەق لە قووڵترین لایەنی. واتایی وەك ئاوێنەیەك برین و لایەنە دەروونییەکانی دەخاتە ڕوو))[١٤٩]

کەواتــە ئــەدەبی کلاســیزمی بــەدەر نییــە لــە خــەم و حەسـرەتی گەڕانـەوە بـۆ ڕابـردوو، بـەڵکو بگـرە مـەرجێکی سـەرەکی و گرینگـی دەقی کلاسیکی بووە، چونکە نۆستالژیا بابەت و دیاردەیەکی تایبەت نییە، تەنیا بە ڕێبـازێکی ئـەدەبی دیـاریکراو و سـەردەم و قۆناخێـك، بەڵکو لە هەموو ڕێباز و ئەدەب و بەرهەمە ئەدەبییەکاندا بوونی هەیـە و ڕەنگی داوەتەوە، بە شێوەی جیا جیا و هەندێکیان لـە هەنـدێکیان زیاتر و بەرچاوترن، چونکە دیاردەیەکی مرۆڤایەتییە و پەیوەستە بـە دڵ و دەروون و خەم و ژانی خودی مرۆڤ خۆیەوە. لێرەدا بە پێویستی دەزانم چەند نموونەیەك لە بەرهەمی کلاسیزمی ئەورووپی بخەینە ڕوو، ئەگەر لە ڕوانگەی خوێندنەوەو پێناسەکەی "میلان کۆندێرا"وە، بـۆ نۆستالژیا سەیر بکەین، کەوا دەیگووت: نۆستالژیا دەردی نـەزانی یـە و دڵتەنگبوونە.

---

(١٤٩) احمد رضا صیادی و علی رضا نوری، نوستالژی در أثـار ناصـر و نظـامی و خاقـانی، آمـوزش زبان و ادب پارسی، شماره چهارم، تابستان، ١٣٩٠، ص١١.

بۆیە یەکەم بەرهەمی نۆستالژیا شانۆ نامەی "سۆفۆکلێس" ە، بە ناوی "ئۆدیب پاشا" بێگومان بەسەرهات و ڕووداوەکانی ناو ئەم شانۆ نامەیە، کە بەسەر ئۆدیب دێت لە ڕێگەی نەزانینەوە، ئا لێرەیە نەزانین یەکسانە بە دڵتەنگی و غوربەت و ژانی تەنیایی و نۆستالژیا. هەروەها داستانەکانی "ئەلیادە و ئۆدێسە"* ئۆدێسە،

---

**(*) (ئەلیادە و ئۆدێسە)**

لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین دا، (بیزستراتوس)، فەرمانداری (ئەسینا) فەرمانی دا، لیژنەیەکیان لە چەند بوێژ و وێژەوانێك پێکهێنا بۆ نووسینەوەی بەیتی (ئەلیادە و ئۆدێسە)، کە لە زمانی چیرۆك بێژەکانەوە سوود وەربگرن. بەم کردەوەیە هەردوو بەیتەکە چوونە ناو مێژووەوە. (ئەلیادە) و (ئۆدێسە) لەسەر زمانی (هۆمیرۆس) دەگێڕانەوە (هۆمیرۆس) چیرۆکبێژێکی خۆشخوانی دەنگ خۆش بووە. لەگەڵ (کەمانجە)کەیدا، شار بە شار و گوند بە گوندی (یۆنانستان) دەگەڕاو، بە گۆرانیەوە ئەم دوو بەیتەی دەگێڕایەوەو، کەمانجەیشی لەگەڵدا لێ دەدا. هەردوو بەیتەکە (ئەلیادە و ئۆدێسە) بە هۆنراوە نووسراون، بە ئاسانی و ڕەوانیەکەیان و بە ساکاری و جوانییەکەیان، کە هەر وەك سیحر و جادوو دڵمان کێش دەکەن و چاو بەستمان دەکەن. دواتر دەبن بە دوو چیرۆکی نەتەوەیی، لە چیرۆك و داستانە هەرە بەناوبانگەکانی (یۆنانستان) و (جیهانیش) دەژمێردرێن، بووەتە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند بۆ ئەدیب و هونەر و چیرۆکە لاسایيەکانی جیهانی.

"ئەلیادە" شەڕی "تروادە" کە داستانەکان لەسەر ئەو پاشماوەی ئەو هەڵبەستراون، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی نێوان سەدەی یانزدەم و دەیەمی پێش زایین. داستانی (ئەلیادە) پڕە لە دڵداری و جەربەزەیی. پڕە لە جەنگ و شەڕ و شۆڕ و ناکۆکی و دووبەرەکی نێوان پاڵەوانەکان و خوداکانی (تروادە) و (یۆنانستان) و ژێر دەستەکانیان. هەروەها پڕە لە کارەساتی سەهەندە و سەرسوڕهێنەر و سامناك، لەگەڵ ژیانێکی ڕەنگاوڕەنگ و بیر و باوەڕی سەیر سەیردا، کە هۆشمان گەلێکیان پەسەند ناکات.

بۆ ماوەی (١٠) ساڵ شەڕ و کوشتار لە نێوان هەردوولایاندا درێژەی کێشابوو، بە هۆی کردەیەکی ناپەسەندی شاهزادەیەکی هار و هاج و چەپخونەوە، کە ناوی (پاریس) بوو، کە لە شاری (تروادە) بە هۆی ئاوی (دەلیا) دەکەوێتە خاکی (یۆنانستان). (مینیلاوس)یش، کە شاهی (ئیسپارتە) بوو، میوانداریەکی خانەدان و باشی (پاریس)ی کرد و ئەمە جگە لە پاراستنی گیانی، بەلاَم شاهزادە

حەماسەی(بەهەستگەرمی) بونیادنەری نۆستالژیا بوو، کە هاوکات لەگەڵ لە دایکبوونی کولتووری یۆنانی

کۆن نووسرا، "ئۆلیس" گەورەترین قارەمانی تەواوی سەردەمەکانە و هاوکات گەورەترین گیرۆدەی نۆستالژیایە. هەروەها شیعری شوانکارەیی و بەرهەمەکانی "پێترارێک ١٣٠٤-١٣٧٤" و "ئیتالیای نیشتیمانم" و "دی کامیرۆن"ی "بۆکاتچۆ١٣١٣ ١٣٧٥ " چەندین بەرهەمی دیکە نموونەی بەرزی دەقی نۆستالژیان، لە ئەدەبی کلاسیزم.

ئەگەر بێینەسەر ((پەیوەندی نۆستالژیا بە ئەدەبی کلاسیزمی کوردی))، بێگومان بەرهەمی نۆستالژی زۆر جوان و نایابمان لە ئەدەبی کلاسیزمی کوردیدا هەیە.کاتێك باس لە پەیوەندی نۆستالژیا بە ئەدەبی کلاسیکی کوردی بکەین، ئەوا نابێ بە هەمان پرانسیپی ئەدەبی کلاسیزمی ئەورووپی و بە چاوێلکەی ئەوان مامەڵە لەگەڵ دەقەکانی خۆمان بکەین و بیاننرخێنین، چونکە ئەدەبی کلاسیزمی کوردی لە ڕووی زەمەن و شوێن و ژانرەکان و کۆمەڵێك بابەت و بنەمای دیکە جیاوازیان هەیە و هەمان بارودۆخ و ژینگەی

(پاریس) دڵی دەچێتە (هێلین) ی، ژنی ئەو شاهە و فریوی دەدات و هەڵیدەگرێ و دەچێتە خاکی (ترواده)، ئەمەش ناکۆکی خستە نێوان فەرمانڕەوایی "یۆنانستان" و فەرمانڕەوایی "ترواده" کە لە ئاسیای بچووکدا بوو، شەڕ دەستی پێکرد...، کە بە شەڕی "ئەسپەدارینە" بەناوبانگەکەی (ترواده) دوایی هات و نزیکەی (١٠)ساڵی خایاند، یۆنانییەکان سەرکەوتن و (هێلین) یان لە "ترواده‌ییەکان" سەندەوە، بۆ "مینیلاوس"ی مێردی و بردیانەوە بۆ "یۆنانستان".

سەرهەڵدانیان نییە، بۆ نموونە: ئـەدەبی کلاسـیکی کـوردی: پـڕە لـە سـۆز و دیـدی ڕۆمانسـیانە و تـوخمی ڕۆمانسـیزم، هـەروەها ئـەدەبی کلاسیزمی کـوردی بەشـێکی زۆری هـەڵگری بیروبـاوەری نەتـەوەیی و ناسیۆنالسیزمی کوردییە بۆ نموونە: (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانیٚ و جەزیری و حاجی قادری کۆیی.....تاد، ئەمـە جگـە لـەو بەرهەمانـەی نـاوەرۆکی ڕۆمانسـیان هەیـە، وەك: مەولـەوی و بێسـارانی و ئەحمـەد بــەگی کۆماســی...تــاد. دووچــامەی (نــالی و ســالم)(لەسـلێمانی و شـام)،(شـیرین و خوسـرەو)(خانـای قوبـادی)و(یوسـف و زولێخـا)ی (سەلیم سلێمان)، شـاعیرانی کـۆنی کـوردی دەقـەکانیان پڕیـەتی لـە بابەت و دیاردەی نۆستالژی بە تایبەتی:

١- نۆستالژیای غوربەتی ڕووح

٢- نۆستالژیای دووری لە مەعشوق: ئەوانیش بە دوو شێوە:

ألیف- مەعشوقی هەستی(مەجازی).

بیٚ- مەعشوقی نەستی(حەقیقی).

٣- نۆستالژیای غوربەتی جوگرافی.

٤- نۆستالژیای لە دەستدانی کەسە نزیکەکان و هـاوڕیٚ و پاشـا و خێزان و.....تاد.

ئـەم بنـەما و خاسـیەتانەی نۆسـتالژیا لـە بنـەما و نیشـانە هـەرە دیارەکـانی بەرهــەمی کـۆن و کلاسـیزمی شـاعیرانی کـوردە، چـونکە بەرهەمەکانی ئەدەبی کلاسـیزمی کـوردی زیـاتر شـیعرن و لـە جـۆری

(لیریکــین). ((شــیعری کلاســیکی کــوردی لــە ڕووی ناوەرۆکــەوە خەســڵەتی نەتــەوەیی زۆرتــر و غوربــەت و دووری لــە نیشــتیمان و وەســفی سروشــتی تایبــەتی کوردســتانی پێــوە دیــارە))[150]، وەك دەبیــنین شــیعری کــوردی لــە ڕووی ناوەرۆکــەوە، زیــاتر خودییــە و دەربڕی ناخی تایبەتی شاعیرە، بۆیـە زیـاتر مەبەسـتی شـیعرەکانیان شیعری لیریکییە.

ڕەنگە لایەنی لێکچوون لە نێوان خـەمی غوربـەت و حەسـرەت بـۆ ڕابـردوو، بتـوانین لـە لەدەسـتدان و بزرکردنـی ئـاوات و ئارەزووەکـان

---

(١٥٠) هیمداد حوسێن، ڕێبازە ئەدەبییەکان، چاپی یەکەم، ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧،ل ٢٩ .

"ئۆدێسە" چیرۆکەکی یۆنانی کۆنە لەلایەن "هۆمیرۆس" ەوە، نووسـراوە بـاس لـە شـەڕی (تـروادە) دەکات، کە (١٠) ساڵی خایاند، تێیدا یۆنانییەکان سەرکەوتووبوون و سـەربازەکان گەڕانـەوە بـۆ نـاو خێزان و ماڵ و منداڵ و نیشتیمانەکەی خۆیـان دوای ئـەو هـەموو خـەم و غـەریبی و غوربەتـە، بـەڵام تەنیا یـەکێکیان نـەبێ ئـەویش "ئۆدێسـە"ی، پاڵـەوان بـوو، ئـەم پاڵەوانـە هەنـدێك کـردەی وەهـایی نواندبوو، کە (پۆزیدۆن)ی، خوداوەندی دەلیای لە خۆی تووڕە کردبوو، ئەمیش لە داخانـدا سـوێندی لێ خواردبــوو، کــە هــەتا (ئۆدیســیۆس) مــابێ نــەهێڵێ جــارێکی دیکــە، ســەربکاتەوە بــەماڵی خۆشەویستەکەی خۆیدا، کە لە (ئیناکا) دابوو، بێبەشی کرد لە باوەشی ژنە دڵسـۆزەکەی، کـە نـاوی (بنیلـۆبی) بـوو. (ئۆدیسـیۆس) بەنـد کرابـوو، بۆماوەیـەکی زۆر، کاتێـك لـە قـەراخ دەریـای دەلیـا دادەنیشـتووە و بـە چـاوێکی پـڕ لـەگریان و خـەماوی سـەیری شـەپۆڵەکانی ئاوەکـەی دەکـرد. لـە تاوئازاری گیانی خۆشـی فرمێسـکی هەڵدەڕشـت بـۆ خانووەکـەی لـە (ئیناکـا) و، بـۆ (بنیلـۆبی) ژنـە خۆشەویستەکەی، ئەوەتا (ئۆدێسە) دەڵێ: ((ئای چەندە بەد بەختم ! خۆزگـە بـە نێـزەی یـەکێك لـە سەربازەکانی ترۆادە بکوژرامایە و ئەمەم بەچاوی خۆم نەدیبایە، کە وا بەم ڕەنگە تووشی بەندەیی و تەنیایی و مردنی سامناك و ناسۆرببم لەم ئاوارەییەدا...)).

بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە سەر ئەم سەرچاوەی خوارەوە:

هۆمیرۆس، (ئەلیادە و ئۆدێسە)، وەرگێڕانی بۆ زمانی کـوردی (شـاکر فـەتاح)، چـاپخانەی الحـوادث، بەغدا، ١٩٨٣.

بدۆزینەوە، ئەگەر کەسەکان ڕابردوویەکی جوان و پڕ لە سەرکەوتنیان هەبێت، بەردەوام لە حەسرەتی لە دەستدانی دەژین، ئەگەریش ڕابردوویەکی خراپ و دوور لەسەرکەوتنیان هەبووبێت، بەردەوام خەمی ڕابردوو دەخۆن و هەوڵی دابینکردنی داهاتویۆکی باشتر دەدەن.

لە بەرهەمە ئەدەبییەکانی کلاسیکی کوردیدا، نموونەی لەم شێوە زۆرن، کە حەسرەتی نووسەر و شاعیر لە بەرانبەر بابەتە جیاوازەکاندا دەخەنە ڕوو، لەم جۆرە بەرهەمانەدا شاعیر هەوڵدەدات خۆی لەو نیگەرانییە و دڵتەنگییەدا ڕزگار بکات، کە بەهەر شێوەیەك بێ، بۆی دروستبووە.

ئەگەر بۆ ڕابردووی ئەدەبی کوردی بگەڕێینەوە، واتە بۆ یەکەم بەرهەمی ئەدەبی کۆنی کوردی، یان سەرەتایی ئەدەبی کۆن و کلاسیکی کوردی، دەبێت ئاماژە بە بەرهەمەکانی **"بابا تاهیری هەمەدانی"** (٩٩٩ز—١٠٨٩ز) بکەین، بۆ نموونە: ناوەرۆکی شیعرەکانی **بابا تاهیری هەمەدانی**، بریتین لە: ((دڵداری نەستی و دڵداری هەستی و وەسفی سروشت و فەلسەفەی ژیان و مردن و شیعری سۆفیگەری و ئایینی و سەرگەردانی و غەریبی، خەم))[١٥١].

بۆ نموونە:

---

(١٥١) ئیبراهیم ئەحمەد شوان (د)، ئەدەبی کۆنی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠١٢، ل٢٨،٣٠،٣٣،٣٤،٣٦،٣٧.

**لە دەس چاو و لە دەس دڵ هەردوو فـــەریاد**

**کـە چـاو هـەرچـی ببینـێ دڵــێ دەکـا یـاد**

**دەکـەم مــن خەنجـەرێ نـووکـی لـــە پـــۆلاد**

**ئیـتر دەیـــدەم لـە چـــاوتـــا دڵ بـــێ ئـازاد(١٥٢)**

**غەریبی نــاخۆش کە دڵــگیرمــە**

**فەلەك هـــۆی مــلی بەزنجـیرمــە**

**فــەلـەك لە ملـما زنجیر دەرێنــە**

**کـــە خاکی غوربەت دامەن گیرمە(١٥٣)**

وەك ئـەم دەقانـەی بابـا تـاهیری هەمـەدانی پڕیـەتی لـە نیشـانەو خاسیەتی دیاری نۆستالژیا و خەم و دڵتەنگی و غوربەت و بـێ شـوێن ونیشتیمان و نامۆیی.

ئەگەر سەیری دوو چامەکەی "نالی و سالم" بکەین، دەبینین، کەوا سۆزی غوربەت و غەریبی نیشتیمان چۆن دڵ و دەروونی نـالی دەکـات بـە پارچـەیەك لـە ئـاگر و خۆڵەمێشـی دڵ و دەروونـی تـەواو شـام و کوردستان دەکاتە پارچەیەك لە گەردەلوول و چاو چاوی تێدا نابینێ. نالی لە غەریبی و غوربەت و دوورە وڵاتـی دا پـەنا دەباتـە بـەر (بـا) و

(١٥٢) دلزار(و)، گەنجینە، بەشێك لە چوارینەکانی بابەتاهیری هەمـەدانی، چـاپی دووەم، چـاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٨.

(١٥٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣.

دەیکاتە تەتەری خۆی، چونکە جگە لە "با" هیچ ڕێگا چارەیەکی دیکەی نییە، تاوەکو سکاڵای دەردی خۆی لا بکات و هەواڵی شار و وڵات و زێدی خۆی بزانێ. بۆیە بە "با" دەست پێ دەکات و دەڵێ:

**قوربانی تۆزی ڕێگاتم ئەی بادی خۆش مروور**

**ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور**

**ئەی لوتفەکەی خەفیی و هەوا خوا هو هەمدەمە**

**وەی سروەکەت بە شارەتی سەرگۆشەیی حوضور**(١٥٤)

**سەیرێ بکە لە بەردو لە داری مەحەڵلەکان**

**دەورێ بدە بە پرش و تەفتیش و خوار و ژوور**(١٥٥)

**داخۆ دەروونی سافە، گوڕەی ماوە (تانجەڕۆ)**

**داخۆ ئەسیری خاکە بە لێڵی دەکا عوبوور**(١٥٦)

تەواوی چامەکەی نالی (٤٣) بەیتە، (١٨) بەیتی بۆ ئەو شوێنانە تەرخان دەکات، کە دەیەوێ هەواڵی ڕاستەقینەی بزانێ، چونکە دووری ئەم شوێنانە ئاگری سۆزی شاعیریان خرۆشاندووە و کانیاوی هەست و دڵ و دەروونیان تەقاندووەتەوە. ئەو (١٨) بەیتەش (٧)ی

(١٥٤) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس و فاتح عبدولکەریم (دیوانی نالی)، پێداچوونەوەی: محەمەدی مەلا کەریم، چاپی یەکەم، کۆڕی زانیاری، بەغدا، ١٩٧٦، ل١٧٤–١٧٥.

(١٥٥) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس و فاتح عبدولکەریم (دیوانی نالی)، ل ١٨٤.

(١٥٦) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٨.

بۆ شوێنە جیاجیاکان و (١١)یشی، بۆ پرسیارکردن لە (خانەقا) کەی لە سلێمانی تایبەت کردووە.[١٥٧]

لە ئەدەبیاتی کۆنی کوردیدا و بەوەش، کە بە کلاسیزمی دا تێپەڕیووە دیارترین جۆری نۆستالژیا، نۆستالژیای ڕووحە لەناو دەقە عیرفانی و سۆفیگەریەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، وەك دەقەکانی "بابا تاهیری هەمەدانی، مەلای پەرێشان، جزیری، خانای قوبادی، فەقێ تەیران، خانی، مەولەوی، بێسارانی، نالی و سالم و مەحوی و حەمدی و حاجی قادری کۆیی و.....تاد.

یەکێك لە ناوەرۆکەکانی ئەدەبی کوردی بابەتی غوربەتی ڕووحە ئەم ناوەرۆکە بەرهەمی بەشێکی زۆری لە شاعیران و عاریفان داگیرکردووە، وەك ئەو شاعیرانەی لە سەرەوە ناومان هێنان.

غوربەتی ڕووح بەشێکی بە هۆی دوورکەوتنەوە لە ولاتی دایك دروست دەبێت، نیشتیمان واتایەکی تایبەتی هەیە، مەبەستی شوێنی پەروەردەو لە دایکبوون و زێدە، بەشێکی دیکەی بە دووربوون لە عیشقی حەقیقی و دووربوون لە خۆشەویستی خودا و نەگەیشتن بە زاتی خودا لەلایەن سۆفیەکان و شاعیرانی عیرفانی، کە هەمیشە خۆیان بە غەریب و تەنیا دەزانی لەم دنیایە سەراب و پێنج و

(١٥٧)حەمەسالح فەرهادی، سۆزی غەریبی و سێ چامەی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی، سیما، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٢٤.

دوورپۆژیە، هەڵوەدایی گەیشتن بە خودای تاك و تەنیا و فەنابوون لە خۆشەویستی خودا دان.

"میرچا ئیلیادە" ((لە باسکردن و لێکدانەوەی ئامۆژگارییە عیرفانییەکانی ولاّتە کۆنەکان و حەزی قووڵی ئەوان بۆ بەدەست هێنانی حاڵەتی ئازادی و بەختەوەری پێش لە ناوچوون و گەڕانەوە، لە بارەی مەسیحیەت

و عیرفانیان، سوود لە چەمکی"نۆستالژیا" وەردەگیرێت))[١٥٨].

بەلاّم دەبێت ئەوەش بزانین، کەوا جیاوازی بنچینەی لە نێوان خەم و دڵتەنگی بەدەست هاتوو لە نۆستالژیای غوربەتی شوێن و نۆستالژیای غوربەتی ڕووحی و سۆفیگەریدا هەی، بەو شێوەیە کە لە شیعری سۆفیگەری کوردی بە تایبەتی دڵتەنگی عاریفانە، دڵتەنگییەکە، کە عاریفان و شاعیرانی سۆفیگەری حەزیان لێیە و بەردەوام جۆرێك خۆشی و شادی تێدایە و دەگەنە ئەوپەڕی خۆشحاڵی، بەلاّم خەم و دڵتەنگی نۆستالژیا دەبێتە هۆی بێزاری و لەناوچوون و ئازاردانی ڕووح و بە جۆرێك بە نەخۆشی دادەنرێت، لەوانە وردە وردە، بێجگە لە ڕووح جەستەش تووش بکات، لەلای عیرفان و سۆفیگەری شاعیرانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی عەشقی حەقیقی و مەستی و بێئاگایی و توانەوە لە عیشقی خودا دیارترین وشە و دەستەواژەی، کە بەرانبەر عەقڵ دەوەستێت لەلای شاعیران،

---

(١٥٨) میرچا الیادە، اسطورة، رؤیا، رِاز، ترجمة: رؤیا منجم، تهران: فکر روز، ١٣٧٤، ص٦٥.

سۆفیەکان پێیانوایە، عەقڵ تاقی کردنەوەی خۆی کردووە و لە سەرانسەری مێژوودا بیانووی فەرمانڕەوایی و دین فرۆشی بووە، دنیاشی بەم ڕۆژە گەیاندووە. کەوایە دەبێ دڵ و دەروون و هەست، شوێنی وێنەی ئەوە بگرێتەوە، کە عەشقە. چونکە عەشقە توانایەکی زۆر و واتایەکی فراوانی هەیە و دۆزەرەوەی حەقیقەتی ڕاستییە.

عەشقی سۆفیگەری، عەشقی دووری لە مەعشوق، بنەڕەتیە، کە ڕێبوار بۆ گەیشتن بە تەواوی و داواکراوی ڕاستەقینە چەند هەنگاوێك دەبڕێت، لە شیعری سۆفیگەریدا عارف، یان عاشق واز لە هەموو شتێك دەهێنێت، تا بگاتە قۆناخی کۆتایی، شاعیر ئەم هەست گەیشتنە بە خودا بە زانست و ڕەمزی زانست دادەنێت. هەڵبەتە لە عیرفاندا شاعیر بە دوای عەشقی ئەبەدی و ڕاستەقینە دادەگەڕێت، کە خودا و جوانی خودایە، ئەگەر چی هەندێك پێیان وایە: ((عەشقی مەجازی پردێکە بۆ گەیشتن بە عەشقی حەقیقی...))[١٥٩].

شاعیرە گەورەکان هەریەکە و ناوێك و دەستەواژەیەك بۆ عەشقی حەقیقی و عەشقی ئیلاهی دادەنێت، بۆ نموونە: ((سهرب بە(دووچاربوو، تووشبوون) و (حەلاج) بە عەشقی گوتووە "نوێژ" نوێژێك، کە دەستنوێژی ئەو بە خوێنە "مەولانا" بە عەشق دەڵێ: (دەردی بێ دەوا))[١٦٠]، عاریفان پێیان وا بووە، مرۆڤ لە ڕێگەی

(١٥٩) ئیبراهیم ئەحمەد شوان (د)، ئەدەبی کۆنی کوردی، هەولێر، ٢٠١٢، ل٢٣٥.

(١٦٠) سیروس شمیسا، بیان، چاپ دوم، ویرایش سوم، چاپخانەی میترا، تهران، ١٣٨٦، ص١٥٠.

نەفس و جەستەوە تووشی نـەزانین و جەهالـەت دەبـن و بەمـەش لـە عەشقی حـەقیقی دووردەکەونـەوە، بـۆ نموونـە (ئـەلیادە) لـە کتێبـی (ئوسـتوورە، خـەیاڵ و ڕاز) ئامـاژەی پێـدەکان، دەڵـێ: ((مـەولانا لـە نێـوان عارفـە ئیسـلامیەکان، بـە جـوانی وێنـەی غوربـەتی ڕووحـی کێشـاوە. مـەولانا بـوونی ئـەم جیهانـەی بـە هـۆی نـەزانین و جـەهل دەزانی و دەڵێ: ستوونی ئـەم دنیایـە ناهۆشـیارییە ((نائاگـاهی))یـە، مەبەست لە ناهۆشیاری مەست بوونە لە چێژەکانی جەستە و نـەفس، کە دەبێتە هـۆی کـوێر بـوونی عـەقڵ و ئەسـیربوونی هەرچـی زیـاتری ڕووح دەبێت))[١٦١]، کەواتە باڵنـدەی ڕووحـی مـرۆڤ، کـە لـە قەفەسـی جەستە و دنیای جەستە ئەسیر بووە، ئەگەر لـە فیکـری ڕزگـارکردنی خۆی نەبێ، نیشانەی نەزانین و جەهلی ئەوە.

کەواتە: نۆستالژیا لە بەرهـەمی کلاسـیکیدا بـەو پـەڕی هۆشـیار و ئاگایەوە شاعیر پەنای بۆ دەبات، لە ڕاستیدا نۆستالژیا لە پەیوەنـدی کردن لەگەڵ بیرەوەری مێژووی و ئەفسانەکان واتـایی دەردەکـەوێت، هەموو ئەمانەش لەسـەر ((بنـەمایی هۆشـیارییە، مرۆڤـی بەحەسـرەت مرۆڤێکی هۆشیارە، تـەنیا بـە بەرچـاو گرتنـی ئـەم بنەمایـە، سـەیری

(١٦١) مهدی شریفیان(د)، بررسی فرایند نوستالژی در اشعار سـهراب سـپهری، مجلـه زبـان و ادبیـات فارسی، سال پنجم، ١٣٨٦، ص٥٥.

مەودای فراوانی ئەدەبی سۆفیگەری و حەماسی و لیریکی بکەین هات و هاوار و رووحی بەحەسرەت لە نێوان دێرەکاندا دەبیستین))[١٦٢]

ئەگەر چەند نموونەیەك لە شیعری کۆن و کلاسیزمی کوردی بخەینە ڕوو:

"بابا تاهیری هەمەدانی" لە شیعرە سۆفیگەریەکانیدا، هەست بە غوربەت و تەنیایی ڕووحی دەکرێت، کاتێك دەڵێ:

**لە یارەوەیە دەرد و دەرمانم**

**لە یارەوەیە وەصل و هیجرانم**

**قەساب گەر پێستم لە لەش داماڵێ**

**جیا ناکاتەوە لە یار (خودا) گیانم** [١٦٣]

"بابا تاهیر" بە ڕووح و بە جەستە غەریبە، غەریبی ڕووح خەرمانی نییە، هەرچییەك بکەی ناتوانیت، ئەم بۆشاییە ڕووحیە پڕ بکاتەوە و ناشتوانێ لای لێنەکاتەوە و بەسەریدا تێپەڕێ و فەرامۆشی بکات.

---

(١٦٢) نجمە نظری و فاطمة کولیوند، بررسی نوستالژی در شعر حمید مصدق، فصلنامە زبان و ادب فارسی، شمارە، ٤٦، زمستان، ١٣٨٩، ص٥٢.

(١٦٣) دڵزار(و)، گەنجینە، بەشێك لە چوارینەکانی بابەتاهیری هەمەدانی، چ٢، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧،ل٤٧.

لە نموونەیەکی دیکەدا "بابا تاهیر" دەڵێ:

**داری خەم لە گیانم ڕیشەی دەرکـــردووە**

**هەمیشە لـــە دەرگـــای خـــودا دەناڵێنم**

**خۆشەویستان ڕێـــزی یەکدی کە بزانـــن**

**ئەجەل وەکو بەردە و مرۆڤ وەکو شووشە[(١٦٤)].**

"مەحوی"ش ((پێی وایە پیاوی ڕاستەقینەی خوا لەسەر زەوی بە دەست ناکەوێ و ئـەوەی تـۆوی پیـاوەتی تێـدابێت، یـاوەکو حـەللاج لەسێدارە دراوە، یان زەنـوون ئاسـا خراوەتـە زیندانـەوە))[(١٦٥)]، واتـە مەحوی، دەڵێ: ئەگەر پیـاو هەشـبێت، ئـەوا ئـازار و ئەشـکەنجەدار و لەناو براوە و لێرەدا هەست بە سکاڵا و ناڕەزایی مەحوی دەکەین لـەو ڕۆژگاری ئەو تێیدا ژیاوە.

ئەوەتا دەڵێ:

**قاتی پیاوە لەسەر ئەم ئەرزە، دەبینی منصور**

**بەســەری دارەوە (ذالنون)ە، لــەبن زیندانـــا[(١٦٦)].**

(١٦٤) ئیبراهیم ئەحمەد شوان (د)، ئەدەبی کۆنی کوردی،ل٣٧.

(١٦٥) ئیبراهیم ئەحمەد شوان (د)، نامۆیی لە شعرەکانی مەحویدا، گوڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکان، ژمارە،٣٠، ٢٠٠٧، ل١٢.

(١٦٦) دیـوانی مـەحوی، مـەلا عەبدولکـەریمی مـودەڕیس و مەحەمـەدی مـەلا کـەریم، چـاپی دوەم، چاپخانەی ئۆفێستی حسام، بەغدا، ١٩٨٤، ل٣٤.

کەواتە ((سۆفی کە ڕێگای پاککردنەوەی دەروون دەگرێتە بەر، مەبەستی ئەوەیە لەو واقیعیە بترازێ کە لێی نامۆ بووە و دەیەوێ بگاتە جیهانێکی نموونەیی و پەیوەندی لەگەڵ خودا ببەستێت))[١٦٧]، چونکە سۆفی دەیەوێ لە جیهانی بالاّ نزیك ببێتەوە، دوای ئەوەی کە بەهۆی هەڵە و تاوانەکانی مرۆڤ لێی دوورخرابوویەوە. "د.ئیبراهیم ئەحمەد" لە کتێبی (مەحوینامە) گرینگترین دیاردەکانی نامۆیی و غوربەتی سۆفیگەری دیاریکردووە بەم شێوەیەی خوارەوە:

((١- نامۆیی زمانی سۆفیانە (ڕمز)

٢- نامۆیی سۆفی لەبارەی بێ ئاگایی و شەتەحەوە

٣- نامۆبوونی ناسینی سۆفیانە

٤- نامۆیی زەمانی سۆفی))[١٦٨].

بۆ نموونە مەحوی دەڵێ:

**بە جێماوم لەگەڵ من حەسرەتا، مەکسم لەسەر بایەك**

**بەجارێ هاژە بێنم، مەحویا - وەك دارەکەی سەرکەل**[١٦٩]

---

(١٦٧) ئیبراهیم ئەحمەد شوان (د)، مەحوینامە، چاپی دووەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠١٠، ل١٢٩.

(١٦٨) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٠-١٣١ .

(١٦٩) دیوانی مەحوی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس و محەمەدی مەلا کەریم، چاپی دووەم، چاپخانەی ئۆفێستی حسام، بەغدا، ١٩٨٤، ل٢١٠.

### ب) پەیوەندی نۆستالژیا بە ڕێبازی ڕۆمانسیزمەوە

ئەگەرچی سەرەتایی سەرهەڵدانی ڕۆمانسیەت لە وڵاتانی ئەوروپا، وەکو قوتابخانە و ڕێبازێکی هونەری و ئەدەبی جیاوازە، هەر وڵاتە و خاوەن پرانسیپ و خاسیەتی و تایبەتمەندی خۆیەتی، بۆ ئەم قوتابخانەیە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ڕێبازی ئەدەبی ڕۆمانسیزم لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم بە دواوە، وردە وردە هاتە ناو ئەدەبەوە، ئەم ڕێبازە سەرەتا لە ئینگلتەرا و ئەڵمانیا سەری هەڵداوە، دوایی لە فەرەنسا دوای ڕووخاندنی قەڵای قایمی ئەدەبی کلاسیکی لە سەر دەستی ئەو ئەدیب و فەیلەسووفانەی فەڕەنسی، وەك: "جان جاك ڕۆسۆ" و "ڤۆلتێر"، کە ئەم دووانە دەورێکی مەزنیان هەبوو، لە دامەزراندن و خستنە سەر پێی ئەدەبی ڕۆمانسیزمی، دواتر بە شێوەیەکی فراوان هەموو ئەوروپا و ئەمریکا و جیهانی گرتەوە.(١٧٠)

ڕۆمانسییەکان خۆیان پێڕانەدەگیرا لە بەرانبەر ئەو بارودۆخە ئاڵوزەی ناو کۆمەڵ و کۆمەڵگە، بۆیە تووشی ڕەشبینی و نائومیدی دەبوونەوە لە ژیاندا. ڕۆژ بە ڕۆژ خۆیان لە گێروگرفتی ناو کۆمەڵ دوورە دەخستنەوە، لە شەقەی باڵییاندەدا و بەرەو باوەشی خەیاڵ دەڕۆیشتن، دەیانویست مێژووی مرۆڤایەتی جارێکی دیکە، بگەڕێتەوە

(١٧٠) خورشید ڕەشید ئەحمەد، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی الجاحظ، بغداد، ١٩٨٩، ل ١٣.

دواوە، بۆ ئەو سەردەم و چەرخە کۆنانەی، کە "هۆمیرۆس" وەسفی کردوون، کە چۆن ((پاشایانی کۆن دەیانزانی ژمارەی مەڕ و ماڵاتەکانیان چەندە، بەدەستی خۆیان خۆراکی خۆیان دروستدەکرد))[171] کەواتە، ڕۆمانسیەکان هۆگری ژیانی مرۆڤە سەرەتاییەکانی ناو دەشت و چەنگەلەکان ببوون، بە لایەنەوە ئەو جۆرە ژیانە سادەیەی ئەوان وێنەی ڕاستەقینەی ژیانی سروشتە، بۆیە هەر لە سەدەی هەژدەهەم کۆمەڵێك حەکایەت و سەرگوزشتە، ئەم جۆرە باسانە بەسەر زاری ڕۆمانسیەکانەوە، دەسووڕایەوە و گرینگیان پێدەدا. شاعیران و نووسەرانی ئەدەبی ڕۆمانسی کەوتووبوونە گێژاوی ماتەمی و خەوبینی ترسناکەوە، بۆیە لە شەودا نیشانەی تاریکی و ڕەشبینی و ئازار و ئەشکەنجەیان بەدی دەکرد، بەمەش دەکەوتنە جیهانێکی خەیاڵی پڕ لە سۆز و ئەندێشەوە، بدەم ئەم خەون و خەیاڵەوە دەگەڕانەوە، بۆ ((سەدەکانی پێشوو، دەیانویست هەست و خۆشی ڕابردوو جارێکی دیکە زیندوو بکەنەوە))[172]. ڕۆمانسییەکان گرینگی زۆریان بە خەیاڵ دەدا، چونکە واقیعیان ڕەتدەکردەوە، چونکە لە خەیاڵدا ((چەندین جیهانی جوان و هێمن دەکێشێت، کە هاوکاری و دادپەروەری و بەرقەراری و

(171) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣.

(172) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧.

ئـارامی هەیـە، ئـەم بەهایانـە لـە ڕاسـتەقینە، یـان واقیعیـدا بـەدی ناکرێت))[١٧٣].

ڕۆمانسییەکان لە سروشتدا دڵیان بە دیمەنە کۆنەکان دەکرایـەوە، وەك کلێسـە کۆنـە خامۆشـەکان و کۆشـکە کۆنـە بـە جـێ ماوەکـانی سـەدە کۆنـەکان، هـەروەها دەگریـان بـە سـەر کـەلاوە و شـوێنەوارە ڕووخاوەکانـدا، کـە یـادی پیـاوە مـەزن و نـەمرەکانی سـەدەکانی پێشووی دەهێنایەوە یادیان، ئەمەش پەیوەندی هەبوو، بە نیشتیمان پەروەرییەوە، بۆیەش لە شیعرەکانیادا ستایشی باوباپیرانیان دەکرد. سەیرکردنی ئەم کۆشك و کلێسە کۆنانـە، دەبـووە، هـۆی گێڕانـەوەی سەر گوزەشتەی ئەفسانەیی، یادی ڕابردوویان دەکـردەوە و پشـتیان بە مێـژووی دێـرین دەبەسـت، وەکـو بەرهەمـەکانی ((والـتر سـکوت و شاتوبریان لە ئینگلترا، ڤیکتۆر هۆگۆ و میشـلیە لـە فەرەنسـا))[١٧٤] و کۆمەڵێك شاعیر و نووسەری دیکەی جیهان، کەواتە یەکێك لە هۆکـارە سـەرەکییەکانی سـەرهەڵدانی ڕۆمانسـیەت ((هەسـتی نەتەوەیی))[١٧٥]بوو، دوایی شۆڕشی فەڕەنسی لە ساڵی (١٧٩٩)، واتە دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی.

(١٧٣) هیمداد حوسێن(د)، ڕێبازە ئەدەبییەکان، چاپخانەی دەزگای ئاراس، چاپی یەکـەم، هـەولێر، ٢٠٠٧، ل ٩١.

(١٧٤) خورشید ڕەشید ئەحمەد، ڕێبازی رۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا، ل ٤٦.

(١٧٥) هیمداد حوسێن، ڕێبازە ئەدەبیەکان، ل ٨٠.

ڕۆمانسییەت پەیوەندیەکی قووڵی لەگەڵ ئایینذا هەیە، بە تایبەتی ئایینی مەسیحیەت، چونکە چ ڕۆمانسیزم، چ ئایینی دەستکاریکراوی مەسیحی زۆر گرینگی بە دڵ و سۆز و هەست دەدەن لەوەی بە عەقڵ، "رینیە ولێك" دەڵێ: ((گەورەیی و مەزنی ڕۆمانسیەت لەوەدا دەرکەوتەوە، کە دەرکی بەو لێکچوونە قووڵەی نێوان ڕەوشتەکانی شیعر و ڕەوشتی دۆزینەوە و داهێنانەکانی ئایینی کردووە))[176] ئەم دەرك پێکردنە و هەستکردن بەو لەیەکچوونەوەی بابەتی شیعر و ئایین، کە هەردووکیان دژی ژیرین و عەقڵ دەخەنە لاوە، پەنادەبەنە بەر ئامراز و سەرچاوەی دیکە، کە بریتی بووە، لەجۆرە دید و بۆچوون و ڕوانگەیەك لەوێوە چارەسەری سەرگەردانی مرۆڤی گیرۆدەی دەستی کات و زەمەن و بێزاری دەکەن، کە هەریەکە و بە شێوەیەکی تایبەت بەخۆی بەدی دەکات.

"د.حەمید عەزیز" دەڵێ: ((وشەی ڕۆمانسیەت لە ناوەرۆك و ڕوخساردا چەمك و بۆچوونی هەستکردن بە سروشت و ئایین بەو جۆرەی خۆیان تێی گەیشتوون و ویستوویانە))[177]، ئەگەر سەیری هەموو ئەو بابەت و بنەما و کێشە و گرفتانەی ڕۆمانسیەت خۆی بە میراتگری دەزانێ بکەین، لە ڕاستیدا بنەما و روئیای نۆستالژیان،

---

(١٧٦) حەمید عەزیز(د)، فەلسەفەی سەردەمی ڕۆمانتیکی، چاپخانەی موکریان، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٥٥.

(١٧٧) سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥.

چـــونکە نۆســـتالژیا بابەتێکـــە خـــۆی لـــەناودڵ و دەروونـــی تـــاك دەدۆزێتەوە، هەمیشە خەم و حەسرەت و داخـی تاکـە، بەرانبـەر بـە ناڕازیبوون و ڕاکـردن لـە واقیعـی ژیـان و کۆمەڵگـە، ئەمـە جگـە لـەم پەیوەندییـە ڕووحییـەی، کـە مـرۆڤ بـە شـوێن و ئەبەدیـەتی و خـودا پەرستیەوە هەیەتی، کە زیاتر بەرهەمی سۆفیزم دەگرێتەوە، ئەمەش بابەتی سەرەکی ڕۆمانسیەتە، چونکە پەیوەستە بە ڕووحی مرۆڤەوە، لـە کاتێکـدا غوربـەتی ڕووح بابـەتێکی دیـار و خاسـیەتێکی بەرچـاوی نۆستالژیایە، کە لـە لای شـاعیرانی ئـەورووپی و کوردیشـدا نموونـەیان زۆرە. هەروەکو "فریـدریك شـلێگل" دەڵـێ: ((مەسـیحیترین نووسـەر ڕۆمانسیترین نووسەرە))[178]، کەواتە ڕۆمانسیەت بابەتێکی ڕووحیـە، هەروەکو چۆن نۆستالژیاش بابەتێکی سۆز و هەست و دەروونی تاك و ڕووحی مرۆڤە، چونکە لەم قوتابخانە ئەدەبیە بنەماگـەلێك هـەن، کـە لەگەڵ بابەتی نۆستالژیا هاوبەشن، بۆ نموونە، بنەماکانی ((ڕاکـردن و گەڕانەوە))[179] و ((بێزار بوون لە کات و شوێنی ژیان و ڕاکردن بەرەو شوێن و کاتێکی دیکە))[180] و ((سەفەری مێژووی و سەفەری واقیعـی

(١٧٨) فەرهاد پیربال(د)، ڕێبازە ئەدەبییەکان، چاپخانەی دەزگـای ئـاراس، چـاپی یەکـەم، ٢٠٠٤،ل ٧٨.

(١٧٩) ڕەزا سەید حوسێنی، قوتابخانە ئەدەبییەکان، وەرگێرانی حەمە کەریم عارف، چاپی یەکـەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٦١.

(١٨٠) ڕەزا سەید حوسێنی، قوتابخانە ئەدەبییەکان، وەرگێرانی حەمە کەریم عارف ، ل ٦١.

و سەفەری جوگرافی))[181] و ((سەفەر بە باڵی خەیاڵ خەسڵەت و تایبەتمەندیەکی دیکەی بەرهەمی ڕۆمانسیە))[182]ڕۆمانسییەکان ئارەزووی دۆزینەوەی شوێنێکی جوان و ڕازاوە دەکەن لە شیعرەکانیاندا، ڕۆمانسیزمەکان بە زۆری دیاردەگەلێکی، وەك: ((سەوزی بەهار، گەڵای زەردی پایز و ئاوازی خۆشی بەرەبەیانی و ئاوازی غەمگینی ڕۆژئاوا بوون))[183] لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین: سنووری هاوبەشی نێوان ڕۆمانسیزم و نۆستالژیا بریتییە لە ڕەتکردنەوەی بارودۆخ و ناڕازی بوون لە بارودۆخی هەنووکەیی. بە پێی بینینی ڕۆمانسیزم سەیرکردنی ئامانجەکانی بەرانبەر، دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە، لە ناڕەزایەتییە هەنووکەییەکان و لەژێر تیشکی هەستی نۆستالژی بەبیرهێنانەوەی بیرەوەرییەکانی ڕابردوو، دەبێتە هۆی ئەو دوور کەوتنەوەیە، جا لەوانەیە بیرەوەرییەکە گشتی بێ، یان تاکەکەسی.

"وۆردزوۆس wordsworth"(١٧٧٠-١٨٥٠) و "کۆلدریج Coleridge"(١٧٧٢-١٨٣٤) و "تۆماس مۆر" "بایرۆن Geovge Byron" (١٧٨٨-١٨٢٤) و " شیللی Perey Shelley" و کیتس ١٧٩٥-١٨٢٢، ئەوانە شاعیرە گەورەکانی ڕۆمانسیزمن بۆ

---

(١٨١) سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١.

(١٨٢) سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١.

(١٨٣) رضا سید حسینی، مکتبهای ادبی، جلد اول، چاپ دوازدهم، تهران، ١٣٨١، ص ١٨٣.

شیعرەکانیان شوێن گەلێکیان هەڵدەبژارد پڕ لە ڕاز و سڕ و دوور، ڕابردوویەکی کۆن. لە سەفەرە واقیعییەکانیش ((ڕۆمانسییەکان وەکو، (مرسە) سەفەری ئیتالیا، (مریمە) سەفەری ئیسپانیا، (ئەلکساندەر دوپا) سەفەری ئیتالیا و ئیسپانیا و (تیوفل گوتیە) بۆ ئیسپانیا و ڕۆژهەڵات و رووسیا و ئیتالیا (شاتۆبریان) و (لامارتین) و (نیرڤان).....تاد، سەفەری ڕۆژهەڵاتیان کردووە))[١٨٤]. بیرەوەری ئەم سەفەرانەش لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە.

ڕۆمانسییەکان لە سەفەرە خەیاڵیەکانیدا ((بە هیوای دۆزینەوەی ناوچەیەکی جوان و ڕازاوە و بەگشتی ئەو جوانیانەی، کە هونەرمەندی ڕۆمانسی حەزی لێیەتی، ئەم نۆستالژیایە لە ((بەهەشتی ونبوو)) بە گشتی لە شێوەی گەڕان بە دوای شتێکی ونبوو و لەدەستچوو دەردەکەوێت))[١٨٥] لەخاڵە هاوبەشە لێکچووەکانی نۆستالژیا و ڕێبازی ڕۆمانسیزم، دەبێ ئاماژە بە ((گەڕانەوە بۆ ڕابردوو))[١٨٦] و ((بۆ مێژووی نەتەوەیی))[١٨٧] و ((گەڕانەوە بۆ

(١٨٤) ڕەزا سەید حوسێنی، قوتابخانە ئەدەبییەکان، وەرگێڕانی حەمە کەریم عارف، ل ٦١.

(١٨٥) سەیر و لووی میشل، رومانتیسم و تفکر اجتماعی، مجلەی ارغنون، شمارە ٢، تهران، ١٣٨٣، انتشارات سازمان، ل ١٣٢.

(١٨٦) ئیدریس عەبدوڵڵا(د)، قۆناخی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری کوردی، چ(١)، چاپخانەی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری هەولێر، ٢٠٠٦، ل٧٢–٧٥.

(١٨٧) سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٢–٧٥.

سروشت))[١٨٨] و ((پەنا بردنە بەر خەون و گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی...))[١٨٩]بکرێت. "ڕۆسۆ" بە ڕابەر و پێشەوای ئەدەبی فەرەنسی و قوتابخانەی ڕۆمانسیزم دادەنرێت، دەیگوت:((سروشت پاکترین مەڵبەندە، کە ئادەمیزاد دەتوانێ تێیدا بە ئاسوودەیی بژیت، دوور لە ئاڵۆزی و گرفتی شار))[١٩٠] و ((نەخۆشی سەردەم))[١٩١]، هەندێك پێیان وابوو، کەوا ڕۆمانسیەت نەخۆشییەکی سەردەمە، بەتایبەتی دوای شکستەکەی "ناپلیۆن" خەم و حەسرەت و نیگەرانی ڕووی لە ڕۆشنبیر و فەیلەسووف و ئەدەبیاتکرد، نۆستالژیاش سەرەتا، وەك نەخۆشییەکی سەردەم ناسراوە. ڕۆمانسیزم هەمیشە گرینگی بە ((هێنانەوەی ئارەزووەکان دەدات، بۆیە گەلێك شێوەی جیاوازی وەرگرت. وەك داستانی شوانکاری و نامۆیی و چەفەنگیەت و خەون و منداڵی و خۆشەویستی بەهێز و تەواو و.....تاد))[١٩٢].

زۆر لە بۆچوون و زاناکان و لێکۆڵەرەکان "ڕۆسۆ" بە هێما و سەرەتایی ڕێبازی ڕۆمانسیزم دادەنێن لە ئەدەبدا، چونکە ((گرینگی دان بە سروشت، دوورکەوتنەوە لە کۆمەڵ و دام و دەزگاکانی، ڕۆڵی

(١٨٨) سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٢-٧٥.

(١٨٩) سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٢-٧٥.

(١٩٠) خورشید ڕەشید ئەحمەد، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا، ل ٤٢.

(١٩١) هیمداد حوسێن، ڕێبازە ئەدەبیەکان، ل ٨٦.

(١٩٢) ڕزگار عومەر فەتاح، ڕۆمانسیزم لە شیعری (هێمن و محەمەدی نووری) دا، نامەی ماستەر، زانکۆی کۆیە، کۆلیژی زمان، بەشی کوردی، ٢٠٠٨، ل١٢.

جــەماوەر و ســۆز و خۆشەویســتی و خولیــای جــوانی و دڵڕفێنــی سروشت، هەڵچـوون و حـەز و ئارەزووەکـانی مـرۆڤ بـۆ گەڕانـەوە، بـۆ گوند و باوەشی سروشت))[١٩٣] سەرتاپای بەرهەمەکانی "ڕۆسـۆ"یـان داگیر کردووە، نەك تەنیا لە بەرهـەمی "ئیمیـل"ی و، دانپێـدانان. بـە پێی بیر و بۆ چـوونی ڕۆمانسـیەکان ((بـە هـاتنی ژیـانی تەکنـەلۆژی، مرۆڤ ئارامی و ئاسوودەی رووحی و ژیـانی سـادەی گونـد و یـەکبوون لەگەڵ سروشتی لەدەستدراوە، بۆیە حەز لە ڕاکردن دەکـات، ڕاکـردن بۆ شوێنێکی نادیار، بۆ خەیاڵ، بۆ گەڕانەوە بۆ باوەشی سروشت، بـۆ ژیانێکی ئازاد و دوور لە غەم و خەفەت و ژان))[١٩٤].

لەلای ڕۆمانسییەکان پەنا بردن بۆ سروشت بۆ ئەوە نییە، کەوا لە بێ دەسەڵاتی و پڕکردنەوەی کەم و کوری بەرهەمەکانیان بێ، بـەڵکو پێیان وایە سروشت کەم و کوری تێدایە، تاوەکو ئەوان ئەم کـەلێن و کەم و کوریانەی سروشت تەواو بکەن و پڕی بکەنەوە.

گەڕانــەوە بــۆ سروشــت و ڕاکــردن لــە واقیعــی حــاڵ بابــەت و خاســیەتێکی دیــاری نۆســتالژیایە لــەناو قوتابخانــەی ڕۆمانســیەت، بووەتە بناخە و بنەمای دروستبوونی ئەم قوتابخانەیـە. لـە سـەفەری

---

(١٩٣) کەریم شەریف قەرەچەتانی(د)، سروشتی مرۆڤایەتی لە ڕوانگەی جان جاك ڕۆسۆ و سیگمۆند فرۆیدەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣، ل ٦١–٦٢.

(١٩٤) سـەیر و لـووی میشـل، رومانتیسـم و تفکـر اجتمـاعی، مجلـەی ارغنـون، شمـارە ٢، تهـران، ١٣٨٣،انتشارات سازمان، ل ١٣٢.

مێژووی شاعیر و نووسەر، ڕووحی خۆی بەرەو سەدەکانی پڕ لە هەست و پڕ لە شکۆی سەدەکانی ناوەڕاست و ڕێنسانس دەخزێنێ، کە بە ڕای "فریدریش شێلگل Sehlege" ((دەوری پاڵەوانان و عیشق و ئەفسانەی پەرییان و ئەفراندن دیاری بەناو ڕۆمانسیزم بوون))[195]، کە بەرهەمی ڕۆمانسیزمەکانی داپۆشیوە. لەم پێناسە و نموونەی توێژەر و شاعیر و نووسەرانی ڕۆمانسیزم کە خستمانەڕوو، بۆمان ڕوون و ئاشکرایە پەیوەندیەکی زەق و بەرچاو لە نێوان ڕۆمانسیزم و نۆستالژیادا هەیە، لەبەر ئەوەی نیشانە و خاسیەتەکانی نۆستالژیاش، بریتین لە ڕاکردن لە واقیع و گەڕانەوە بۆ سروشت و ڕابردووی منداڵی و گەنجی و خەم و حەسرەت لە دەست پیری و تەمەن و مووی سپی و گەڵای پایز و خۆشەویستی و یادەوەری نێوان ئازیزان و بەئاکام نەگەیشتنی دڵبەر و دڵدار و غوربەت و ڕەشبینی و تاراوگە و گەشت و گەڕان دروستکردنی شاری نموونەیی و خەون و خەیاڵی داهاتوویەکی پڕشەنگدار و هێنانەوەی حەز و ئارەزووەکان و.....تاد.

یەکێکی دیکە، لە بنەمەکانی نۆستالژیا لە ڕێبازی ڕۆمانسیزم، ئەوەیە ((نۆستالژیای دووری لە بەهەشت و رووحی ئەزەلییە))[196] لەم حاڵەتەدا شاعیر هەست دەکات لە ئەسل و فەسڵی خۆی دوور

(١٩٥) منصور ثروت، آشنایی با مکتب های ادبی، چاپ اول، تهران، سخن، ١٣٨٥، ص ٧٧.

(١٩٦) سەیر و لووی میشل، رومانتیسم و تفکر اجتماعی، مجلەی ارغنون، شمارە (٢)، ص ١٣١.

کەوتووەتـــەوە، وەك دوور خراوێـــك لـــەم غەریبســـتانە دەژێـــت، لـــەم بارەیەوە "شێلگل Sehlege" شاعیری ڕۆمانسی دەڵـێ: ((رووح لـە ژێر بەندی گریان دوور خراوە، رووح کە شوێنێکی مەعنەوییـە لـە لای مـرۆڤ، بێجگـە لـە مـاڵی باوکـە ڕاسـتەقینەکەی لـەم ماڵـەش "رووح" دەژێت))[197] کەواتـە نۆسـتالژیا بێجگـە لـە گەڕانـەوە بـۆ سروشـت و ڕابردوو، ئاوات خواسـتنە بـە داهـاتوو، لـە ڕێگـەی خـەون و خـەیاڵ و فڕین بەسەر باڵی خەیاڵەوە، بە واتایـەکی دیکـە، نۆسـتالژیا دەیـەوێ داهـاتووش لـە سـەر حیسـابی ڕابـردوو بنیـاد بنێـدرێت، هـەروەها نۆستالژیا گەڕانەوە، بۆ ڕووح و غوربـەتی ڕووح بـە بەشـێك لـە مـاڵ و جێگایەکی ئارام و ئاسوودە دەزانێ بۆ مرۆڤ، ئەگەر سەیری بەرهەمـە ئایینی و سۆفیگەریەکانی شاعیر بکـەین، بـە شـاعیرانی کوردیشـەوە، ئەوا هەست بەو غوربەت و گۆشەگیری ناڕەزایەتی شـاعیران دەکـەین، کە بابەتی نۆستالژیا و لە هەمان کاتیشدا ڕۆمانسیزم گرینگی پێداوە، چونکە ڕۆمانسیەت و مەسیحیەت دووڕووی یەك دراون، وەکـو ئـەوەی "شـــاتۆ بریـــان" دەیگـــوت: ((مەســـیحیەت شـــاعیریانەترین دیـــن بووە))[198].

ڕێبـازی ڕۆمانسـیزم گرینگیـەکی زیـاتری بـە نۆسـتالژیا و بابـەتی نۆستالژی داوە، چونکە ڕۆمانسییەکان تەنیا بـەوە ناوەسـتن، کـە بـۆ

---

(١٩٧) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣١.

(١٩٨) فەرهاد پیربال(د)، ڕێبازە ئەدەبییەکان، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٧٨.

ڕابردوو بگەڕێنەوە، بەڵکو وەك ئەرك و پێویستییەکی هونەری و ژیان سەیری دەکەن، لەبەر ئەوەی ئەرك و ئامانجی هەر کەسێکە بگات بە ڕابردوو، ئەوەتا "لۆکاچ Lokag" دەڵێ: ((سەدەی زێرینی ڕۆمانسییەکان نەك تەنیا پەیوەندی بە ڕابردووەوە هەیە، بەڵکو ئامانجیش هەر ئەوەیە و ئەرکی هەر کەسێکیشە بەوە بگات))(١٩٩).

نۆستالژیا بە پێی ڕێبازی ڕۆمانسیزم تەنیا گەڕانەوە نییە بۆ ڕابردوو، بەڵکو هەندێکجار شاعیر بە سواری باڵی خەیاڵ، ئارەزوو، ئاواتێکی جوان و سەرنجڕاکێش بۆ داهاتوو دەخوازێ، کە لەم حاڵەتەدا بەم جۆرە نۆستالژیا دەگوترێ ((نۆستالژیای نموونەیی))(٢٠٠)، کەسی تووشبوو بە حاڵەتی نۆستالژیا پەنا بۆ خەیاڵ و خەون و کۆمەڵێك هیوا و ئاوات دەبات، بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات لەم حاڵەتەدا "گیسفیر ١٧٨٨-١٨٣٠" دەڵێ: ((ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر سەرەنج ڕاکێشە، عەشقە بەرانبەر سروشت و ژیانی شوانکارەیی و ئارەزووی خۆشبەختی و بە ئاکام گەیشتن و گەڕان بە دوای جوانی لەم ژیانە سادە و شوانکارییەدا))(٢٠١)یە.

---

(١٩٩) سەیر و لووی میشل، رومانتیسم و تفکر اجتماعی، مجلەی ارغنون، شمارە (٢)، ص ١٣٣.

(٢٠٠) خلیل پروینی (د) و سجاد اسماعیل، بررسی تطبیقی نوستالژی در شعر احمد عبدالمحیط و نادر نادر پوور، ٢٠١١، ص ٤٥.

(٢٠١) ڕەزا سەید حوسێنی، قوتابخانە ئەدەبییەکان، وەرگێڕانی حەمە کەریم عارف، ل ٥٢.

نۆستالژیاش بابەتی عەشق و خۆشەویستیە بابەتی ژیان و مردنـە، بابەتی دابڕان و بێ هیوای و ئاوات و حەزی داهاتووی جوانە.....تـاد، کەواتە، نۆستالژیا کۆ کردنەوەی دژەکانـە، وەك: نیشـتیمان و دووری لە نیشتیمان، یان ڕابردوو و داهـاتوو، خـەون و ڕاسـتی، واقیـع و دژە واقیــع.....تــاد، ئەمانــەش هــەموویان بــاس و بابــەتی بەرهــەمی ڕۆمانسین.

ئەگەر سەیری ئەدەبی ڕۆمانسیزمی کوردی بکەین، ئەوا هـەروەکو زۆربـەی وڵاتـانی دیکـەی ئـەورووپا ڕۆمانسـیەت بـەر لـەوەی، وەکـو قوتابخانە و ڕێبازێکی ئەدەبی بێتـە نـاو ئـەدەبیاتی کوردیـەوە، ئـەوا وەك بەرهەم و دیاردەیەکی زەق لەناو ئـەدەب و بەرهـەمی شـاعیرانی کورددا هەبووە، وەك بەرهەمەکانی "مەولـەوی و بێسـارانی، ئەحمـەد بەگی کۆماسی.....تاد، تەنانەت لە ئەدەبی کلاسیکی، وەك: (نـالی و سـالم و کـوردی)یـش، بەرچـاو دەکـەوێت، بـەڵام وەکـو قوتابخانـە و ڕێبـازی ئـەدەبی لـە بەرهەمـەکانی: (پیرەمێـرد و شـێخ نـووری شـێخ سـاڵح و گـۆران و هـەردی و هـێمن و دیـلان) و.....تـاد، بـەدی کـرا، ئـەمانیش لـە ژێـر کاریگـەری ئـەدەبی تـورکی بـووە، وەك ((ئودبـای فەجری ئاتی) هەندێ نووسەری بـەتوانای وەکـو: (تۆفیـق فیکـرەت و نامق کمال، و جلال سامیر و عبدالحەق حام و.....تاد))[٢٠٢]. بەرهەمی ئەو شاعیرانەی ناومان هێنان زیاتر ناسـراو قووڵبوونەتـەوە بەرهـەمی

(٢٠٢) هیمداد حوسێن، ڕێبازە ئەدەبیەکان، ل ١٠٩.

ئـەم شـاعیرانە پارچـەیەك لـە نۆسـتالژیا و دەقـی داهێنـراوی بـەرزی ڕۆمانسین بۆ نموونە، لە شیعری (بۆ هیوای کورِم)ی (گـۆران)دا، یـان شیعری "تـانگۆی کـوردی" و (دڵێکـی تێـك شـکاو) و (بـێ ئـارامی) و (شانزدە سـاڵ چـاوەڕوانی)ی "ئەحمـەد هـەردی" شـاعیر لـە دیـوانی (ڕازی تەنیایی)دا.(ناڵەی جودایی) ی "هـێمن" و (سـێبەری پـەرت)ی "دیـلان" و سـەدان نموونـەی دیکـە، لـە ئـەدەبی کـوردی بەڵگـە و سەلماندنی ئەدەبی نۆستالژی و خەم و حەسـرەت و تـاڵی و شـیرینی شاعیرانی لەخۆ گرتووە، لەگەڵ خەمی بێ وڵاتی و نەبوونی ناسنامەی نەتەوەیی و غەریبی و غوربەتی تاکی کورد لە ژیاندا، چونکە کورد لـە هەنـدێ مـاوەی مێژووییـدا بووەتـە قوربـانی دەسـتی سیاسـەتی بەڕێوەبردنی حوکمرانـانی وڵاتەکـەمان، ئەمـە جگـە لـە خـۆ خـۆری و ناتەبایی ناو ماڵی کورد، هێندەی دیکە، ناوچەی کوردستانی کردووە، بە نامۆ و نائارامی و هەست بە غەریبی و نائارامی تاکی کورد تێیدا بە تایبـەتی ڕۆشـنبیران و ئـەدیب و نووسـەران، ئەمـەش لـە بەرهەمەکانیانیـدا ڕەنگـی داوەتـەوە. ئـەوەتا دەگـوترێ: ((لـە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، تاوەکو ڕاپـەرینی "١٩٩١"، نـاکۆکی و ململانێیەکی گەورە لە نێوان گـەلی کـورد و داگیرکـەران هـەبوو، بۆیـە سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگەکەمان لە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی

دڑواردا بــوون، تەنانــەت وجــودی نەتەوایــەتیمان و زمــان و خــاك و مێژووشمان لەبەردەم دووڕیانێکی بوون و نەبووندا بوو))[٢٠٣].

ئەمــە هــەموو بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی، دیــاردەی نۆســتالژیا لــە ئەدەبی کوردیدا، دیاردەیەکە، ناکرێ بە ئاسانی بەسەریدا تێپەڕببین، چــونکە واقیعێکــی بەرچــاوی ئــەدەبی کوردیــە، بــە هــەموو ژانــر و ڕەگەزەکانیەوە، بۆیە ناکرێ ڕۆمانسیزم و ئەدەبی کوردی بە تەنیا لە یــەك گۆشــەنیگا و یــەك تــەئویل و لــە ژێــر تیشــکی یــەك ڕێبــاز و قوتابخانــەی ڕەخنــەیی و ئــەدەبی بەرتەســك بکەینــەوە، چــونکە بەئاسانی پێمان ڕاو ناکرێت و بە ئەنجام ناگەین.

(٢٠٣) ئەرسەلان بایز(د)، سیمای شیعری کوردی دوای ڕاپــەرین، نامــەی دکتــۆرا، زانکــۆی ســلێمانی، کولێژی زمان، بەشی کوردی، ٢٠٠٣، ل ٣٣.

### پ) پەیوەندی نۆستالژیا بە ڕێبازی ڕیالیزمەوە

ڕیالیزم یەکێکە لە ڕێبازە ئەدەبییەکان و دوای ڕێبازی ڕۆمانسیزم دێت، واتە شۆڕشێك و کودەتایەکی ئەدەبی بوو بەسەر ڕێبازی ڕۆمانسیزمدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك پێیان وایە، ڕیالیزم تەواوکەر و بەردەوام بوونی ڕێبازی ڕۆمانسیزمە، بۆیە دەگوترێت: ((ڕیالیزم بەردەوامبوونی ڕۆمانسیزم بوو لە ڕووی بایەخدانی بە ئازادییەکانی تاکەکەسی و ڕووبەڕووبوونەوە لە واقیع، تەنانەت ئەم بەردەوامبوونە لە ئاست و بوارەکانی دیکەشدا دەبینرێت، بۆ نموونە: ڕۆمانسیزمی ڕووسی خۆی لە خۆیدا شێوەیەکی ڕیالیزمی هەبوو، بە تایبەتی لای پووشکین ئەمە دەردەکەوێ))[(٢٠٤)]، کەواتە: هیچ ڕێباز و قوتابخانەیەك، ناتوانێ بە تەواوی هەموو سیما و نیشانەکانی ڕێبازێکی پێشخۆی بسڕێتەوە و لەناوی ببات، وەك لە پێشتر ئاماژەمان پێکردووە، یەکێك لە خاڵە گرینگەکان، یان جۆرەکانی نۆستالژیا، گەڕانەوەیە بۆ سروشت و ڕاکردنە لە واقیعی حاڵ و ئێستایی بێزاری، بە هەمان شێوەش ڕیالیزم، ڕیالیزمی سروشتی، گەڕانەوەیە بۆ سروشت و پێکهاتەکانی ناو سروشت، چونکە ((ڕیالیزمەکان کاتێك دەگەڕانەوە، بۆ سروشت و باسی سروشتیان دەکرد لەبەر جوانییەکەی نەبوو، بەڵکو ئەو وێنەیە دەکێشێ، کە

(٢٠٤) فەرهاد پیربال (د)، ڕێبازە ئەدەبیەکان، ل ٨٦.

هەستی پێ دەکات، بەڵام لەبەر جوانییەکەی نا، بەڵکو لەبەر حەقیقەتەکەی، جا جوان بێت، یان ناشیرین))[٢٠٥].

نووسەرانی ئەدەبی ڕیالیستی هەوڵیان دەدا واقیعێکی دیکە لەناو ئەم واقیعەدا دروست بکەن، بەڵام بەسوود وەرگرتن لە واقیعدا، نەك گواستنەوەی پێکهاتەکانی ناو واقیع، وەك گرتەیەکی کۆپی کراو، وەکو خۆی، بۆیە دەگووترێ: ((نووسەرانی ڕاستگۆ، واقیع وەك خۆی نیشان نادات، دێت بە هۆشیارییەوە، ئەم جیهانە نوێیە وێنە دەکێشێت، کە خەونی پێوە دەبینیێ))[٢٠٦]، ڕیالیزم پەیوەندیەکی قووڵ و دانەبڕاوی بە کۆمەڵ و کۆمەڵگەوە هەیە بەو پێیەی نووسەر تاکێکی ئەم کۆمەڵگەیەو بەشێکە لێی بۆیە ڕەخنەی ئەدەبی ((پەیوەندی لە نێوان کۆمەڵ و کاری ئەدەبیدا دروست دەکات و وەسفی دەکات، هەر چەندە کۆمەڵ لە بەرهەمی ئەدەبی کۆنترە، بۆیە نووسەر بە کۆمەڵ پەیوەستە و ڕەنگدانەوەی حاڵەتەکانییەتی و گوزارشتی لێدەکات و هەوڵی گۆڕانی دەدات، چونکە کۆمەڵ لە بەرهەمی ئەدەبیدا ئامادەیی هەیە...))[٢٠٧]، کەوایە نووسەر و خەم و ژانی نووسەر و ئێش و ئازارەکانی ئەگەرچی خودی و تاکەکەسین،

---

(٢٠٥) سەرچاوەی پێشوو، ل١٠١.

(٢٠٦) حەمە سەعید حەسەن، شیعر و شمشێر(لێکۆڵینەوەی ئەدەبی )، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکراوەی، ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ١١٩.

(٢٠٧) جان أيف تادیية، ألنقد الأدبي في القرن العشرين، ترجمة، د. قاسم المقداد، منشورات وزارة الثقافة، المعهد العالى للفنون المسرحية، دمشق، سوريا، ١٩٩٣، ص٢٢٥.

بەڵام بەشێکن لە خەم و ژان و ئازاری گشتی و کۆمەڵ، چونکە شاعیر تاکێکە لە تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە.

تراژیـدیا بەشـێکی دیکـەی ڕیالیسـتەکانە، کـە گرینگـی زۆریـان پێداوە، بەڵام ئەوان هۆکاری ئـەم تراژیدیایـە دەگەڕێنـەوە بـۆ خـودی مرۆڤ، نەك بۆ قەدەر و ڕێکەوت و ئەو دیوی سروشـت.....تـاد، بـەڵکو تراژیدیا لەلای ڕیالیستەکان دەگەڕایەوە بۆ هۆکاری ماددی و ئابووری و کۆمەڵایـەتی، بـۆ نموونـە ((بنچـینەی تراژیـدیا لای ڕیالیسـتەکان هەندێکجار دەگەڕێتەوە بـۆ جیـاوازی چینایەتی، یـان هەنـدێکجار بـۆ ململانێـی نـەوەکان، یـان برسـیەتی و هـەژاری، هۆکـاری سیاسـی و ڕامیاری و کۆمەڵایەتییەکان و.....تاد))[٢٠٨].

نۆستالژیا پەیوەندیەکی زۆری لەگەڵ ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە هەیـە، چونکە هەردووکیان ڕەخنە لە واقیـع دەگـرن و دەیانـەوێت واقیعێکـی باشتر و سـەرکەووتووتر و ئـارامتر بەرهـەم بهێـنن، بەتایبـەتی ئەگـەر سەیری بەرهەمەکانی"گۆگول" لەڕووسیا و هەنـدێك لـە بەرهەمـەکانی ((تۆلسـتۆی و باسـترناك و ئێلیـا ئیهـرە نبـۆرگ.....تـاد، سـەر بـەم ڕێبـازەن، لـە ئـەدەبی کوردیـدا دوو چـیرۆکی لـە "خـەومایی جـەمیل سائیب" و "مەسەلەی ویژدانیی ئەحمـەد موختـار جـاف"، سـەر بـەم ڕێبـازەن))[٢٠٩]، ئـەم بەرهەمانـەی ناومـان هێنـان بەشـێکی زۆریـان

(٢٠٨) فەرهاد پیربال (د)، ڕێبازە ئەدەبیەکان، ل ١٠٢.

(٢٠٩) سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٧.

دەچێتە ناو دەقی نۆستالژی، بەتایبەتی "تۆلستۆ، لەخەوما و مەسەلەی ویژدان"، بەلام بەشێوەیەکی گشتی نۆستالژیا پەیوەندیەکی قووڵی بە ریالیزمی تازەوە هەیە، لەناو ئەوانیش ریالیزمی " سیحری" و " فەنتازی"، کە لە ئەمەریکا سەری هەڵداوە، چونکە پەیوەندیەکی هاوبەشی لە نێوان ریالیزمی سیحری(*) و نۆستالژیای تاك و نۆستالژیای گشتیدا هەیە، لەبەر ئەوەی ریالیزمی سیحری سەرچاوەکانی لە واقیع وەردەگرێت، بەلام بۆ دەربڕینی و پێشکێشکردنی، پشتیان بە فەنتازیا و توخمەکانی ئەفسانە و زێدەڕۆیی سەیر و سەمەرەوە دەبەست.

بەرهەمەکانی، گابرێیل گارسیا مارکیز و ئیتالیۆ کالڤینۆ و بۆرخێس و.....تاد، نموونەی ئەم ڕێبازەن، چونکە ((ریالیزمی سیحری پەیوەندیەکی توند و تۆڵی لە نێوان واقیع و خەیاڵدا هەیە،

(*) ریالیزمی سیحری: ریالیزمی سیحری: یەکێك لە ڕێچکەکانی ڕێبازی ریالیزمە. زاراوەی ریالیزمی سیحری، بۆ یەکمجار لە لایەن ڕەخنەگری بواری هونەری شێوەکاری بەناوبانگی ئەڵمانی "فرانز ڕۆھ" داهێنراوە و لە ناونیشانی کتێبێکی خۆیەوە بە ناوی (قۆناخی دوای دەربڕینخوازی و ریالیزمی سیحری: کێشەکانی هونەری وێنەکێشانی نوێی ئەوروپا)، کە لە ساڵی (١٩٢٥)دا بلاویکردووەتەوە، بەکاریهێناوە. دامەزراندن و گەشەی ئەم زاراوەیە لە ئەدەبدا، بە تایبەتیش لە ئەدەبی ئەمریکای لاتینیدا، دەتوانین بۆ کۆشش و کاری چەند چیرۆکنووس و ڕۆماننوسێکی پێشەنگ بگەڕێنینەوە، گرینگترینیشیان(ئەلێخۆ کارپێنتەر)ی کوبییە، کە لە پێشەکی ڕۆمانی "مەملەکەتێکی ئەم جیهانە"دا، کە ساڵی (١٩٤٩) بلاویکردووتەوە، زاراوە ریالیزمی سیحری بەکارهێناوە. هەروەها کەسانێکی دیکە، وەك:(میگێل ئانخل ئەستۆریاس، خۆرخی لویس بۆرخێس، خوان ڕۆڵفۆ، خۆلیۆ کۆرتاسەر، گابرییێل گارسیا مارکیز و.....تاد). (بڕوانە: حسێن سابیر عەلی، ڕنگدانەوەی ریالیزمی سیحری لە ڕۆمانەکانی کاکە مەم بۆتانی دا، ل ٤١– ٤٢ و ٦٣).

نووسەر بۆ دروستکردنی ئەم دنیایە، واقیع تێکەڵ بە خەیاڵ و جادووگەری و سیحر و ئەفسانە دەکات و لە شێوازێکی هونەری فەنتاستیکی پێشکێش دەکات...))[210]. کەوایە: ڕیالیزمی سیحری پەیوەندی هەیە، بە هەردوو جۆرەکەی نۆستالژیا واتە: نۆستالژیای تاك، لە جۆری داهاتوویێکی نموونەیی و ئاییندەخوازی لە ڕێگەی خەیاڵ و فەنتازیاوە، هەروەها نۆستالژیای گشتی لە ڕێگەی پەنا بردن بۆ ئەفسانە و کەسایەتی و ڕووداوە ئەفسانەییەکان، یان گەڕانە بە دوای بەهەشتی ونبوو، ڕووحی ئەبەدییەت و ژیانی هەمیشەیی بە هۆی فڕین بەسەر باڵی خەیاڵ و ئەندێشەی فەنتازی بۆ دۆزینەوەی یۆتۆپیا و شاری نموونەیی، کە جۆرێکی دیاری نۆستالژیایە، تەنانەت هەندێك وای دەبینن، کەوا هیچ بەرهەمێکی ئەدەبی نییە، کەوا هەڵگری ڕێبازی ڕیالیزمی نەبێ کەم بێ، یان زۆر، وەك ڕووناکبیری فەرەنسی "ڕۆژێ گاروودی" لە کتێبی "ڕیالیزمی بێ کەنار" دا، دەڵێ: ((ئەمڕۆ هەرچی بەرهەمێکی ئەدەبی و هونەری بەهەر شێواز و تەکنیکێك بێت...، هەر دەچێتەوە سەر ڕیالیزم))[211]، چونکە "گاروودی" پێیوایە، کەوا واقیع سنووری نییە و داهێنانیش

(٢١٠) روناك سەلاح عەلی، هونەری فەنتازیا لە چیرۆکی نوێی کوردیدا، بەنموونەی چیرۆکەکانی"سابیر ڕەشید و شێرزاد حەسەن"، نامەی ماستەر، کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠١٤، ل ٤٦.

(٢١١) فەرهاد پیربال (د)، ڕێبازە ئەدەبیەکان، ل١٠٩.

ڕەنگدانەوەی واقیعە. نموونەی ئـەدەبی کـوردی ڕیـالیزمی زۆرن، کـە بەرهەمەکانیان بەشێکی زۆری دەچێتەوە سەر ئەم ڕێبازە، جـا چ بـە ئاگاییەوە بێ لەم ڕێبازە و چ بێ ئاگایی شاعیر بێت، بەڵام ئێمە تەنیا ئاماژە بە " گۆران" دەکەین، کەوا وەك شاعیرێکی بە ئاگا و هۆشـیار کاری لەبارەی ئەم ڕێبازە کردووە، چـونکە خـۆی دەڵـێ:((پـاش ئـەم ماوەیە تەییاری سیاسـی و کۆمەڵایـەتی کەوتـە ناومانـەوە وە مـن بـە تەئسیری ئەم دوو ئەدەبەوە"ئینگلیـزی و عـەرەبی"، کەوتمـە هـەوای واقیعیەتەوە))[٢١٢]، هەروەها "فەرهاد پیربال" لەبارەی ڕیالیزم بوونی "گۆران"دا، دەڵێ: ((ڕیالیست بوونی گۆران لەمەدا دەردەکەوێت، کـە گۆران بۆ یەکەمجار کەوتە باسی جیهـانی تاکەکـەس و ئازادییـەکانی، لە ڕێگەی تاکەکەسەوە هاتە ناو کێشە گشییەکانەوە، هەروەها گۆران بابـەت و کێشـە و گرفتـە کۆمەڵایـەتی و سیاسـی و مرۆڤایەتیـەکانی خستە بەر شیتەڵکردنەوەی ڕووانینـی خـۆی، جگـە لەمانـەش نـاوبراو بـەرە و سەرچـاوە نیشـتیمانی و کەلـەپوورە نەتەوییـە ڕەسـەنەکان دەگەڕێتەوە و باوەشی بە سامانە شـیعرییە فۆلکلۆرییـەکانی خۆمـان دەکـات))[٢١٣]، کەواتــە دەتــوانین بڵــێین: بــە شــێوەیەکی گشــتی نۆستالژیا پەیوەندیەکی دیار و قووڵی لەگەڵ ڕیالیزم بەگشتیدا هەیـە، نۆستالژیا هەڵگری خەم و ژان و ئـازار و ناخۆشـی و هەسـت و سـۆز و

(٢١٢) فەرهاد پیربال (د)، ڕێبازە ئەدەبیەکان، ل ١١٠.

(٢١٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٠.

دەروونـی تاکـە لـە بەرانبـەر کێشـە و گرفتـەکانی ڕۆژگـار و سـتەم و زۆرداری و جیـاوازی چـینایەتی و ناعەدالـەتی کۆمەڵایـەتی، ئەمـەش باس و بابەتی بەرهەمە ڕیالیستەکانن لەهەمان کاتدا.

### ت) پەیوەندی نۆستالژیا بە ڕێبازی سمبووڵیزمەوە *

ڕێبازی سمبووڵیزم، وەك یەكێك لە ڕێبازە دیار و ئاشناكانی دنیای ئەدەب، پانتایەكی فراوانی تەنیووە، لە جیهانی ئەدەبیاتی هەموو مللیەتان بە گشتی و ژانر و ئەدەبی كوردی بەتایبەتی، دەبێت ئەمە لەبیر نەكەین، كەوا سمبووڵیزم، یان ئەم ڕێبازە پەیوەندیەكی بە هێزی لەگەڵ سانسۆری سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتیدا هەیە، چونكە لە ژینگەیەكدا چەوسانەوە و بیری نشتیمانی و بە نیشتیمان بوون و نەتەوەخوازی و دابونەریتە كۆمەڵایەتییەكان زاڵبوون، ئەوا ئەم ڕێبازە زیاتر بایەخی پێدەدرێت، بۆ ئەدیب و ئەدەبیاتی كوردیش، ئەم هۆكارە شیاو و لە شوێنی خۆیەتی.

مەرج نییە نۆستالژیا پەیوەندیەكی سەد لە سەدی بە تەواوی دەستوور و پرەنسیپەكانی ڕێبازی سمبووڵیزمەوە هەبێت، بەڵام

---

(*) ڕێبازی سمبووڵیزم: لە سەرەتای ساڵی (١٨٨٠)دا ڕێبازی سمبووڵیزم، دژ بە ڕێبازی ڕیالیزم و ناتورالیزم و فۆرمالیستیی پەرناسەكان، لە فەرەنسا و پاشان لە بەلژیكا و ئینجا لە سویسرا دەستی پێكرد. چەند گەنجێك، لەوانە ستێڤان مالارمێ و بۆدلێر و... هەندێ نووسەری دیكەش، كە پێشتر هەموویان پێكەوە ڕۆڵیان لە دامەزراندنی پەرناسدا هەبوو، نیگا بەرینەكانیان دوورتر لە چوارچێوەی پەرناس هەڵفڕی. هەنگاویان بەرەو جیهانێكی فراوانتر هەڵنا: جیهانی پەنهانی ڕووح. نووسەران و شاعیرانی سەر بەم ڕێبازە لە ساڵی ١٨٨٦ بەملاوە چەند بەرهەم و وتار و گۆڤارێكیان بڵاوكردەوە. لە ١٨ی ٩ی ١٨٨٦یشدا بەیاننامەی خۆیان لە پاشكۆی ڕۆژنامەی (لۆ فیگارۆ) بڵاو كردەوە. لەو بەیاننامەیەدا (فرانسوا مۆریاك)كە، بە نەژاد یۆنانی بوو، بۆ یەكەمجار وشەی سمبووڵیزمی بەكارهێنا. (بڕوانە: فەرهاد پیربال، ڕێبازە ئەدەبیەكان، ل ١٤١ و ١٤٣).

بەشێکی زۆری ئەم ڕێبازە پەیوەندی قووڵی لەگەڵ نۆستالژیادا هەیە، بەشێوەیەکی گشتی گرینگترین پرنسیپ و خاسیەتەکانی سمبوولیزم لە خوارەوە دەخینە ڕوو:

## گرینگترین پرەنسیپەکانی سمبوولیزم:

((١ـ حاڵەتی خەمباری و پرسە ئامێزی سروشت و ئەو دیمەن و ڕووداوانەی کەمایەی نا ئومێدی و ئازار و نیگەرانی و ترس و دڵەڕاوکێی مرۆڤن دەردەبڕن.

٢ـ بایەخ بەو فۆرم و ڕەمز و هێما و ڕیتمە دەدەن، کە هەست پێیان قایلە و دژی عەقڵ و لۆژیکە.

٣ـ دوورکەوتنەوە لە واقیعی بابەتی نزیك کەوتنەوە لە واقیعی زەینی.

٤ـ مرۆڤ گیرۆدە و دەستەمۆی کۆمەڵێك هێزی نادیارە، بۆیە حاڵەتی مەرگئامێز و ترسناکی ئەم هێزانە لە میانی جۆرە خەون و خەیاڵ و ئەفسانەیەکەوە دەردەبڕن.

٥ـ بەیارمەتی هەست و خەیاڵ، حاڵەتە ڕووحییەکان لە نێوان ئازادی تەواودا بە مۆسیقای وشە و ڕیتم و ڕەنگ و هەڵچوون وێنە دەگرن ))[٢١٤].

---

(٢١٤) رضا سید حسینی، قوتابخانە ئەدەبیەکان، و، حەمە کەریم عارف، ل١٦٩.

٦ـــ شـيعر بەشـێوەیەکی گشـتی و هونـەر نـابێ هـەڵگری هـیچ ئامانجێکی ئەخلاقی، یان کۆمەڵایەتی بێت.

نۆستالژیا ناوەرۆکی، یان بەکرۆکی ڕێبازی ڕۆمانسیزم دادەندرێت، چونکە لەگەڵ زۆرترین خاسیەت و تایبەتمەندیـەکانی هاوبـەش و وەك یەکن، بەڵام دەگووترێت: ((ڕێبازی سمبووڵیزم بە ڕۆمانسیەت دەستی پێکـردوو، لـە ڕووی ناوەرۆکـەوە هاوبـەش بـوون، بـەڵام لـە شـێوازی دەربڕینـدا لێـی جیـابوو، بـە چەشـنێك لـە جـەخت کردنـی لەسـەر خوددا..، تەنیا بە هـۆی خـودی شـاعیر و تاقیکردنـەوە خودییـەکانی نەبێت..، بۆیە ئەستەم بوو، کە بە شـێوازێکی ڕاسـتەوخۆ دەربـبڕێن، بەڵکو شاعیری ڕەمزی تەنیا دەتوانێ پەنا بۆ ئەم ڕەمزانـە ببـات، کـە هەڵیاندەبژێرێت..))[٢١٥]. بیر و بۆچـوونی سـیمبووڵیزمەکان زیـاتر لـە عیرفـانی و سـۆفیگەری ڕۆژهـەڵاتی نزیـك دەبێتـەوە، چـونکە دەقـە شـیعرییەکان هـەڵگری بەشـێکی زۆری سمبـووڵ و ڕەمـزی ئـایینی و نهێنی ژیان و مردن و زمان و دەستەواژەی ڕەمزین، ئەمەش لە بابەت و جۆری نۆستالژیا گەڕانەوە بۆ بەهەشتی ونبوو، گەیشـتن بـە جـوانی خودا و توانەوە تێیدا، یەکدەگرێتەوەو پەیوەندیان هەیـە، یـەکێك لـە جۆرەکانی دیکەی نۆستالژیای لە گەڕانەوەیە بۆ سروشت، ئەم بابەتە لەلای سمبووڵیزەکان گرینگی پێدراوە و باسـی لێـوە کـراوە، چـونکە

(٢١٥) پەخشـان سـابیر حەمـەد(د)، ڕەمـز لـە شـیعری هاوچـەرخی کـوردی کرمـانجی خـوارووی کوردستان(١٩٧٠ — ١٩٩١)، ل٣٩.

ئەوان دەڵێن: بۆ چوونی ئێمە لەبارەی سروشت، ((بریتییە لە ژیانی ڕووحی خۆمان، ئێمەین کە هەست دەکەین و نەخشی ڕووحی ئێمەیە، کە لە شتەکاندا ڕەنگدەداتەوە، کاتێ مرۆڤ ئەو دیمەنانەی کە دیوویەتی بەو پەڕی ناسکی درك دەکات، بە کورتییەکەی هەر هەموو سروشت ڕەمز و سمبووڵی بوون و ژیانی خودی مرۆڤە))[٢١٦]، چونکە سمبووڵیزمەکان خۆیان بە بەشێك لە سروشت دادەنا و بەشتێکی نەمر و زیندووبان لە قەڵەم دەدا، بۆیە دەگووترێت: ((لەبەر ئەوەی سروشت لای سیمبووڵیزمەکان زیندوو بوون، ڕەمزێك بوو بۆ بوونیان، ئەوان سروشت و سروشت ئەوان بوون))[٢١٧]. کەواتە سمبووڵیزمەکان سروشتیان دەکردە ڕەمزی بوون و وەك ڕەمزێکی نهێنی ژیان سەیریان دەکرد، بەمەش هەر گەڕانەوەیەك بۆ سروشت دەچێتە ناو نۆستالژیا، جا لە هەر ڕێباز و قوتابخانەیەکی ئەدەبی بێت، لەبەر ئەوەی سروشت سمبووڵی نهێنیەکی شاراوەی ژیانە. هەروەها هەر گەڕانەوەیەکی نۆستالژیا، یان هەنگاونان بۆ داهاتوو و ئاییندەخوازی بەشێکی ڕەمزی تێدایە، ئەوەتا لەم بارەیەوە، "لویس هورتیك"، دەڵێ: ((هیچ شیعرێك نییە، بڕێك لە ڕەمزی تێدا نەبێ))[٢١٨]. بۆیە

(٢١٦) ڕەزا سەید حوسێنی، قوتابخانە ئەدەبیەکان، و، حەمە کەریم عارف، ل١٦٤.

(٢١٧) پەخشان سابیر حەمەد(د)، ڕەمز لە شیعری هاوچەرخی کوردی کرمانجی خوارووی کوردستان(١٩٧٠ – ١٩٩١)، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل٤٤.

(٢١٨) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩.

ئەگەر شاعیر بەمەبەست بێ و بێ مەبەست بێت، دەقەکە بەشێکی دەچێتە ناو ڕەمزەوە.

"ئەرستۆ" کۆنترین کەسە لە ئاستی زمانی لە ڕەمز دواوە و دەڵێ: ((وشەکان ڕەمزن بۆ واتای وشەکان، وشە گوتراوەکان ڕەمزن بۆ حاڵەتەکانی نەفس و وشە نووسراوەکان ڕەمزن بۆ وشە گوتراوەکان))[٢١٩]. کەواتە سمبوولیزمەکان زۆر گرینگیان بە حاڵەتە دەروونییەکان و شتە شاراوەکانی دەروون داوە و خەم و ئازاری شاراوەی دەروونیان خستۆتە ناو دەقەکانیان، بەڵام بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە شێوەی سمبووڵ و ڕەمزەوە، نۆستالژیاش پەیوەندی لەگەڵ دەرووندا هەیە، دیاردەیەکی دەروونییە و خەم و ئازارەکانی ناخ دەخاتە ڕوو.

نۆستالژیا پەیوەندیەکی قووڵی بە ڕێبازی سمبوولیزمی هەیە، بەتایبەتی لەگەڵ نۆستالژیای گشتی، وەك ئەفسانەکان و کەلەپوور و بابەتە فۆلکلۆرییەکان و مێژوو و سیاسەت و کەسایەتییە نەتەوەیی و ئایینی و جیهانییەکان، بە گەڕانەوە بۆ ئەم جۆرە نۆستالژیایە، دەقێکی نۆستالژی گشتی دێتە بەرهەم و لە هەمان کاتیشدا ڕەمز و سمبووڵیەکە، بۆ مەبەستی ناوەڕۆکی دەقەکە و گەیاندنی پەیامێك شاعیر سوودیان لێ دەبینێ و باسیان دەکات، لێرەدا دەقێکی

(٢١٩) ئیبراهیم ئەحمەد شوان(د)، ڕەمز لە شیعرە کوردیەکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ژمارە(٣٤)، ساڵی ٢٠٠٨، ل٧.

نۆستالژی گشتی دێتە بوون، بە هۆی وێنەیەکی ڕەمـزی کەلـەپووری، یــان ئەفســانەی، یــان شــوێنەواری، یــان مێــژوویی و نەتــەوەیی و کەسایەتییە دیار و نەتەوەییەکان و سەرکردەکان و.....تـاد، چـونکە ((سمبوولّیزمـەکان زۆر هانایـان بـۆ ئەفسـانە دێرینـەکان دەبـرد، زۆر جاریش ئەندێشە، یان بابەتی، وەك ئەم جـۆرە ئەفسـانە دێرینانـەیان بەرهـەم دەهێنـا...))[٢٢٠]، کەواتـە: ڕەمـز و هێمـا و سمبوولّـەکان بـۆ ئەدەب و ئەدەبیاتی کـورد پێویسـت و گـرینگ بـووە، چـونکە لەگـەڵ بـارودۆخی کوردســتان لــەبار و پێویســت بــووە، لــەناو دەقەکانیــدا بەشــێوەیەکی بەرچــاو و دیــار ڕەنگــی داوەتــەوە و بەرجەســتەیان کردووە، ئێستێتیکایەکی جوان و هونەریان بە دەقـەکان بەخشـیووە، ئەمە جگە لە سرووش بەخشین بـە خـودی شـاعیرەکان. بـە تایبـەتی دوای ســەرهەڵدان و گەشەســەندنی بــیری نەتەوایــەتی لــە ســەدەی بیستەمدا، لە کوردستان، چونکە ((ئەگەر ژێی هۆزانا " نەتەوایەتی یا کوردی" ژ چار سەد سالان پتر بیت، دە ڤێت ئێرۆ هۆزان ب بیتـە رێ شــاندەرا شورشــە کــا هــزری – نەتەوایــەتی، داخــازا جەنگــەکێ سەرتاسەری بکەت، ژ بۆ دانانا دەولەتا سەربەخۆ...))[٢٢١]، هـەروەها

(٢٢٠) محمد مندور، الأدب المذاهبة، طبعة نهضة مصر، القاهرة، ١٩٧٤، ص١٣٥.

(٢٢١) کامیران محەمەد نەبی(د)، قۆناخەکانی گەشەکردنی بیری نەتەوایەتی لە شیعری کوردیدا، لـە سەرەتاوە تا کۆتایی سەدەی بیستەم، نامەی دکتۆرا، کۆلیژی زمان، زانکۆی سەلاحەددین، هـەولێر، ٢٠٠٥، ل٥١١.

دەقە نۆستالۆژییەکان پڕن لە هونەرەکانی ڕەوانبێژی وەك: خـوازە و خواستن و لێکچوواندن و درکە و مەجاز و.....تـاد، بەمـەش بەشـێکی زۆری ئـەم وێنانـە هـەڵگری چـەمك و مانـای دەلالی و سمبـوولێزمن و ڕەمزێـك لــەخۆدەگرن و بــۆ مەبەســتی تایبــەتی شــاعیر بــەکاریان دەهێنێت و لەم ڕێگایەوە داهێنان ئەنجام دەدات.

**ج) پەیوەندی نۆستالژیا بە ڕێبازی سوریالیزمەوە**

جەنگی یەکەمی جیهانی و هەڕەشە سامناکەکانی پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیا و پیشەسازی، لەگەڵ نالەباری جەنجاڵیەکانی شارستانییەتی تازەی سەدەی بیستەم، کە مرۆڤیان لە ئەوروپا تووشی بێ ئومێدی و سەر لێشێوان و هەرەس و پارچە پارچەیی کرد بوو، هۆکارێکی سەرەکی بوو لە دامەزراندن و سەر هەڵدانی ئەم ڕێبازە، کەواتە سوریالیزم لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا سەری هەڵدا.

مەرج نییە هەموو بنەما و خاسیەتەکانی سوریالیزم کتومت لەگەڵ نۆستالژیا و دەقی نۆستالژیدا هەڵبکات و یەکبگرێتەوە. لێرەدا ئاماژە بە هەندێك لەو بنەما و خاسییەتانەی سوریالیزم دەکەین، کەوا لە نۆستالژیاشدا هەیە و بەرچاوە، وەك:

١. سوریالیزم هەمیشە ئامانجی ((لەناوبردن و یاخیبوونە لە ژیانی واقیع و بەدوا داگەڕانی واقیعێکی بالاّتر لە واقیعی ڕاستە قینەیە، دژی لوژیك و عەقڵ دەجووڵانەوە و هەمیشە پشتیان بە نەست دەبەست...))[٢٢٢].

٢. خەون و خەیاڵ : ((نووسەر و هونەرمەندی سوریالیزمی تەنێ ئەوەی بەسە، کە تۆ خەونێکی خۆت بخیتە چوارچێوەی هونەرییەوە،

(٢٢٢) هیمداد حوسێن(د)، ڕێبازە ئەدەبییەکان، ل ٢٢١–٢٢٢.

چــونکە خــەون و قووڵبوونــەوە بــەناو دەریــای وەهــم و خەونــدا لــە فەلسەفەی سوریالیزمدا، بایەخی بە قەدەر جیهانی بێداری و عـەقڵ و واقیع بگرە زیاتریشە ))[٢٢٣].

٣. نوسینی ئۆتۆماتیکی : ((ئەم هونەرە پـێش هـەموو شـتێك بـۆ ئەوە بووە، کە مرۆڤ خۆی لە دەست غەوغای شارستانییەتی درۆزنی هاوچەرخدا بدزێتەوە، بتوانێ بەهرەی سروشتی خۆی بتەقێنێتەوە... ))[٢٢٤].

فەلسەفەی کارە ئەدەبی و هونەریەکانی سـەدەکانی (١٧و١٨و١٩) لــە بەرهەمــەکانی "جوســبی ئارکیمبیــدۆ G.Arcimboldo ١٥٣٠-١٥٩٣" و "منسوودیز درۆA.D.monsu" هەروەها کارە هونەرییەکانی "مــارك شــاغال M.chagall ١٨٨٧-١٩٥٨" بریتــی بــووە لــە ((سەربەســتکردنی خــەیاڵ و دوور لــە عەقڵانییــەت و دژی زەمــەن و فەزایەکی فـەنتازی بـە تەنیشـت ئـەو ڕێکەوتـە خـۆش و ناخۆشـانەی ســەردەمی منــداڵی....))[٢٢٥]. کەواتــە خــەم و ئــازار و ناخۆشــی و حەسرەت و غوربەتی شوێن و سـەردەمەکانی منـداڵی و داهاتوویـەکی نموونــەیی بەشـێکی گـرینگ و دیـاری دەقــی ســوریالیزمن، چـونکە

(٢٢٣) فەرهاد پیربال(د)، ڕێبازە ئەدەبییەکان، ل ٢٢٩ و ٢٦٤.

(٢٢٤) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٧.

(٢٢٥) ئەحمــەد مــەحموود عەبــدوڵڵا، ســوریالیزم لــە ئــەدەبی کوردیــدا لــە دوای ڕاپــەرینی ١٩٩١، چاپخانەی بینایی سلێمانی ٢٠١٣، ل٢٧.

شاعیری سوریالیزمی بیەوێ و نەیەوێ بە شێوەیەکی ناهۆشیاری دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو، سەردەمی منداڵی و ڕاکردن لە واقیعیدا.

ئەم ئازار و نەهامەتی و نائومێدیانەی بە هۆی شەڕ و جەنگی جیهانی و شەڕە ناوەخۆییەکان بووە، هۆی ((هەستکردن بە ئازار و نائومێدی و ئەو نەهامەتییەی، کە عەقڵی مرۆڤ بەسەر مرۆڤی هێنابوو، لە ئەنجامی بێ توانایی عەقڵی هۆشیار، بۆ گەیشتن بە لێکدانەوەیەك بۆ هەڵسوکەوتی مرۆڤ))[٢٢٦]، چونکە نووسەر و هونەرمەندانی دادایزمی و سوریالیزمی هەموویان خاوەن یەك خاڵی هاوبەش بوون، کە بریتی بووە لە ((یاخی بوون و بێ ئومێدی و ڕەشبینی و ڕاکردن لەو واقیعە، دەیانویست دنیایەك بۆ خۆیان دروست بکەن، کە پاك و بێگەرد بێ، بە قەد پاکی و بێگەردی منداڵ....))[٢٢٧].

نۆستالژیاش بە هەمان شێوە کۆکردنەوەی ڕاستی و خەیاڵە کۆکردنەوەی هەموو دژیەکەکانە، وەکو ڕابردوو، داهاتوو، خەون و خەیاڵ ڕاکردنە لە واقیع و ئاواتخواستنە بۆ واقیعێکی جوانتر و بالاتر، هەنگاو نانە بۆ داهاتوویەکی نموونەیی لە ڕووی زەمەن و شوێنێکی نموونەیی و شوێنێك، کە بوونی لەسەر ئەرزی واقیع دانییە، هەر

---

(٢٢٦) روز غريب، تمهيد في النقد الحديث، دار المكشوف، بيروت، لبنان ١٩٧٩، ص ٢٢٩.

(٢٢٧) مەجید سالح، دادایزم و ڕێبازی یاخی بوون، ڕۆژنامەی برایەتی، پاشکۆی ئەدەب و هونەر، ژمارە(٣٠١٧)، پێنج شەمە، ٢٠٠٣، هەولێر،ل٩

ئەمەشە سوریالیزم زۆر جەختی لەسەر دەکاتەوە، ئەو خەون و ئومێد و خەیاڵەی سوریالیزم دەیەوێت ببێتە سەروەری دەقەکان، هەمان خەون و خەیاڵی نۆستالژیاشە بۆ داهێنانی دەقێکی فەنتازی و سەروی واقیع، ئەوەتە دەگوترێت: نۆستالژیا: لە دوو ڕوانگەی دژ بە یەك سەرچاوە دەگرێ وەك: ((نیشتیمان و دوورە ولاّتی، ئێستا و ڕابردوو، خەون و ڕاستی))[228]. هەر لەم بارەیەوە "ئەندرێ بریتۆن" دامەزرێنەری ڕێبازی سوریالیزم، دەڵێ: ((خاڵێك هەیە، کە بیر بگاتە ئاستی هەموو دژەکان ئاوێتەی یەکتر دەبن، لە نێوان ژیان و مردن، ڕاستی و خەیاڵ، ڕابردوو و داهاتوودا))[229].

شاعیری نۆستالژیاش پەنا دەباتە بەر ڕابردوو، زەمەنی بەسەرچوو، ئەم ڕابردووە ئامادەیی هەیە لە جەستەی خود، وا لە خود دەکات پاشەکشە بکات و بەرەو دواوە پەلکێشی بکات، دەیەوێت ئەو ڕابردووەی کە بۆی دەگەڕێتەوە، تاقە تروسکاییەك، یان هیوایەك، ڕۆشناییەك بدۆزێتەوە، بۆ خۆ دزینەوە و ڕزگاربوون لە بێ هیوای و بێ هودەیی زەمەنی ئێستا و پچڕاندنی زەمەنی ئێستا و هەنووکەی.

(228) SvetlanaBoym.Nostalgia and ItsDis contents,p8.

(٢٢٩) احسان عباس(د)، فن الشعر، دار الشروق للنشر والتوزيع عمان، الاردن، ط٤، ١٩٧٨، ص٩٠.

"بودریـار" لـەبارەی نۆسـتالژیا و غوربـەت و کۆچـەوە، دەڵـێ: ((نۆسـتالژیا، وەك دیاردەیـەکی بـێ ڕەگ و ڕیشـە لـە واقیـع، واتـە هەروەك (سەرووی واقیع) دێتە بەرچاو))[230].

بۆ نموونە لە شیعری (نوزەیەك لە نیوە شەو)دا بەرهەمی شاعیری ئینگلیزی "هارۆلد مۆنرۆ" کاتێك شاعیر دابڕانی جەستەیی نێـر و مـێ لـە مردنـدا بەرجەسـتە دەکـات و نۆسـتالژیایەکی گـەورە و حـەزێکی گەورە لە ناخیـدا دروسـت دەبێـت، بـۆ یەکگرتنەوەیـەکی سـەرەوەی واقیع، لەگەڵ ئەو جەستە بێ گیانەی، لە گۆڕدا دوور لـەو بـە تـاریکی دەنێژرێت و لە ترۆپکـی نۆسـتالژیادا، دەڵـێ:((ئـاخۆ دەبـێ ڕێگایـەك نەبێت جەستەمان یەکخەین؟!))[231].

سـوریالیزمەکان زۆر گرینگیـان بـە عەشـق و خۆشەویسـتی داوە، زمانی شیعر، یان زمانی نووسین لای زۆرێـك لـە نووسـەر و شـاعیرانی سوریالیست، زمانێکی شیرین بوو، زمانی نـاخ و ڕووح و غـەریزەکان و زمانی خـەون و خەیاڵـەکانی مـرۆڤ بـوو، قسـەکردن بـوو لەگـەڵ ڕۆژە تاریك و ڕووناکەکانی یادەوەری، قسەکردن بـوو لەگـەڵ پـەیکـەرە بـێ دەنگـەکانی نەسـت، خۆشەویسـتی وەك پێداویسـتییەکی ڕووحـی و مرۆیی وایە، بۆیە لەم بارەیەوە

---

(٢٣٠) حەمید نفیسی، نوستالژی مهاجر، فصلنامه گفتوگو، شماره ١١، تهران، ١٣٧٥، ص ٥٩.

(٢٣١) نەجات حەمید ئەحمەد، بنیاتی دووسەرەی نۆستالژیای بوون لە تراژیدیای نەبووندا، گۆڤـاری کاروان، ژمارە (١١٤)، ل ١٦.

دەگوترێ: ((خۆشەویستی یەکێك لەو بابەتە گرینگ و جوانانە بوو، کە لە نێو شیعرەکانی سوریالیستەکان بە زمانی قووڵ و سادە و ڕۆشن بە تایبەتی لە ساڵەکانی شەڕ و جەنگدا دەنووسرا...))[٢٣٢]، لەم کاتەدا دەبووە، هۆی غەریبی و غوربەت و هەستانی کانیاوی سۆز و دڵ و دەروونی شاعیر، بیرەوەرییەکانی ڕابردووی لەگەڵ، یاربوون و گەڕانەوە بۆ شوێنی ژوان و.....تاد، ئەویش بە ڕێگەی بێ ئاگایی و نەستەوە بووە، بەم حاڵەتەش دەقێکی نۆستالژی دێتە بەرهەم.

(٢٣٢) ناڵە حەسەن، چەمکە دەروونییەکان و دەقی ئەدەبی، چاپی ١، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٢، ل ١١٠.



# بەشی دووەم

## ◄ تەوەری یەکەم

### یەکەم// جۆرەکانی نۆستالژیا لە شیعرەکانی

- عەبدوڵڵا پەشێو
- ئەنوەر قادر محەمەد
- سەباح ڕەنجدەردا

بەشی یەکەم

# تەوەری یەکەم

## • یەکەم// جۆرەکانی نۆستالژیا لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو، ئەنوەر قادر محەمەد، سەباح ڕەنجدەر"دا.

## یەکەم// نۆستالژیای تاکەکەس"خودی"

### ١-١ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی:

منداڵی سەردەمی پاك و پاكیزەیی مرۆڤە، سەردەمی بێ گوناهی و فریشتە ئاسایە و هێشتا مرۆڤ دڵ و دەروونی بە ڕق و كینە و فرِوفێڵی ژیان ژەنگیان هەڵنەهێناوە، منداڵی بەردەوام لەگەڵ مرۆڤدا دەژیت و لەبیری ناكات، لەم بارەیەوە "ویژدزیرث -Wezhdzerth"،

دەڵێت: ((منداڵی باوکی پیاوە، واتە هەرچی لە منداڵیدا دەخرێتە سەر ڕووپەڕە سپی و بێگەردەکانی هۆش و دڵ، بە درێژایی تەمەن دەمێنێتەوە و کار دەکاتە سەر ڕێڕەوەی ژیانی مرۆڤ ))[٢٣٣]، بۆیە شاعیران و نووسەران بە شێوەیەکی تایبەت و دیار هیوا و ئاواتی ئەو سەردەمە دەخوازن، ئەوەش بە ئومێدی پاککردنەوەی دڵ و دەروون و ناخیان لە هەستی تەنیایی و ژەنگی ژیان و بۆنی گەنیووی کۆمەڵگە و...تاد.

(٢٣٣) کەمال مامەند میراودەلی، چەند وتارێك دەربارەی ئەدەب و ڕخنەی کوردی، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨١، ل١٧.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی لە شیعرەکانی "عەبدوڵلا پەشێو"دا

"عەبدوڵلا پەشێو" لە شیعری (ئەگەر ئەمجارە بێمەوە)دا، ئەم گەڕانەوەی بۆ سەردەمی منداڵی و پاکی و سادەیی خۆی ئەنجامداوە، دەڵێ:

**((ئەی دایەگیان!**

**لە یادمە، کە منالْ بووم،**

**ئەشقی تامی تفت و تالْ بووم:**

**گلم دەخوارد،**

**قوڕم دەجوی،**

**تۆش زللەیەکت لیْ دەدام،**

**هەمووت پیْ تون فڕیْ دەدام...)) (عەبدوڵلا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لەکڕێوە،ل٣٤٥ ).**

شاعیر لەم شیعرەی سەروو، باسی سەردەمی منداڵی دەکات، کە لەبەر پاکی و سادەی قۆناخەکە قوڕی خواردووە و یاری پیْ کردووە، هێشتا ئەو کاتەی لە بیرە، کە خۆی ناخۆش و گریانی پێوە بووە، بەلاّم بۆ ئێستا بیرەوەریەکی یەکجار خۆش و ئارامبەخشە.

بێگۆمان بیری منداڵی و سەردەمی منداڵی بیرێکە لەیادکردنی لە دەفتەری یادەوەری ژیاندا شتێکی مەحاڵە، کورد وتەنی: (بیری

مندالّی تیژە)، بۆیە شاعیریش ئەم بیرە تیژەی هەیە و ڕابردووی لەبیر ناکات، بە سۆزەوە دەڵێ: (ئەی دایە گیان لە یادمە)، کەواتە شاعیر بە ئاسانی لە ژیاندا ناتوانێ ئەمە لەبیر بکات و تەنانەت ناشتوانێ لە بێتاقەتی و وەڕەسی ئێستای، شتێکی خۆشتر لە مندالّیی بدۆزێتەوە، بۆ ئەوەی تێیدا ئاسوودەیی ونبووی بۆ چرکە ساتێکیش بێت، بگەڕێنێتەوە. لە شیعرێکی دیکەدا شاعیر، دەڵێ:

**((دەچاوەکەم،**
**دیسان گیانم تژی کەوە**
**لە منالّی و تاسەی یاری**
**پرێسکەکەت بکەرەوە،**
**بۆم هەلّڕێژە**
**دەنکە زەنگیانە و مرواری!)) (عەبدوللآ پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لەکرێوە، ل٤٧٤).**

لێرەدا شاعیر، چ لە ڕێگەی وشەی (منالّی)، چ لە ڕێگەی (یاری و زەنگیانە و مرواری) ئەم گەڕانەوەی ئەنجامداوە، واتە شاعیر، چ بە هەڵسوکەوت و چ بە وشەش گەڕاوەتەوە سەردەمی مندالّی، خۆزگە دەخوازێ ئەگەر کرابا و بۆ کەمێکیش بێ، بگەڕێتەوە بۆ مندالّی و یاری بکات و شتەکان تێکەڵ و پێکەڵ بکات، کە بێگومان مندالّ هەمیشە حەز دەکات بە ئارەزووی خۆی کەلوپەلی لە پێش دابندرێ و

یاری پێ بکات، بۆیە نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ منداڵی بە ناو دێر و وشەکانیدا بە زەقی و روونی دیارە.

لەم دەقەی خوارەوەش "عەبدوڵلا پەشێو" جارێکی دیکە و بە جۆرێکی دیکە، دەگەڕێتەوە بۆ منداڵی، کاتێ دەڵێ:

**((بە منالّی**

**شێتی کچە هاوسێیەك بووم**

**هەر جارێکی وەڕس دەبووین،**

**سەری خۆمان هەڵدەگرت و**

**لە شوێنێك، چەپەك و پەنا،**

**خانووچکەیەکمان چێ دەکرد...)) (عەبدوڵلا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٢٧٤ ).**

لەم کۆپلەیەشدا لە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی و ڕابردووی کۆن شاعیر دەیەوێ پەردە، لەسەر بابەتێکی دیکە هەڵبداتەوە و بۆ مەسەلەیەکی دیکە پەلکێشمان بکات، ئەویش دەرخستنی وەفا و پاکی و بێگەردی شاعیرە لە بەرانبەر یارەکەیدا، لە ڕێگەی ئەم گوزارشتەوە، شاعیر دەیەوێ بەم گەڕانەوەیە بۆ منداڵی ئاسوودەیی دەست بکەوێت و هەست بە خۆشی و شادی و شانازی دەکات. دەبینین ئەم عەشقی منداڵییە بووەتە هۆکاری سوکنایەتی دڵ بۆ شاعیر و ناتوانێ لە دەفتەری یادەوەریدا ڕەشی

بکاتەوە، ئاخر منـداڵ بـە بـیر و بۆچـوونی زانایـانی دەروون، ئـەوەی منداڵ دەیبینـێ هەمیشـە یەکـەمجارە و لەوانەیـە جـارێکی دیکـە ئـەو شتە نەبینێتەوە، بۆیە هەمیشە لە ناخ و بیر و خەیاڵیدا دەرناچێ.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

شاعیر لە دەست خەم و زۆرداری و ئازارەکانی ژیان و ڕەتکردنەوەی واقیعی حاڵ و سەردەمی ئێستادا (ئەو کاتەی دەقەکەی تێیدا نووسیووە)، بە تکاوە داوا لە خودای گەورە دەکات، کەوا ڕزگاری بکات و بیگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی و شوێنی یارییەکانی، کە (عەربەت)ە، شاعیر دەڵێ:

**((بمکەرە مناڵەکەی جاران، دەبا بە گوڕ لە پەڵە گەنمەکانی "عەربەت"دا**

**تا هەناوم تیایە، بە دووای "زەردی وەرییەك"دا**

**ڕاکەم... ڕاکەم...**

**بمکەرە "پەڵکە"کەی توخوا با ئێواران**

**مەلی ماندوو لە دەوری سەرم بگەڕێن...)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ٤٧–٤٨).**

شاعیر دەیەوێ بچێتەوە سەردەمی منداڵی و سەردەمی خۆشی و شادی و یاری منداڵان، چونکە منداڵی بێ ئاگایە لە خەم و ژان و ئێش و ئازاری ژیان و کۆمەڵگە، خەم و حەسرەتی منداڵ تەنیا یاری و

کەلوپــەلی یارییــە، بۆیــە شــاعیر داوا دەکــات ببێتــەوە، منداڵەکــەی شارۆچکەی عەربەت و لە بەیانی تا ئێوارە هەر ڕاکە ڕاکەی بێـت، داوا دەکـات بگەڕێتـەوە ، ئـەو زەمـەنی، کـەوا ژیـان تێیـدا تـەنیا یـاری و بەزمی خۆش بووە و بەس.

لەم دەقەی خوارەوەشی، شـاعیر دان بـەو ڕاسـتییە دادەنـێ، کـە ژیانی منداڵی پڕ بووە، لە خۆشی و شادی و بزە و بۆنی خۆشی ژیـان و پاکی و بێگەردی و میهرەبانی، بـەڵام بـە گـەورەبوون و هەڵکشـانی تەمەن و سەردەمی لاوییەتی، ئیـدی ئـەم خۆشـیانەش کاڵدەبنـەوە و ئـاڵوگۆڕ دەبـن و دێـن و دەچـن، چـونکە مـرۆڤ، کـە تـەمـەنی منـداڵی تێپەڕاند، ئیتر دەکەوێتە ناو خەم و ژانی ژیان و ڕامان و تێ فکرین لە شتەکانی دەوروبەری و پرسیار و گومانەکان سـەر هەڵـدەدەن، ئەمـە بۆ شاعیر و نووسەرێك چەند جارێك زیاترە، بۆیە شاعیر دەڵێ:

**((لە ئاسانەی منداڵیمدا،**

**گوڵ لە درك،**

**بزە لە فرمێسك زۆرترن...**

**لە باهۆز و ناو گێژەنی لاویەتیمدا**

**تاوێ ئەمیان، تاوێ ئەویان...)) (ئەنوەر قادر محەمـەد، زریـان و زایەڵە و زنار، ل ١٦٣).**

لەبارەی سەردەمی منداڵی و نۆستالژیادا "لۆکاچ" دەڵێ: ((شاعیر بـــەردەوام ســـەیری ســـەردەمی زێڕینـــی خـــۆی دەکـــات و لـــە بیرەوەرییەکانی سـەردەمی منـداڵی و بچـووکی خـۆی جـارێکی دیکـە تێدەپەڕێنێ))[٢٣٤] واتە، گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی لە ژیانی مرۆڤ بە گشتی و نووسەر و شاعیران بە تایبـەتی، هەمیشـە بـۆ ڕاکـردن لـە سەردەمی ئێستایە، واتە لە ئێستادا گەڕانەوە بـۆ کـاتی ڕابـردوو، بـە مەبەسـتی سـاڕێژ کردنـی برینـەکان و ڕاگرتنـی کـاتی هەنووکـەیی، ناخۆش و سوڕانەوە لە زەمەنی ڕابردوو، بەمەش پارچە پارچە بوونی کات و تێکشکانی کات ڕوودەدات و خود تێیدا، تاڕادەیەك هەسـت بـە شـانازی و ئاسـوودەیی دەکـات لـە سـەردەمی ڕابـردووی منداڵیـدا. شاعیر، دەڵێ:

**((تەمەنی خەستی سەر پەنجەرەی دڵی ماتم نەچوو بۆوە**

**وێنەی کاڵی مناڵیمم لێ ئەنەخشان**

**نە شبوو بوو بە شەستە باران**

**وتیـان ئـەها! وا برووسـکە ئـەو هـەورە نەزۆکـەی سـووتان..))**

**(ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ٥٤).**

(٢٣٤) رابرت سەید و میشل لـووی، رمانتیسم و تفکـر اجتمـاعی، ترجمـە: یوسـف ابـاذری، مجلـەی ارغنون، شمارە (٢)، انتشارات سازمان، تهران، ١٣٨٣، ص ١٣٢.

شـاعیر لـە نـاخ و دڵ و دەروونـی تـەنیا و نامۆیـە هەسـت بـە تررووسـکایەك ناکـات، بـۆ گـۆڕینی ئـەم هـەموو ژان و ناخۆشـی و ترسـانەی، کـە وەك هـەور تریشـقە شەسـتە بـاران و هـەوری ڕەش و تاریکەی دڵ و دەروونی تەنیووە، نە دەبێتـە بـاران و دادەکـات و نـە ئـەم تەمـەش دەڕەوێتـەوە، بـۆ خـۆ ڕزگـار کـردن و گەڕانـەوە بـۆ سەردەمی شکۆ و شانازی و زێرینی خۆی، چونکە منداڵی هیچ چاودێر و یاسا و قەدەغەیەکی لەسەر نییە، چی دەکات و چی ناکات، شاعیر، بـۆ ئـەوەی هـیچ کەسـێك لێـی نەپرسـێ و لـێ پرسـینەوەی لەگەڵـدا نەکات، دەیەوێ ببێتەوە منداڵی بێ گوناهو دوور لە خەم و حەسرەت و ژان.

## گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی خەون و حەز و ئاواتی هەموو مرۆڤێکە، تا بگەڕێتەوە ئەو سەردەمەوە، بۆ ئەوەی خۆی پێ ئاسوودە بکات و ئەو خۆشیانەی لە دەستی چووە، هەر هیچ نەبێت بە بیرە خۆیان بهێنێتەوە، چونکە دووبارەبوونەوەیان لەسەر لاپەڕەی ژیان و ئەرزی واقیع شتێکی بێ سوود و خۆزگەیەکی بێ بەرە. شاعیر دەڵێ:

**((بە یەککگەیشتنەوەی من و جزدانی ئارامبەخشی دایکم**
**کۆڵانەکانی دەیگەیاندمە قوتابخانە و گورەپانی ڕوو خۆشی تۆپی پێ**
**پاشان دووکانە پڕ نهێنییە ڕەنگاوڕەنگەکانی گوندی گەنجینەی منداڵیم**
**چاوی خەون جۆگەی هاوێشت..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ١٠).**

شاعیر باسی سەردەمی منداڵی خۆی دەکات، لەو کاتانەی، کەوا منداڵ دەچێتە قوتابخانە لەناوکۆمەڵگەی کورد، وا باوە بەر لە ڕۆیشتن داوای پارە لە دایکی دەکات، وەك ڕۆژانە بۆ قوتابخانە،

ئینجا شاعیر باسی ئەو سات و زەمەنـەمان بـۆ دەکـات، کـەوا لەگـەڵ منداڵانی دیکەی گوندەکەیان چووەتە قوتابخانە و یـاری تـۆپی پـێ و بــە کۆڵانــدا گــەڕاون، وەك دەبیــنین وشــەکان پــڕ لــە نۆســتالژیا و گەڕانەوەی سەردەمی منداڵی کاتێـك ئـەم دەقـە دەخوێنیتـەوە، ئـەم دیمەنەی منداڵیت، وەك فیلمێکی دەنگی و ڕەنگـی دێتـە پـێش چـاو، دەبیتەوە بە منداڵ.

یان هەر لە ڕۆمانە شیعری "زێوان" لە شـوێنێکی دیکـەدا، شـاعیر دەڵێ:

**((وەك یەکەم ڕۆژی چوونە قوتابخانە**

**لافـاو لـەو جۆگەیـە نیشـتەوە..)) (سـەباح ڕەنجـدەر، سـی سـاڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ١١).**

**((لەسەر لێوی بەهرەمەندێکی**

**ناوچەوان بەنەخش و چەژنی جیهانی منداڵان**

**قەڵەمکێشی فڕۆکەیەکی نایلۆنم**

**وەك نیشانە جێ هێشت...**

**تۆپی یاری و فڕۆکەی نایلۆن و دەبدەبە بە هەواوە**

**سـاکاری و یادگـارین..)) (سـەباح ڕەنجـدەر، سـی سـاڵ شـیعر، بەرگی یەکەم، ل ٤٣٥).**

شاعیر لە ڕێگەی ناوهێنانی کۆمەڵێك یار و ئامێر و کەلوپەلی مندالآن و یاری منداڵ، گەڕاوەتەوە بۆ سەردەمی منداڵی، چونکە شاعیر هەمیشە حەز دەکات منداڵانە ڕەفتار بکات، چونکە شیعریش منداڵ ئاسا بە زمانێك دەدوێ یاسا نازانێ و هەر لە گڕوگاڵ دەچێ و سنوورەکان تێکدەشکێنێ، بۆیە شاعیر لە (جەژنی لە دایکبوون و فرۆکە و تۆپ و دەبدەبە و.....تاد، هەستێکی خۆش و ئاسوودەیەك وەدەست دێنێ، دڵ و دەروونی بۆ ساتێکی کەمیش بێت ئاسوودە دەکات و شاعیر نایەوێ لەم خەون و خەیاڵەی ڕابردوو بە ئاگا بێ و دووبارە بێتەوە ناو ژیانی پڕ لە ناخۆشی و نامۆیی و کێشمەکێشی ئێستای کۆمەڵگەوە. بۆیە دەگوترێت: ((گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، زیندووکردنەوەی یادەوەری ڕابردوو، بە تایبەتی یادەوەری سەردەمی منداڵی، حاڵەتێکە پەیوەستە بە بوونی مرۆڤەوە و بەبێ ویست و خواستی خۆی، زۆرجار ئەوە ڕوودەدات، کە مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی و لە یادەوەرییەکانی ئەم قۆناخە بدوێت))[٢٣٥].

(٢٣٥) عەتا قەرەداخی، لە نێوان دەنگی خاك و دەنگی ڕووحدا، لێکۆڵینەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٣، ل١٩٣.

شاعیر دەڵێ:

**((باوەشم بە کراوەیی جێ هێشت**

**ئەو جێهێشتنەی**

**منداڵییەکی خۆشە بۆ هۆگر بوونەوە..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ١٩١).**

شاعیر خۆی ئەم ڕاستییە دەخاتەڕوو، کەوا گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی و بیرەوەرییەکانی هەمیشە خۆشی و ئارامییەکی ڕووحی و دەروونی دەبەخشێت، ئەگەر لە ئاستی قووڵی دەقەوە سەیر بکەین، ئەوا وشەکان هەڵگری کۆمەڵێك لە واتا دەلالییەکانی خەم و حەسرەت و ناڕازی بوونە لە ئێستایی ئامادەیی و ڕەتکردنەوەی واقیعی هەنووکەییە و گەڕانەوەی سەردەمی ڕابردووی منداڵییە و خۆ مەلاسدانە لەناو زەمەنی ڕابردوو، بە مەبەستی خۆ دزینەوە و سارێژکردنی دەروونێکی بریندار بە خەم و ژان و حەسرەتی ژیانی خود لە ناخەوە.

## ١-٢ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سەردەمی گەنجییەتی:

سەردەمی گەنجییەتی قۆناخێك دوایی سەردەمی منداڵی و مێرد منداڵییە، مرۆڤ لەم سەردەمەدا، کانیاوی حەز و ئارەزووەکانی بەرەو هەڵکشان و بەرزبوونەوە دەچێت و گەشەی مێشك و تەنانەت لە ڕووی جەستەشەوە گۆڕانی بەسەردا دێت و ئەندێشە و خەیاڵی فراوان دەبێت، بەمەش ڕامان و تێگەیشتنی بۆ شتەکان دەگۆڕێ و هەست بە خەم و ژان و بەرپرسیارییەتی ژیان دەکات و تووشی کۆمەڵێك تاقیکردنەوەی نوێ دەبێت لە ژیاندا، بە تایبەتی لەبارەی بابەت و باسی عەشق و خۆشەویستی و نیشتیمان و شانازی کردن بە خود.....تاد. هەر ئەوەشە وای لە زۆربەی شاعیران و نووسەران کردووە، دوای ئاوابوونی مۆمی تەمەن و هەڵکشانی تەمەن و کاتێك پایزی تەمەنیان بەرەو زەردی دەچێ، بە کوڵ بۆ ڕۆژانی گەنجییەتی و تاقەت و هێزی ئەفسووناوی بگرین و شکۆ و شانازی پێبکەن و وەك پاڵەوانێك باسی خۆیان بکەن، بێگومان ئەگەر ڕابردوویان پڕ شانازی و چاکە و جوامێری و هەڵوێست بێت، ئەگەر نا بە پێچەوانەوە گەڕانەوە و باسکردنی ئەو سەردەمە، دەبێتە هۆی خەم و حەسرەتخواردن و ژانی بێ دەرمان و ئێشی نەبڕاوە، چونکە

پەشیمانن لە کار و کردەوە خراپەکانیان، جا بەهەر جۆرێك لە جۆرەکان بێت، چ وەك پاڵەوان و خۆشی و شادی و بەختەوەری.....تاد، چ وەکو پەشیمانی و خۆزگە و حەسرەت و ناڕەحەتی و ژانی نەبڕاوە، هەر نۆستالژیایە و هەڵگری فەزای نۆستالژییە.

## ــ نۆستالژیای گەڕانــەوە بــۆ ســەردەمی گەنجییــەتی لــە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

"عەبدوڵڵا پەشێو" وەکو شاعیرێکی پڕ لە حەسرەت و شانازی زۆربەی کات لەناو دەقە شیعرییەکانیدا، گەڕاوەتەوە بۆ سەردەمی لاوییەتی و سەردەمی هێز و توانا و جوامێری خۆی، چونکە هیچ مرۆڤێك نییە، ژیانی گەنجییەتی پڕ نەبێت لە بیرەوەری و یادگاری تاڵ و شیرین، بێگومان بۆ نووسەر و شاعیران بارەکە کاریگەرتر و گرینگترە، چونکە چاوی شاعیر چەند ڕەهەندییە و لە چەند گۆشەیەکی جیاوازەوە ژیان دەبینێت و لە خەرمانەی زەین و یادگارییەکانیدا تۆماری دەکات و هەڵی دەگرێت. شاعیر لە شیعری (پەشیمانی) دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی گەنجیەتی و ئەو کاتانەی عەشق خۆی پێدەناسێنێ و ژیانی پێ دەکاتە ژان و خەم و تاڵی عەشق، دەبێتە مێوانی هەمیشەیی ژیانی و ڕەگ دادەکوتێ، بۆیە شاعیر پەشیمانە لەو سەردشەمەی، کەوا بە نەزانی و سۆز و هەڵچوونی دڵ تووشی دۆزەخی عەشق دەبێت و دەسووتێ، ئەم گەڕانەوەیە نۆستالۆژییە، دەبێتە هۆی پەشیمانی نواندن و بەوە دەیەوێت لە داخ و حەسرەت و ناخۆشی و ژان و ئازار خۆی ڕزگار بکات، بۆیە دەڵێ:

**((من هەڵە بووم**

**لە ڕۆژانی جوانی و گەنجیم بە پەلە بووم**

**هەر نەسرەوتم...**

**بە شوێن هەستێکی ون کەوتم...**

**تاکو لە سەر سنگی نەرمی خەیاڵی پووچ**

**کپ بووم، خەوتم**

**ڕابرد گەنجی**

**تاوێك نەمدی بەری ڕەنجی**

**زۆر بەر دەرگەی نازدارێکم کوتایەوە**

**تاکوو چڵی ژینی گەنجیم ڕووتایەوە..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ٢٣-٢٤).**

شاعیر لە تەمەنی دوای گەنجی بە خۆی دێتەوە، ئینجا هەستدەکات، کە تووشی چ هەڵەیەك بووە، بەڵام پاش چی؟! ئاخر نەزانییەکەی جارانی، وای لە شاعیر کردووە، سەردەمی ژیانی گەنجییەتی پڕبێت لە ژان و ناخۆشی و چاوەڕوانی و فرمێسك و گریانی بە کوڵ بۆ یارەکەی، ئەم جۆرە نۆستالژییە، بۆ شاعیر زۆر بە ئازارە و کولانەوەی برینەکانە.

لە نموونەیەکی دیکەدا شاعیر لە (ئەگەر دیسان)دا، خۆزگەیەك دەخوازێ و داوای شتێکی مەحاڵ دەکات لە خودادا، کاتێ بە گومان

و حەسرەت خواستنەوە خەون بە تەمەنی گەنجییەتی و گەڕانەوە بۆ ئەو سەردەمانە دەخوازێ، کەوا گەنج بووە و لە حەسرەتی لاوی و هێز و تین و تاقەتی جەستەیی و جوانی و سەرسەختی و خوێن گەرمی دا بووە، ئەگەر ئەوە ڕووی دا، ئەوا هەموو ئەو کار و کردەوانە ئەنجامدەدات، کە ئەنجامی نەداون و لە دەستی چووە، ئەمجارە بە هیچ جۆرێك ڕێگە بە تاڵان و ڕەنج بە خەساری عەشقەکەی نادات و دەست بەرداری نابێ و هەموو یاسا و سنوور و هێڵە سوورەکانی ئایین، کۆمەڵگە، دابونەریت، ئابووری، سیاسی و..... تاد. دەبڕێت و باکی پێی نییە، وەك دەڵێ:

**((ئەگەر دیسان**

**خوا لاویمان بداتەوە**

**وەك خەلاٚتێکی ئاسمانی،**

**ئەگەر سروشت**

**پڕا و پڕمان بکاتەوە**

**لە کڵپە و گڕ، شێتی و جوانی:**

**ئەمجارەیان**

**لە پێناوتا**

**کام بەر حەرامە ــ ئەو دەخۆم**

**کامە یاسا ئاسمانییە ــ ئەو دەشکێنم**

**ئەمجارەیان**

**لم و لیتەی بنی دەریاش حەشارت دا**

**وەك مرواری دەرت دێنم.**

**خۆم ڕادەستی قەدەر ناکەم،**

**دنیاش دەستم لێ بەربدا**

**هەرگیز دەستت لێ بەرنادەم..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٣٤٣-٣٤٤).**

" عەبدوڵڵا پەشێو" دوای ئەوەی بە درێژایی ژیانی بۆ عەشقێکی لە دەستچوو زۆر گریا و زۆر فرمێسکی ماڵئاوایی و بەجێهشتنی لە لایەن یارەوە ڕشت و هیچ سوودی نەبوو، نەبووە دەرمانی چارەسەری برینەکانی دەروونی، ئیدی هەوڵدەدات و دەیەوێ لە تەمەنی پیری و تێپەڕبوونی زەمەنێکی زۆر بە سەر ئەم عەشقە لەبارچووە، جارێکی دیکە بە ڕووی ژیان هەنگاو بەرەو ئاواتەکان و هیوا و حەزەکانی سەردەمی لاوی زیندوو بکاتەوە، بەڵام ئەمجارە بە دیدێکی دیکە و لە فەزایەکی دیکەی ژیاندا، ئەم گەڕانەوەیە بۆ سەردەمی گەنجیەتی لە لای شاعیر، ئەمجارە بۆ ئەوە نییە خەم و حەسرەت و داخ و ژانی عەشق ملکەچی بکات و وەك کرمی دار ناخی بخوات و کلۆری بکات، بەڵکو بۆ گەڕانەوەی پێکەنین و شادی و هیوا و ئاواتەکانە:

**((گەڕامەوە بۆ تەمەنێ**

**بۆی پێکەنم، بۆم پێکەنێ**

**گەڕامەوە بۆ کۆششم**

**بۆ دەروونی پڕ شۆرشم...**

**بۆ شەوانی ئەندێشاویم**

**بۆ پەیکەری هیوای لاویم..)) (عەبدوڵلا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کڕێوە، ل ١١٢).**

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سەردەمی گەنجییەتی لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

"ئەنوەر قادر محەمەد" لە شیعری (سلێمانی)دا، ئەم جۆرە شیعرەی نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سەردەمی گەنجییەتی و یاد و بیرەوەی خۆشی لەم شارەدا، دەخاتە ڕوو، ئەگەرچی شاعیر ڕاستەوخۆ ناوی نەهێناوە، کەوا (گەنجییەتی و سەردەمی گەنجییەتی)، وەك وشە و دەستەواژەیەکی ڕووت، بەلاّم بەهۆی کۆمەڵێك وشە و دەستەواژەی دیکەوە، کە هاوواتاکانیان هەمان واتا و دەلالەتی نۆستالژیای گەنجییەتی دەگرێتەوە، چونکە مرۆڤ تەنیا ئەو شێوە خۆش و شادی و بەختەوەرییە دەروونیەیی لە گەنجییەتی دەست دەکەوێت، ئەوە جگە لە مێژووی نووسینی دەقەکە، زیاتر لە (٣٤) ساڵی بەسەردا چووە، لە ئێستادا کەواتە: شاعیر ئەو کات گەنج بووە و لەگەڵ برادەران لە سلێمانی بە خۆشی و شادی ڕای بواردووە، بەلاّم دوای چوونی بۆ دەرەوەی ولاّت و تاراوگەیی دوایی هەرەس هێنانی شۆرشی ئەیلولی ساڵی "١٩٧٤". بۆیە شاعیر دەڵێ:

**((نەبۆران و خرۆشی مۆسیقای ناو سەماگا**
**نەگۆرانیی تێکەڵی هاژەی شەوان هەستانی**
**پڕ هەرا و هوریای دەریا...**
**نەیانهەژاندم وەکو:**
**گۆرانیی ئەو کچانەی بە کۆڵی گیا و گژەوە،**
**کەژیان بەجێ دەهێشت و بەرەو دێ دەبوونەوە،**
**نم...نم بارانی دەنگیان،**
**دڵی ئێمەی کوڕگەلی ماتی دێی دەشۆردەوە..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ٩٢).**

شاعیر باسی ئەو کاتەمان بۆ دەکات، کەوا لە سەردەمی گەنجی و تازە لاویدا، وەك کوڕ و کاڵی لادێیەکەی خۆیان خۆشەویستی عەشقی ئافرەت دڵی بردووە و ڕۆژی چەندجار بە ساقەی بووە، بەلاّم ئێستا دوورە و لە تاراوگەدا بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە ڕووحییە و دەست کەوتنی خۆشبەختی و ئارامی دەروون، دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردووی ئەو زەمەنەی لە هەڕەتی لاویدا بووە.

شاعیر لە دەقێکی دیکەدا، بەناوی (ئەفسوون) خەم و حەسرەتی ڕابردووی سەردەمی گەنجییەتی دەردەبڕێت، کە ئەوسا هاوشان لەگەڵ براکەیدا، ژیانیان زۆر خۆش بوو، بەلاّم بۆ بیرهێنانەوەی لە ئێستایی نووسینی ئەم دەقەدا، شاعیر خەم و ژان بۆ ئەو کاتانە دەخوات و وەك لە دەستچوویێك باسیان دەکات، هەموو شتە ورد و

درشتەکانی یەکە بە یەکە لە بیرە، بێگومان ئەو کات و زەمەنە بەسەر چووەی شاعیر باسی دەکات، شاعیر گەنج بووە و لە سەرەتایی لاویەتیدا بووە، بۆیە دەڵێ:

**((شاری گڕگرتوو،**

**دەشتی دووکەڵگرتووت لە بیرە؟**

**ئەی لاشەی بە قەقنەسبووی "وەنەوشی" دڵدار؟**

**شەوەکەی هاوینت لە بیرە براکەم؟...**

**ئێستەش لە ئاقاری تەمگرتووی ڕۆژگاردا**

**هەر قوڕ و لیتەی مێژوو دەپێوین،**

**ئەڤین هەر ئەوە ئەبەدییەکەی جارانە**

**دنیایەك بوو لە دڵڕوونی و ئەفسوون، براکەم!)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ١٥٧).**

ئەوەتا شاعیر چەندە بە شیرینی و حەسرەت و ئەفسوونەوە، باسی ئەو ڕابردووەمان بۆ دەکات، کە لەگەڵ براکەی لە تەمەنی گەنجی و لەتەکیە و مزگەوتی باوکیدا بە سەریان بردووە و شاعیر، وەك فیلمێکی سینەمایی، نمایشی دەکاتەوە، بەلام بە لە دەستچوونیان، بۆ ئێستا خەم و ژان و حەسرەت دروست دەکات.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سەردەمی گەنجییەتی لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سەردەمی گەنجیەتی لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا، بە شێوەیەکی زۆر ئاشکرا و بەزەقی دیارە، بە تایبەتی دوای ئەوەی شاعیر بەهۆی تێکچوونی بارودۆخی سیاسی عێراق و تێکدانی گوندەکانی کوردستان و خاپوورکردنیان، گوندی سەردەمی منداڵی و لە دایکبوونی شاعیریش، یەکێك بووە لەم گوندانەی بێبەش نەبووە لەم شاڵاوی خاپوورکردن و ڕاگواستن و لەناو بردنەی ڕژێم، بۆیە بە ناچاری ڕوو لە شاری هەولێر دەکەن و ژیانێکی دیکە و سەردەمێکی دیکەی ژیان بۆ شاعیر دێتە ئاراوە، واتە گەڕانەوەی سەردەمی گەنجیەتی شاعیر و بیرەوەرییەکانی لە شاری هەولێردا تۆمار دەکات و لە یاد و بیرەوەری و زەین و ئەندێشەی شاعیر دەمێنێتەوە و دەبێتە بناخە و سەرمایەکی بەبرشتی شاعیر و دەقە داهێنەرەکانی و سێبەری بە ئاشکرا و بە نهێنی لەناو دەقەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە.

ئەوەتا شاعیر دەڵێ:

**((گەنجییەتی بەدوا دا گەڕانی خۆشنوودی..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل٨٣.)**

شاعیر سەردەمی تەمەنی گەنجییەتی بە سەردەم و کاتێکی خۆش و لاساری دادەنێ، لاساری بەو مانایەی لەم سەردەمیدا، گەنج حەز بە زۆر شتی شاراوە و نهێنی دەکات و هەمیشە خۆی لە نهێنییەکان و گەڕان بەدوای دۆزینەوەی خۆسەلماندن و خۆنواندنی لە ڕادەبەدەرە، بە تایبەتی ئەگەر عاشق بێت و بۆ ڕازی کردن و ڕاکێشانی سەرەنجی یارەکەی هەمیشە نمایش دەکات، کەواتە شاعیر دەیەوێت بڵێت: گەنجییەتی و گەڕانەوە بۆ یاد و بیرەوەری ئەو زەمەن و کاتانە وا لە مرۆڤ دەکات، هەست بە خۆشی و ئارامی و بەختەوەری بکات، بۆیە لەلایدا پەسەند و قبووڵە، هەروەها شاعیر باس لە سەردەمی گەنجییەتی دەکات لەم دەقەی خوارەوە، کەوا چۆن ئەو سەردەمە لە ژیانی شاعیریدا، بووەتە هۆی پێگەیاندن و پەروەردەکردنی لایەنی ڕۆشنبیری و زانیاری شاعیر و لەتەمەنی ئێستایدا، سوودی زۆری لێوەرگرتووە، کە دەڵێ:

**((گەنجیم باوەشێ بیرەوەری بوو**

**بوو بە پەند و حیکمەت..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ٧٨).**

"سەباح ڕەنجدەر" لێرەدا، بە پێچەوانەی "عەبدوڵڵا پەشێو"ە، سەردەمی گەنجییەتی بۆ ئەو بووەتە مایەی پەند و حیکمەت و یاسا و ڕێسایەك لە ژیانی ئێستایدا پەیڕەویان دەکات و هەوڵدەدات ئەو بیرەوەریانەی خۆش و ئارامبەخشن، هەمیشە لە بیر و یادەوەرییان بمێنێتەوە، بەڵام ئەم سەردەمەی (گەنجییەتی) بۆ "پەشێو" مایەی خەم و ژان و ئازار دانییەتی.

شاعیر لە کتێبی (شەڕی چڵ ساڵە) و لە شیعر (گەنجی/توانا)دا، بە شێوەیەکی ڕەمز ئامێز و ناڕاستەوخۆ باسی سەردەمی گەنجییەتی خۆی دەکات، لەوەدا هەست بە شانازی و ئەو توانا و هێز و تینەی خۆی دەکات و بە گەڕانەوە و باسکردنی جارێکی دیکە، خۆشحاڵ و شادمانە، چونکە لە سەردەمی گەنجییەتی شتێکی وایی نەکردووە، پێی خراپ و مایەیی شەرمەزاری شاعیر بێت، بۆیە هەستی شانازی و قارەمانییەتی لەناودێرەکانی شیعرەکە و وشەکاندان بە شێوەیەکی دەلالی دیارە و هەستیان پێ دەکرێت، بۆیە دەڵێ:

**((مانگی چواردە کە بەتوندی تەمی چەور لادەدا**

**لەخۆباییبوون و خرۆشی هێزی زۆری نییە**

**بە دوای توانای خۆیدا**

**تریفەی پڕناساندنی شوێن و بلوور و پۆلایە**

**تۆوی بەهرە و دۆزینەوە دەوەشێنێ..))** (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ٤٨٢).

شاعیر لەم شیعرەدا، لە ڕووناکی و هێز و توانا و پەرش و بڵاوکردنەوەی ئەم ڕووناکییە و گەیاندنی ئەو هەموو بەهرە و توانایەی لەسەردەمی گەنجییەتی هەیبووە. بۆ ژیانی کۆمەڵگە، خۆی دەکات بەمانگی چواردە، هەروەکو ئەم قسە نەستەقە کوردییەی، کە دەڵێ:((مانگ لە چواردە بێ، حەوجەی بە ئەنگوست نییە"، شاعیر بەوپەڕی شانازییەوە، ئەو یادگاریە و بیرەوەرییەی سەردەمی گەنجی دەهێنێتەوە یادی خۆی و ئێستایی ژیانی پێ پایەدارتر و جوانتر دەکات و هەست و ڕووحێکی دەروونی و ئارامی پێ دەبەخشێ.

سەردەمی گەنجییەتی لە ژیانی مرۆڤدا زۆر پێویست و گرینگە، چونکە ئەگەر سەردەمی منداڵی و مێرد منداڵی سەردەم و قۆناخی دامەزراندن و دانانی بەردی بناخەی کەسایەتی مرۆڤ بێت و لەوێوە دەست پێبکات، ئەوا سەردەم و قۆناخی گەنجیەتی سەردەمی هیوا و هێنانەدی ئاوات و حەزەکانی ژیانە و سەردەمی پتەوکردن و دەرخستنی بەهرە و توانا و هێز و بازووی چاونەترسی و قارەمانییەتیە، لەهەموو بوارەکاندا، جا ئەوە بۆ شاعیر و نووسەر پێویستترە و ئەرك و ماندووبوونێکی زیاتر و شەونخوونی پێویستە.

## ٣-١ نۆستالژیای خەم و حەسرەت و دووری لە (یار):

خۆشەویستی و عەشق لە تایبەتمەندیەکانی دنیای مرۆڤاکانە، کە لە سەرەتایی دروستبوونی مرۆڤەوە، تاکو ئێستاش بەشێوە ڕەنگاوڕەنگ و هەستی جوان، جوان هەستی پێ دەکرێت، ئیدی لە هەموو سەردەمەکان عەشق و جوانی بەردەوام پێکەوە و تەواوکەری یەکتر بوونە. بە پێی بیروبۆچوونی "ئەفلاتوون" عەشق بریتییە لە ((بە تامەزرۆوە حەزکردن بە هەبوونی شتێکی باش بۆ هەمیشە، ئەفلاتوون ئامانجی عەشق لە جوانی نازانێ، بەڵکو لە بە بەرهەم دارکردنی جوانی دەزانێ))[٢٣٦].

عەشق ئاگرە و دڵ و گیان گڕتێ بەر دەدات و دەیسووتێنێ، عەشق خەم و ژانە، عەشق ڕووناکییە، عەشق یاخیبوون و هێز و تین و توانا و بەهرەی جاویدانی بە مرۆڤ دەبەخشێت، هەر عەشقە دەبێتە هۆی گەورەترین و کاریگەرترین گۆڕانکاری لە ژیانی مرۆڤ بە گشتی و نووسەر و شاعیران بەتایبەتی، چ لە سەر ئەرزی واقیع و چ لەناو کارەکتەر و پاڵەوان و کەسایەتییەکانی ناو چیرۆك و ڕۆمان و دەقە سەردییەکانیش بێ.

(٢٣٦) محمد مختاری، هفتاد سال عاشقانەها، تهران، ١٣٧٧، ص ٦٨.

بابەتی عەشق و سووتانی عاشقانە لە شیعرەکانی هەر سێ شاعیر "عەبدوڵڵا پەشێو و ئەنوەر قادر محەمەد و سەباح ڕەنجدەر"دا، بوونێکی کاریگەر و بەرچاویان هەیە، چونکە هەر سێ شاعیر بە تاقیکردنەوەی ئەزموونی خۆشەویستیدا تێپەڕبوون و عەشقی هەرسێکیشیان عەشقێکی بەئاکام نەگەیشتوو، شکست هێنان بووە، ئەمەش، وەك ئەزموون و بیرەوەرییەك هەندێکجار خۆش و زۆرجاریش تاڵ و خەم و ژان و سووتان و چاوەڕوانی بێ سوود و گریان و فرمێسك هەڵڕەشتن بووە، بەمەش سێبەری ئەم عەشقە لە دێڕە شیعرییەکانی هەرسێکیاندا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێ، یان ناڕاستەخۆ ڕەنگی داوەتەوە.

لە نۆستالژیای دووری لە عەشق و مەعشووق و یار"دڵبەر"دا، زیاتر باس لە بێ وەفایی و پەیمان شکێنی و حەسرەتی بوونی ڕۆژانێك لەگەڵ یار و جێگەی ژوان و وێنە و قسەی خۆش و.....تاد کراوە، ئەمانە چەند وشە و دەستەواژەیەکن، کە هەڵگری واتای نۆستالژی و گەڕانەوەی یاد و بیرەوەری نۆستالژیان.

## ــ نۆستالژیای خەم و حەسرەت و دووری لە یار لە شیعرەکانی "عەبدوڵلا پەشێو"دا

"عەبدوڵلا پەشێو" یەکێکە لەو شاعیرانەی، کەوا شیعرەکانی تەژین لە عەشق و دووری و بێ وەفایی و لەدەستدانی یار و غوربەت و غەریبی و دوورە وڵاتی و دوورە عەشقی یار، بووەتە هەوێن و ئیلهامی دەقەکانی و وزەیەکی دیکە و تام و ڕەنگ و بەرامەیەکی دیکەی، بە دەقەکانی بەخشیووە، تاکۆتایی ژیان ناتوانێ ئەم عەشقە لە بیر بکات و لە دەفتەری یادگاری ژیانیدا بیسڕێتەوە، ئەوتا لە شیعری (لە بیرت ناکەم)دا،

دەڵێ:

**((چۆن بۆم دەکرێ لە بیرت کەم؟**

**چۆن بۆم دەکرێ دڵگیرت کەم؟**

**چۆن لاپەڕەی پاکی سپی**

**هی ڕابردووی شادی و کپی**

**لوول بدەم و بیشارمەوە،**

**بەم دڵەی پڕ ئازارمەوە؟**

**هەر دوێنێ بوو، لێرانەدا؟**

**هەر لەم شوێنە وێرانەدا،**

**بە ڕابواردن، بە لێو مژین،**

**خەندمان ناسەر لێوی ژین..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ١٥-١٦).**

لێرەدا، شاعیر دان بەو ڕاستیەدادەنێت، کەوا دەردی عەشق دەردێکی پڕ لە ئازار و ژانە، بۆیە لەبیرکردنی و ئاوڕ لێنەدانەوەی کارێکی قورسە و مەحاڵە، شاعیر چۆن لەم شیعرەدا باسی ئەو شوێن و کاتەمان بۆ دەکات، کە لەگەڵ یاردا ڕای دەبوارد و چێژی لە ژیانی دڵداری وەردەگرت، ئەگەرچی ئەو ڕۆژە و لەگەڵ یاربوون لەو ڕۆژگارەدا زۆر خۆش و دنیایەکی پڕ لە مەستی ئەوین بووە، بەڵام بۆ ئێستا، کە شاعیر وەك نۆستالژیایەکی کۆن و ژوانی یار بەبیر خۆی

دەهێنێتەوە، زۆر ئازاری دەدات و هەست بە خەم و ژان و حەسرەتێکی دڵ و دەروونی داخکراو دەکات.

لەشیعرێکی دیکەدا، "عەبدوڵڵا پەشێو" داوای لێبووردن لەیار دەکات و خۆی بەتاوانبار دادەنێت، بە جۆرێك تووشی حاڵەتێکی خەمۆکی و خۆشەویستی دەبێت، بەمەش هەموو کات خۆی دەکات بە تاوانبار و کەسی بەرانبەریش بەقوربانی و تاوان لێکراو، چونکە ((کەسی خەمۆك هەستێکی ناسکی هەیە، بە ئاسانی بریندار دەکرێت و بە توندی هەست بە ئازار دەکات... خەم لێکی دەپچڕێنێ... ویژدانی ئازاردەدا...وا هەست دەکات هەڵەی کردووە و گوناهبارە لە بەرانبەر خەڵکانی دیکە...))[٢٣٧]. ئەوەتا هەمان حاڵەت لەم شیعرەی خوارەوەی "پەشێو" بەناوی (بمبورە) بوونی هەیە:

**((بمبوورە ئەی کچ، بمبوورە**

**ئەو ڕێگایەی**

**ویستم بە ئاهەنگ بیبڕم**

**یەکجار دوورە،**

**بێ سنوورە...**

**ئێستاش گیانە،**

**چەند ئازار و خەم دەچێژم،**

(٢٣٧) عادل سادق(د)، خەمۆکی هۆکار و ڕێگاکانی چارەسەرکردنی، و: شیرین عەزیز بەکر، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣، ل ١٠٥.

**چەند ئەسری بەکوڵ دەڕێژم،**

**کە پێم دەڵێی:**

**کوا، هیوامان نەهاتە جێ؟**

**بەڵام چیبکەم، چیم لە دەست دێ؟!)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کڕێوە، ل ٦٣،٦١).**

شاعیر لە ناخی خۆیدا هەست بە لاوازی و بێدەسەڵاتی خۆی دەکات، هەمیشە کەسانی دیکە بە قوربانی دەستی خۆی دەبینی و ئەوەتا شاعیر چۆن بەو دابڕان و بەیەکنەگەیشتنە تووشی خەم و حەسرەت و ژان بووە، بەڵام ئەوەی زیاتر ئازاری دەدات و لە ناخەوە دەیهەژێنێ و بارەکەی هێندەی دیکە، قورس دەکات پرسیاری یار و کولانەوەی برین و تاوانبارکردنیەتی لە بەرانبەر عەشقەکەیدا.

شاعیر ئیتر ترووسکاییەکی ئومێد و هیوای عەشقەکەیان نابینێ و پێی وایە ئیتر تەواو کاتێك دەڵێ:

**((بلێ: ئەی یاد**

**بپێچەوە بیرەوەری،**

**بیرەوەری ڕۆژانی خۆش لەگەڵ پەری..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کڕێوە، ل ١٠٣-١٠٤).**

"عەبدوڵڵا پەشێو" لە هەندێ دەقیدا، شاعیرێکی لیوان لێوە لە ڕۆمانسیزم و دەقەکانی خەرمانەیەکی بە پێز و پڕ سۆزی عەشق و خۆشی و ناخۆش و ڕەشبینییە، شاعیر شاعیرێکی یاخییە، یاخییە لە خود، یاخییە لە ژوان و عەشق و یار، یاخییە لە دەسەڵات و سیاسەت و کۆمەڵگە و دابونەریتی پاشاگەردانی و چەوساندنەوەی هەژاران و نایەکسانی کۆمەڵایەتی و.....تاد. "پەشێو" شیعرەکانی تێکەڵەیەکە لە عەشق و سیاسەت، عاشقێکی سەرسەخت و پڕە لە عەشق و ئەوین، یار و عەشقی نیشتیمانە لە ڕاستیدا (عەشق و سیاسەت) دوو ناوەرۆکی گرینگی شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"ن، بۆیە ئێمە پێمان وایە، شیعرەکانی" پەشێو" تێکەڵەیەکە لە نێوان عەشق و سیاسەت، ئاراستەکردنی بە زمانێکی لیریکی و خۆ دوور خستنەوەی شاعیر لە وتنی بابەتە حەماسیە وشکەکان، ئەمەش بووەتە هۆی جوانکردن و کاریگەری بوون لەسەر خوێنەر، چونکە گرینگیدان بە بابەتی عەشق و سیاسەت لەیەك کاتدا، بووەتە هۆی ئەوەی، وەك شاعیرێکی ناسراو لە لای چین و توێژەکانی کۆمەڵگە بناسرێت، بەتایبەتی لە لای گەنجەکان.

## ــ نۆسـتالژیای خـەم و حەسـرەت و دووری لـە یـار لـە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

"ئـەنوەر قـادر محەمـەد" خـاوەنی کۆمـەڵێك شـیعری جـوانی پـڕ عەشق و بۆنی عەشق و یاری هەیە، پەشێو ئاسا ئەزموونێکی زۆری لە هەندەران و تاراوگەدا هەیە و لەناو شیعرەکانیدا بێ وەفـایی و دووری لـەیار و تـەنیایی لـە شـیعرەکانیدا، پانتایـەکی زۆر و فراوانیـان داگـیر کـردووە، لـە سـەرەتایی هەڵدانـەوەی دیوانەکـەی (زریـان و زایەڵـە و زنــار)دا، بــە دابــڕان و دووری و دەردی نۆســتالژیای، بــە خــەم و حەسرەتی مەعشوق، خۆمان پێ دەناسێنێت. لە شیعری (پشکۆکانی ناخم)دا، دەڵێ:

**((خۆشەویستم!**
**زۆر دەمێکە دەنووکی واشەی ژانی تاڵ**
**جەرگی جەستەی چاوەڕوانیم هەڵئەدڕێ**
**زۆر دەمێکە هوزاری تاسەی دەروونم**
**ڕێبوارێکە**
**لە ساماڵی چاوەکانتا**

**بۆ ورشەی ئەستێرەی گەشی**

**هۆنراوەیەك هەر ئەگەڕێ...**

**هەر ئەگەڕێ... خۆشەویستم!)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریـان و زایەڵە و زنار، ل ٦).**

شـاعیر لـە دەسـتپێکی شـیعرەکەوە ئامـاژە بـەوە دەکـات، زۆر دەمێکــە چــاوەڕێ و شــەیدایە، لــە بــیری یادگــاری و دۆزینــەوەی یارەکەیەتی، لەناو هۆنراوەکـانی هـەر لـە گـەڕان و گەیشـتنە بـە یـار، چــۆن وەك ڕێبــوارێکی ڕێگــای عەشــق خــۆی بــۆ دۆزینــەوەی یــار تەرخانکردووە، ئاخر ڕێبوار نابێـت سـاکین و نیشـتەجێ بێـت، دەبـێ بەردەوام لە گەڕان و سۆراخی یـار بێـت، شـاعیر دەیـەوێت ئـەوەمان پێبڵێ، کە ئەو ڕێبوارەی باسی دەکات، ئەوە خودی شاعیر خۆیەتی.

شاعیر لە تەنیایی و غوربەتی بێ شـوێن و لـە تاراوگـەدا، هەرچـی شتێکی پێشتر لەلای ئەودا نرخی نەبووە، دەبنە بایەخـدارترین شـت، ئەوەی ڕۆژانێك شتی ئاسایی و مایـەی تێڕامـان و قسـە لەسـەر کـردن نەبوو، ئەمڕۆ لە تاراوگە و خاکی دووره مەفتەن و غەریبایەتیـدا، ئـەو شـتانە دەبنـە مایـەی دڵنـەوایی و خـۆ ڕزگـارکردنی خـود لـە دەسـت گێژەلوولکەی نامۆیی و غەریبی و بێکەسیدا، جـا ئەگـەر ئـەو شـتەش عەشـق و یـاد و بـیرەوەری یـار و شـوێنی ژوان و بـۆن و هەناسـەی عەشقی شاعیر بوو بێـت، بێگۆمـان حاڵـەت و دیاردەیـەکی نۆسـتالژی

زۆر خەستتر و کاریگەرتر دەهێنێتە سەر ئەرزی واقیع و تابلۆی ژیان و دەفتەر و پەرتووك و خوێنەر زیاتر و زووتر پێی کاریگەر و ڕژانی هەڵچوونی بە کوڵتر دەبێ. ئەوەتا شاعیر دەڵێ:

**((ئاگری دێهاتان خامۆش،**

**چاوی دڵداران پڕ فرمێسك،**

**تۆ چراوگی غەریبیمی**

**تۆ هاودەمی تەنیایمی**

**من چۆنت دەکەم فەرامۆش..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ١٨٦).**

"ئەنوەر قادر محەمەد" خاوەن هەست و سۆزێکی پڕ لە عەشق و جوانییە، هەمیشە خۆی لە ترۆپکی گەنجییەتی و دڵتەڕی عەشق دەبینێ، بۆیە هەمیشە داوای گەڕانەوە و گەیشتن بە یار دەکات، جارێکی دیکە، شاعیر باس لەوە دەکات، کەوا لە تەنیایی و غەریبیدا پیشەی هەر گریان و فرمێسك ڕشتن و خەم و داخی یار و عەشقی یار و دووری یارە، کە دەبێتە هۆی دروست بوونی ڕووبارێکی بێ ئامان و سەرشێت، هەر یادی یار و ناوی یار و ڕوخسار و چاوی یاری لە بیرە و بەردەوام لە ڕێگەی نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ عەشق و دووری یار، یاد و بیرەوەری ئەو عەشقە و دیمەنی یار دەکاتەوە، خەم و حەسرەت و ژان و ئێش و ئازارێکی زۆر بە شاعیر دەبەخشێت، بەڵام

شاعیر خۆی ڕازییە بەو ئێش و ئازارە، تەنیا بۆ ئەوەی لە دەست تەنیایی و ئێش و ئازاری غوربەت و تەنیایی و تاراوگە ڕزگاری ببێت، بۆیە دەڵێ:

**((منیش گیانە دووای بارانی**

**شەوانی خەم و تەنیایی**

**لە دووای تاوی تەرزەی هەنسك**

**لە دووای ئەوەی شەختەی کەوتووی**

**دەشتی هەستیم ئەتوێتەوە**

**ڕووبارێکی شێت پێکدێنم،**

**ڕووباری یاد، هینی ناوت**

**هینی چاو و کەزیی خاوت..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ٦٧–٦٨).**

شاعیر دوای ئەوەی شەوی بە تەنیایی و خەم و ئازار و گریانی بەکوڵ و سۆز و ئەندێشەی بەتاو بەسەربرد، ئەمانە ناخی دەهەژێنن و دەیکەن بەیەك پارچە ئاگر و جلی هیوا دەسووتێنێ و یەك پارچە سەهۆڵ و شەختەی بێ ئومێدی و ڕەشبینی، هەموو ئەمانە تەنیا ڕووبارێکی یاد و بیرەوەری یاریان لێ دروست دەبێت، ئەوەش نۆستالژیا و یادی دولبەرەکەی، دەیگەیننە لوتکەی بیرەوەری کۆن و یاد و ژوانی یارەکەی.

بێگومان خەم و حەسرەتی دووری یار، وەکو (دایك)، بۆ هەڵگری کۆمەڵێك مانای دەلالی، کە ویست و حەز و ئارەزوو و ئامانجی شاعیرە، بۆ گەیشتن و شادبوونەوەی لەگەڵ یارەکەی، ئەگەرچی ئەم گەیشتن و شاد بوونەوەیە لەسەر ئاستی واقیعی نییە و تەنیا بە خەیاڵ و گەڕانەوەی نۆستالژییە، بەڵام بۆ خود و دەروونی شاعیر هۆکاری خۆشگوزەرانی و ڕەوینەوەی هەستی شاعیرە. بۆیە لە شیعری (ئێوارەیە و کۆچ ئاگرە و ناکوژێتەوە) دەگاتە ئاستێکی بەرزی نۆستالژیای خەم و حەسرەتی دووری و بێ ئومێدی یار و بەو پەڕی ڕەش بینییەوە باس لەماڵئاوایی یار و ئیتر پێکنەگەیشتنەوەی دەکات.

## ــ نۆستالژیای خەم و حەسرەت و دووری لە یار لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

"سەباح ڕەنجدەر"، وەك شاعیرێکی هەشتاکان، دەقە شیعرییەکانی پڕن لە عەشق و ئەوینی یار و دووری و غوربەتی عەشق، نۆستالژیای خەم و حەسرەت و ژانی عەشق لەلای شاعیر لە دەقەکانیدا، دوای ناسینی کچێکی ناسك و نەشمیلانەی شاری هەولێر لە سەرەتایی سەردەمی گەنجییەتی دەست پێدەکات، کە ئەوسا یەکتر دەناسن و هەناسەی عەشقیان ئاوێزانی یەکتر دەبێ و بناخە و ڕەگی لە دڵ و ناخی و بیرەوەری شاعیر دادەکوتێ و دەبێتە بەشێك لە ئەزموونی ژیانی، ئەوەش بە شێوەیەکی بەرچاو لە ڕۆمانە شیعری (زێوان)دا، بوونی هەیە و دیارە. دەڵێ:

**((نواڵە ئەی خانەدان**

**سێبەر و هێشووی درەختی من**

**دەتوانی پرچی بلاوت**

**لە ناوەندی سەرت کۆ کەیتەوە گەشتم لەناو تەواو دەبێ..))**

**(سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل١٤،١٥)**

شاعیر لە یەکەم دەرکەوتنی سێبەری عەشق و یارەکەی لەناو ئەم دەقەدا پێمان دەناسێنێ، کە ناوی (نواڵە)یە، هەروەها شاعیر دەڵێ:

ئەوەی یار و ئەوینی شاعیرە، کچێکی (خانەدان)ە، کەواتە شاعیر لە یەکەم ناسیندا وای کەوتووەتە بەرچاو، کە ئەو کچە پاك و جوان و خانەدانە، بۆیە شاعیر عەشقی دەبێت و هەمیشە ئەم عەشقە، وەکو سێبەر بووەتە چەتر و داپۆشینی ئەو، شاعیر دەیەوێت بڵێ: ئەزموونی ژیانی من و بەشێکی زۆری بەرهەمەکانم بەهۆکاری ئەو عەشقەی سەرەتایە، کە(نواڵە)یە، دەزانم.

هەروەکو لە هەمان دەقدا ڕۆژی یەکتر ناسین و یەکەم گۆڕینەوەی نیگا و بەستنی پەیوەندی و پەیمانی عاشقانەمان پێدەڵێ و ئەوەش مانای ئەوەیە، شاعیر ئەو ڕۆژە خۆشە و مێژووییە لە بیر ناکات، تا لە ژیاندا ماوە، بۆیە ڕۆژ و مانگ و ساڵەکەی، وەك هەڵکۆڵینی نەخشەی سەر بەرد لە زەین و مێشك و ئەندێشە و یادەوەری خۆی نەخشاندووە و دەڵێ:

**((لەوەو پێشیش گەیشتبوومە دڵنیایی**

**نواڵە بۆ هەمیشەیی دەمکاتە دۆستی بێهوودەیی**

**سبەینەی ٣١ی ٣ی ١٩٨٣ لە درەختی شانازیم خوارد..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ٣٥).**

شاعیر ئەوسا دڵنیایە، لەوەی کەوا دڵدارەکەی بۆ هەمیشە و تاکۆتایی دۆست و یار و هاوسەفەری عەشق و ژیانی نابێت، چونکە شاعیر دووجار لەوە دڵنیایە ئەوەتا، خۆی دەڵێ: (لەوەو پێشیش

گەیشتبوومە دڵنیایی)، کەواتە ئێستاکەنا، بەڵکو پێشتر دڵنیابووە، هەروەها شاعیر هەست بە خۆشی و شادی و شانازییەکی زۆر دەکات، کاتێ خەڵاتی عەشقی، وەکو خەڵاتی (نۆبل) دێتە پێش چاو بگرە زیاتریش، دەڵێ: (لە درەختی شانازییم خوارد). بۆیە ئەو کاتی یەکترناسینە ڕۆژێکی خۆش و ئارامبەخش بووە، هەر کاتێ شاعیر بۆ ئەو مێژووە، بگەڕێتەوە ئەو ڕۆژەی بە بیردێتەوە و حاڵەتێکی نۆستالژی بۆ دروست دەبێت و دەبێتە بناخەی بنیاتی بەشێکی زۆری دەقەکانی شاعیر و لەگەڵ خوێن و جەستەی تێکەڵ دەبێت، چونکە مرۆڤ هەزار جار عاشق بێت و بەم ئەزموونەدا تێپەڕببێت، ناتوانێت عەشقی یەکەم و یەکەم ژوانی دڵداری لەبیربکات و لە دەفتەری یادەوەری بیسڕێتەوە. دەڵێ:

**((لەناوقردێلەی پرچی نواڵە دەردێم**

**لە قەڵای حیکمەت تەماشای مانگ و کانی دەکەم**

**لە کوێ دەبریسکێنەوە..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ٢١).**

ئەگەر سەیری ئەم دەقە بکەین، دەبینین شاعیر لە سەرەتای عەشقەکەیدایە و زۆر شانازی و نازناوی گەورە دەداتە پاڵ عەشقەکەیان، دەبینین شاعیر بەهۆی ئەو عەشقەوە بەرز دەڕوانێ و لەسەر قەڵای حیکمەت و شانازییەوە سەیری مانگ و کانی دەکات،

بێگومان ئەم دوانەش ئاماژە و هێمایی جوانی و پاکی و ڕووناکین، لە ئاستی قوولّی دەقەکە ئەگەر ڕاڤەیەکی دیکەی بۆ بکەین شتێکی دیکەمان، بۆ ئاشکرا دەبێ ئەویش ئاستی خوێندەواری و نەخوێندەواری نواڵە و قۆناخی خوێندنییەتی، شاعیر باسی (قردێلەی پرچی نواڵە)مان، بۆ دەکات ئەوەش نیشانەی ئەوەیە، کەوا یارەکەی شاعیر خوێندەوار بووە و لە یەکێك لە قۆناخەکانی خوێندن بووە، چونکە لەو کاتی و ئێستاش قوتابی کچ دەبوو، دەبێت (قردێلە)، ببەستێت و پێی بناسرێت، کە قوتابیە، کەواتە خۆشەویستی شاعیر خوێندەوار بووە و قوتابی بووە، لە کاتی ناسین و ژوانەکانی شاعیر. هەر لە دەقێکی دیکەدا، شاعیر (نواڵە) بە فریادڕەس و ڕێنیشاندەری خۆی دەزانێت، پێی وایە ئەوە، ئەو عەشقەیە پەردەی ناخۆشی و تاریکی لەسەر دڵی شاعیر لادەدات و وەك پشت و پەنایەك بۆ شاعیر وایە، بۆیە شاعیر لەم گەڕانەوە نۆستالژیە داوا لە یارەکەی دەکات، کەوا ئیتر، وەکو جاران پشت و پەنای بێت و بە ئاگری نەسپێرێ، دەڵێ:

((بە ئاگرم مەسپێرە

پشت و پەنایەکم هەیە

هەمیشە بە بیر خۆمی دەهێنمەوە..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل ٢٦)

دیارە عەشق و ئەوینی شاعیر و (نواڵە)هێندە درێژەی ناکێشێت و دەبێتە یادگاری و دابڕان و لێك دوورکەوتنەوە، ئەوەش وا لە خودی شاعیر دەکات، لە هەست و نەستی خۆی و لەناو ئەندێشە و خەیاڵی گەڕانەوە بۆ ڕابردووی خەم و ژان و عەشق و ژواندا بە دوای دابگەڕێت، بۆیە شاعیر لە ڕێگەی وێنەکانییەوە، کە وەك بیرەوەری و یادگاریەکی دلداری لە لای ماوە، یاد و بیریان دەکاتەوە.

## ٤-١ نۆستالژیای خەم و غوربەتی نیشتیمان:

گرینگترین و بەژانترین ئەزموون، کە ژیان قورس و ناخۆش دەکات، تەنیایی و غوربەتە. ژیان لە دەرەوەی ولاَت و هەستکردن بە پەیوەست بوون بە شار و ولاَت و گوند و گەڕەك و هەموو کوچە و کۆلاَنەکانی ولاَت، دەبێتە پارچەیەك لە بەهەشت لە دید و ئەندێشە و خەیاڵی شاعیر لە تاراوگە و خاکی غەریبیدا، هەموو شتێك (با)یەك، هەناسەیەکی یار، نیگایەك، بۆنێك و.....تاد، هەموو ئەمانە بۆ شکاندنی تاسەی دوور و پڕکردنەوەی ئەم حەسرەتە، لەلای شاعیر مایەیی تێڕامان و پیرۆزی و دڵدانەوەیەتی.

بە پێی بیروبۆچوونی دەروونناسان، خەمی غوربەت حاڵەت و خەم و ژانێکە، کە بە هۆی جیابوونەوەیەکی دوور لە چاوەڕوانی، یان چاوەڕوانکراو لەماڵ و ژیان و ولاَت دروست دەبێت. بە واتایەکی دیکە، ((هەستی غوربەت حاڵەتێکی هەڵپرمان و بزوێنەری و ناسراوی هەیە، پیشاندەری غەمگینییە، حەزکردن بە گەڕانەوە بۆ ماڵ و ماندووبوون لە بیرکردنەوە و خەون و خەیاڵی ماڵەوە و زێد و گوند و

شار و وڵاتەکەی، دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە لە خۆشەویستان و شوێنە ئاشناکان))[238].

شاعیر و نووسەر هەرکاتێك بەرهەمەکانی خۆیان تێکەڵ بە هەست و سۆز و خولیای دڵتەنگی لە حەسرەت و دڵەڕاوکێ بۆ وڵاتی خۆیان بکات، بە کەسێکی دڵتەنگ بۆ وڵات و خەم و حەسرەتی نیشتیمان و دوور لە مەفتەن ناوزەد دەکرێت، بەواتایەکی دیکە، لە ئەنجامی ((زانیاری و هەستی نەتەوەیی، بەرهەمێکی خۆماڵی نەتەوەییانە دێنێتە بەرهەم و ڕوو لە هەموو بەشەکانی ئەدەب دەکات))[239]

شاعیرانی کورد و نووسەرانی، چ شاعیرانی کۆن و چ شاعیرانی هاوچەرخ و نوێ بەرهەمەکانیان، بێ بەش نین لە دەقی بەرگری و ناسیۆنالیزمی کوردی، تەنانەت ناوەرۆکی زۆرێکی بەرهەمەکانیانی تەنیوەتەوە و پێکهێناوە. ئەم سێ شاعیرەی ئێمە وەرمانگرتوون و کاریان لەسەر دەکەین بەرهەمەکانیان پڕن لە غوربەت و دووری نیشتیمان و گریان و فرمێسك ڕشتن بۆ خاك و خۆڵی وڵات و ئاو، کانی، دەشت، دەر و چیا و سەرجەم کون و قوژبنێکی ئەم وڵاتەی کە لێیەوەی دوورن.

---

(238) Archer,J. Amus,S.L.Broad, H.& currid.L.Duration of Home sickness scale.British journal of Psy Schology,1998, P: 407 .

(٢٣٩) عەبدوڵڵا ئاگرین(د)، کاریگەری بیری نەتەوەی لە گەشەسەندنی کورتە چیرۆکی کوردیی کوردستانی عیراق (١٩٦١– ١٩٧٠)، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٩، ل ٤٣.

## ـ نۆستالژیای خەم و غوربەتی نیشتیمان لە شیعرەکانی "عەبدوڵلاّ پەشێو"دا

"عەبدوڵلاّ پەشێو" یەکێك لە شاعیرە دیار و بەرچاوەکانی ئەدەبی کوردییە، کەوا نۆستالژیای خەم و غوربەتی دووری لە نیشتیمان و زێد پێکهاتەیەکی سەرەکی و تەواوی دەقەکانی شاعیری پێکهێناوە، هەر ئەوەشە وایکردووە، پەشێو بە شاعیرێکی ناسیونالیزمی کوردی و عەشقی نیشتیمان بناسرێت و زێد و وڵات بووەتە ناونیشان و دید و ئایدیای شاعیر، نیشتیمان بووەتە خوێن و بەناو دەماری شاعیردا هاتوو و چوو دەکات، ئەوتا شاعیر لە شیعری (نەورۆزی ١٩٧٩)دا، ئەم حەسرەت و غوربەتی وڵاتە و نۆستالژیایە زۆر بە زەقی دیارە و بە دەروونێکی شڵەژاو و نائارامەوە، دەڵێ:

**((با تێر خەو بێ**

**سوێندم بە چیا خواردووە،**

**کە کوردستانە دوورەکەم**

**بە گەرمێن و کوێستانەوە**

**بگوازمەوە بۆ غەریبی ـ بۆ ژوورەکەم)) (عەبدوڵلاّ پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ٤٣٨)**

شاعیر لەم غوربەتە، نەك هەر تەنیا گوندەکەی، یان گەڕەك و شارەکەی، بەڵکو ئامادەیە بۆ شادبوونی دڵ و دەروون و ئارامی و بەختەوەری ڕووحی خۆی هەموو کوردستان بە گەرمێن و کوێستانەوە لەناو دڵ و دەروونی خۆی جێبکاتەوە، چونکە تاسەی دووری بەوەنەبێت ناشکێت، ئاخر کۆستی شاعیر و خەم و ژانی دووره وڵاتی ئەوەندە گەورەیە، بە هەموو کوردستان ناڕەوێتەوە و ئۆخەی ناکات.

"پەشێو" لە شیعری (ئەگەر ئەمجارە بێمەوە)، تاسەی دووری و خەم و ژانێکی وا بەڕوونی دیارە، چۆن سۆز و هەستی نیشتیمان، وا لە شاعیر دەکات ئەگەر ئەمجارە هاتەوە، نەك تەنیا بە ناو شار و زێد و گەڕەکەکانی خۆیدا گوزەردەکات و یادیان دەکاتەوە، بەڵکو ئەوەندە ئەوین و تامەزرۆی خاك و بۆنی نیشتیمانە، ئامادەیە دار و بەردەکانی و هەموو شتێکی نیشتیمان بە زمانی بلێسێتەوە و ماچی بکات و تاسەی دووری و بێ وڵاتی و غەریبی خۆی پێ لە یاد بکات. بۆیە دەڵێ:

**((ئەگەر ئەمجارە بێمەوە**

**لە گۆی مەمکی هەرکانییك**

**قومە ئاوێك دەخۆمەوە،**

**گشتیان دەکەم بە دایکی خۆم...**

**ڕێم بکەوێتەوە بێرکۆت**

**لێشم بدەی،**

**لێشم حەرامەکەی شیری خۆت،**
**من بە تەشییەکەی منالّی دەڕێسمەوە**
**دار، بەرد، گلّ، قوڕ...**
**چیم بێتە ڕێ دەیلێسمەوە..!)) (عەبدوللاّ پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ٣٤٢،٣٤٦).**

"عەبدوللاّ پەشێو" لە ڕێگەی هەڵچوونی هەست و سۆز و دەروونی خۆیەوە، ئەم تراژیدیایەی خەمی نیشتیمانی دەهێنێتە بەرهەم، وێنەی دایکی لە وێنەی دایکە نیشتیماندا بەکاردەبات و دایدەمەزرێنێت، لێرەدا شاعیر دایکی یەکەمیش، کە دایکیەتی، دەکاتە قوربانی دایکی نیشتیمان، ئەوەتا ئەگەر دایکی شیری خۆشی لێ حەرام بکات و وەکو جاری جاران و مندالّی بەشی هەر لێدان بێت، بەلاّم تەنیا با بە ولاّت و زێدی خۆی ئاشنا بێتەوە، بە تایبەتی شوێنی سەردەمی ژیانی و زێدی خۆی، کە (بێرکۆت)ە، کەواتە دلّۆپە فرمێسکەکانی دەبێتە لافاوێك، کە بەردەوام خۆزگە دەخوازێت، بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی، کە عەشقی دلّدار و عەشقی نیشتیمان، هەمیشە بوونێکی پاسیڤی و بەردەوامی هەیە لەناو شیعرەکانی پەشێودا، بەلاّم "پەشێو" بەردەوام عەشقی نیشتیمان و خەم و ئێش و ئازاری ولاّتەکەی پێش عەشق و ئەوینی دلّدارەکەی خستووە، ئەمەش لە بەرهەمەکانیدا دیار و بەرچاوە، چونکە ((لەلای پەشێو زۆر

چەڵان خاسەڕەنگی ئـەم دوو عەشـقە ڕەنگـی نۆستالژیاشـیان تێکـەڵ دەکرێت و حەسرەتەکانی شاعیر دەنوێننەوە، نۆسـتالژیا لـە شـیعر و ڕووحییەتی پەشێودا شوێنێکی بەرچاوی هەیە...))[٢٤٠].

"پەشێو" هەمیشە لە غوربەتدا بە دوایی شوناسی ڕووحـی خۆیـدا گەڕاوە و هەوڵی دۆزینەوەیەتی، چونکە "پەشێو" شوناسی نیشتیمان دڵ و ڕووح و هەناسەی لە کوردستان نەبێت دەست ناکـەوێت، شـاعیر ئەگەرچی لە تاراوگـە و وڵاتـی سـپی و بـەفر و کچـی جـوان و ئـازادی هەموو شتێك فەراهەم و لەبەردەستە، بەڵام بۆ شاعیر پولێکی سووتاو ناهێنێت، چونکە "پەشێو" بە ڕووح و بەدڵ غەریبە، غەریبی مەفتـەن و نیشتیمانە، ئەگەرچی بە جەستە لە تاراوگەیـە، بـەڵام دڵ و خـەم و ژانی هەر لە کوردستانە و خەم و ژان و حەسرەتی وڵات و دوور بـوون لە خاك، موویان سپی کردووە، هەر ئەمەش وای لـە شـاعیر کـردووە، ترسی مردنی لێ بنیشێت، نەك لەبەر ئەوەی تەمـەنی تـەواو لـە مـردن بترسـێ، بـەڵکو دێوەزمـەی غوربـەت وای لـە شـاعیر کـردووە، زراوی بڕژێ، ترسـی ئـەو لەوەیـە پـێش مردنـی نـەتوانێت بـە زێـد و خـاك و نیشتیمان و ئازیزان شادبێتەوە. لە شیعری (ترس) هەست بـەم تـرس و دەروونە نائارام و پارچەپارچە کراوەی شاعیر دەکەین، کە دەڵێ:

---

(٢٤٠) کامەران جەوهـەری، پەشـێو لـە نێـوان عەشـق و نیشـتیماندا، عەبـدوڵڵا پەشـێو شـاعیرێك لـە ڕەگـەزی سـەربزێوی، کۆکردنـەوە و ئامـادەکردنی: زیـاد نـادر عـاڵڵایی، چـاپی یەکـەم، چـاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣، ل ١٢٠.

**((منیش زراوم ڕژاوە**

**دەترسم لە سەرەمەرگا**

**سییەکانم بزریکێنن**

**بۆ تۆسقاڵێك هەوای وڵات**

**دەترسم، بمنێنە خاکێك**

**نە من ئاشنای بۆنی ئەو بم**

**نە زمانم ئەو تێی بگات!)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل٧٥).**

وەکو دەبینین شاعیر ترسەکەی ترسێکی دەروونی مەرگ ئاسا نییە، بەڵکو ترسێکی نیشتیمان و ترسی مردنە لە وڵات وخاکی بێگانە و غەریبستان، ئەویش (نالی، حاجی) ئاسا، غوربەت و بێ خاکی ئەوانی هەر لە بەرچاوە و وەکو هەست و نەستێکی خودی ڕەنگی داوەتەوە.

## ـ نۆستالژیای خەم و غوربەتی نیشتیمان لە شیعرەکانی " ئەنوەر قادر محەمەد"دا

"ئـەنوەر قـادر محەمـەد"یـش، بەهـەمان شـێوەی "پەشـێو"ی شاعیر، ئـەزموونێکی تـاڵ و ناخۆشـی لـە وڵاتـی غـەریبی و تاراوگـەدا بەسەربردووە، بۆیە تاڕادەیەك خەم و غوربەتی نۆستالژیای نیشتیمان و بـۆنی غـەریبی لـە لای هـەردووکیان لێـك نزیکـە و وێکچـوون لـە نێوانیاندا هەیە، بەڵام هەریەکەیان بە شێواز و زمانی تایبـەتی خۆیـان ئـەم ئەزموونـەیان تـەوزیفی نـاو دەقـەکانیان کـردووە و سـوودیان لێبینیوە، "ئەنوەر قادر محەمەد"یش بەردەوام لـە تاراوگـەوە چـاوی نیگای لە وڵات و شارەکەیەتی، کە (سلێمانی)یـە، ئـەوەتا شـاعیر لـە شیعری (شەستە) نووسیویەتی:

**((هەروەك باران، بە بەهاران**

**لە پشتی شاخەکانەوە، دێت و بەسەر**

**سلێمانیدا دادەکا...**

**ئاوەهاش سۆزی غەریبی**

**هەموو ساتێ،**

**لەناو دڵی ماتی منـدا، شەسـتەدەکا..))** (ئـەنوەر قـادر محەمـەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ٩٧).

شاعیر گریان و ڕشتنی فرمێسك و ئەشکی چاوی زیاتر، لەو بارانە و بارینی بەسەر چیاکانی سلێمانی، بۆ یاد و غەریبی وڵات و سلێمانی، واتە دڵی شاعیر، بووەتە چیا و دەشت و دەری باران باریوی خەم و ناخۆشی و دڵ و دەروونی شاعیر، بەڵام ئەم باران و فرمێسکەی شاعیر لەناو دڵیدا بوونی هەیە، زۆر بە کوڵتر و کاریگەرترە، چونکە ئەگەر بارانی سروشت ئاسایی بێت و بۆ ئاودان و گەشانەوەی سروشت بێت، ئەوا بارانی دڵ و دەروونی و عەشقی غوربەت و سۆزی نیشتیمانی شاعیر، بووەتە شۆستە و قۆناغی بارانی تێپەڕاندووە.

شاعیر لە شیعری (لەشەمەندەفەردا)، دان بەو ڕاستیە تاڵە دادەنێت، کە ئەگەرچی لە خۆشترین و جوانترین شاری جیهانە، کە (مۆسکۆ)یە، بەڵام بۆ شاعیر هیچ کات مایەی خۆشبەختی و ئارامی ڕووحی شاعیر نەبووە، شاعیر گوند و شارە کەلاوەکەی خۆی پێ زۆر باشتر و خۆشترە لە مۆسکۆی شاژن، چونکە هەناسەیەکی وڵات هیچ کات ناگۆڕدرێتەوە، بە خۆشترین و جوانترین وڵاتی دنیا، ئەوەیە مرۆڤ والێدەکات، ئەگەر وڵات هیچ تروسکایەکی تێدا نەبێت، بەڵام هەر ئاوات و خۆزگەی مرۆڤی دوورە مەفتەن و غەریبە، شاعیر دەڵێ:

**((ئاخۆکەی بێ بەرەو هێلانەی سووتاوم،**

**بەرەو شاری خۆم ئاسایی ڕاونراوم**

**دوا ماڵئاواییت لێ بکەم؟!**

**ئەی هاودەمی شەوانی شین و گریانم!**

**ئەی شاژنم مۆسکۆی جوانم..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ١٣٤-١٣٥).**

"ئەنوەر قادر محەمەد"، وەك هەر نووسەر و شاعیرێکی دیکەی، ئەم جیهانە ترسی مردن و نەگەڕانەوە لە وڵاتی غەریبی هەیە، هەر ئەوەشە وای لە شاعیر کردووە، بە دەروونێکی شڵەژاو و بەوپەڕی ترس و نیگەرانیەوە، کە دەنگی غەریبی لەناو دێرەکانیدا خۆیمان نیشاندەدات و لەگەڵمان دەدوێت و سکاڵا و ناڕەزایی و ترسی خود و نیگەرانی خودمان پێ دەناسێنێت، کە شاعیر خۆیەتی، دەڵێ:

**((من نامەوێ لە وڵاتی غەریبیدا سەری تاسەم بنێمەوە**

**من دڵ... دڵم لە بووەتەی لەشما غەریبە..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ٤٩).**

ئەوەتا شاعیر بە پاڕانەوە و ڕووی دەمی لە خودا دەکات و بە تکاوە داوای لێدەکات، لەم غەریبی و غوربەت و بێ نیشتیمانییە نەمرێت، چونکە برین و چاڵی دڵ لە غەریبی و تاراوگەیدا ئەوەندە قووڵە، ناتوانێت سارێژی بکات، تەنیا خاك و خۆڵی وڵاتەکەی ئەم برین و چاڵە پڕدەکاتەوە و سارێژی دەکات.

## - نۆستالژیای خەم و غوربەتی نیشتیمان لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

نۆستالژیای خەم و حەسرەت و ژان و ئێش و ئازاری وڵات لە لای شاعیرێکی، وەك "سەباح ڕەنجدەر"دا، جیاوازە و ڕوانگە و دید و دیدگایەکی دیکەی هەیە و غەریبی و غوربەتەکەی غەریبی و غوربەتی ناخ و تەنیاییە، بە تایبەتی ئەو کاتەی، کە لە زێد و گوندەکەی خۆیان (دەربەندی گۆم)دا، دوور دەکەوێتەوە، چونکە لەسەر دەستی ڕژێمی پێشووی عێراق کەوتە بەر شاڵاوی وێرانکردن و ڕاگواستن، بەمەش شاعیر و خانەوادەکەی دەگوازنەوە بۆ شاری هەولێر، بۆیە شاعیر بەردەوام دەگەڕێتەوە بۆ زێد و ئەو شوێنەی تێیدا لە دایکبووە و سەردەمی منداڵی تێدا بەسەر بردووە، هەروەها ئەم گەڕانەوە و غوربەتە زیاتر لە ڕۆمانە شیعری (زێوان) بە ئاشکرا دیارە، پێکهاتە و بنیاتی دەقەکەی پێکهێناوە، دەڵێ:

**((چاوەڕوانیم دەکوژم**

**تا مردن لەوێ**

**لە وڵاتی خەون دەژیم**

**گیان ڕووناکەکانی ژێر سێبەری دێرینترین خانووی**

**گوندی گەنجیەنی منداڵیم**

**برادەری خدری زیندەن..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ٧٠).**

شاعیر لە دووری گوندەکەیدا، گەنجینەی منداڵی ئەو گوندە بووەتە نەخشە و بیوگرافی ڕووحی شاعیر، لە دوولایەوە شاعیر خۆی بە غەریب و تەنیا دەزانێت، هەمیشە بۆنی خاك و خۆڵی گوندەکەی لەناو جەستەیدا دەپڕژێنێ و دڵی خۆی پێ بۆنخۆش دەکات، چاوی لەوەیە و پێی وایە ڕۆژێك لە ڕۆژان بچێتەوە ئەم گوندە و لەوێ لەگەڵ خاکدا لە پێشوازی مەرگدابن، هەر لەوێ ژیانی کۆتایی بەسەر ببات و وەك وەفا و هەستێکی خۆش و ئارام، بۆیەشە، خەسڵەتی خدری زیندە، کە نەمریی دەبەخشێ بە گوندەکەی دەدات، چونکە شاعیر ئەو گوندەی لەلا نەمرە و هیچ کات وێنە و یادی ئەم گوندەی بە تێپەڕبوونی زەمەن لا کاڵ نابێتەوە، بەڵکو هەستی خەم و غوربەت و تاسەی شادبوونەوە بەو گوندەی زیاتر و بەهێزتر دەبێت.

"سەباح ڕەنجدەر" لە شوێنێکی دیکەدا، لە یادکردنەوەی زێد و گوندەکەی خۆی و گەڕانەوە بۆی هەست بە خۆشی و ڕەوانەوەی ئەم غوربەتەی دەکات، کە هەیەتی، هەر ئەوەشە، کە "فرۆید" دەیگوت: ((هەستی غوربەت و تاسەی نیشتیمان و دووری لە ولآت بە گەیشتن و شاد بوونەوە، بە ولآت کاڵ دەبێتەوە و چارەسەر دەبێت))[٢٤١] لە کتێبی (ڕووەکەکانی خوداوەند)دا، دەڵێ:

**((دڵم دەوڵەمەندە**

**بە شادی بەردەوامی منداڵیی و دیمەنی دەربەندی گۆم**

**بۆ شایی توخمەکان**

**ماڵی کۆمەڵەی مردووانە**

**بەخێر هاتنی مێوانان ناکەن..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ١١٥).**

شاعیر لە چۆڵ و هۆڵی ئێستایی گوندەکەی، دەڵێ: ئێستا هیچ کەسێکی لێنییە تەنیا گۆڕستانێك نەبێ، کە ئیتر تەنیا ماڵی مردووانە، بۆیە شاعیر ئەگەرچی خۆی لە هەولێر دەژی و گوندەکەشی دەکەوێتە سنووری دەورووبەری کەرکووك، بەلآم بۆ مرۆڤ بە تایبەتی شاعیر و نووسەر تەنانەت ماڵی جیرانەکەشی دوورە و غەریبیە لە شوێنی ژیان و ئارامی خۆت.

(٢٤١) حمید نفیسی، نوستالژی مهاجر، فصلنامه گفتگو، شماره (١١)، تهران، ١٣٧٥، ص ٦٠.

**غوربـەت و تـەنیایی و نۆسـتالژیای خـەمی وڵات لـە لای "سـەباح ڕەنجدەر"دا بەسەر دوو قۆناخدا دابەش دەبێت، واتە:**




ئەوەتا شاعیر لە کتێبی (شەڕی چلّ ساڵە)دا، بەم شێوەیەی خوارەوە، باس و هاودەمی و خۆشەویستی بۆ هەولێر دەردەبڕێت، کە دەڵێ:

**((هەولێر دەسکی نیکلی دەرگای**

**بەهەشتی یەکەمینە**

**کـە خـودا تێیـدا پەلکەزێرینـەی هەڵدایـە ئاسمـان..)) (سـەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ٣٩٥).**

یان لەم دەقەی خوارەوەدا، شاعیر هەست بە نیگەرانی و نامۆیی و غوربەت دەکات، لەناوشاری هەولێردا، کەواتە، وەکو پێشتر لە پێناسەی نۆستالژیا خستمانەڕوو، خـەم و غوربـەتی نیشـتیمان مـەرج

نییە، تەنیا لەلای شاعیرانی تاراوگەدا و لە بەرهەمەکانی ئەوان دا هەبێت، بەڵکو ئەوەتا بەشێکی زۆری شاعیران، ئەگەرچی لەناو ماڵ و منداڵ و شار و وڵاتی خۆیانن، بەڵام هێشتا نامۆ و خۆیان پێ دووره نیشتیمانە، ئەو نیشتیمانی خەیاڵ و ئەندێشەی نووسەران دەیانەوێت "سەباح ڕەنجدەر"یش، بە هەمان شێوه غەریبە و تەنیایە، لە زۆربەی حاڵەت لەم وڵاتە و ژیانەدا هەست بە غەریبی و غوربەتێکی ڕووحی قووڵدەکات.

بۆیە دەنووسێت:

**((ئەی بێ نیشتیمانتر لە حاجی لەقلەقەکەی**

**کە لە ئێمە بە گومان نەبوو**

**دڵم بچووك بووەتەوە**

**هێندەی کونی دەرزی دایکم..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل ١٣٤).**

## ١-٥ نۆستالژیای خەم و حەسرەتی دووری لە ئازیزان و لەدەستدانیان:

ئەمجۆرە نۆستالژیایەش، یەکێکە لە جۆرە دیارەکانی نۆستالژیای تاك، ئەمەش بە دوو شێوە لەناو شیعرەکاندا ڕەنگدەدەنەوە:

أ) نۆستالژیای خەم و دووری لە ئازیزانی ناو خێزان، جا چ، وەك لاواندنەوە و لە دەستدانیان دوای مردنیان، یان وەکو بیرەوەری و لێ دوور بوون لە شاعیر.

ب) نۆستالژیا و دووری و یادی هاوڕێیان و سۆزی مردن و لاوانەوە، ئەوەش، یان ئەوەتا هاوڕێکیان هاوڕێ شاعیرن و کەسی ئاساین، یانیش ئەو هاوڕێیانە هاوڕێ و هونەرمەند و شاعیر و نووسەرن، جا چ وەك ئەوەی لە ژیاندا نەماون، یان ماون و ئێستا لە شاعیر دوورن و شاعیر هەست بە دووریان دەکات و دەگەڕێتەوە یاد و بیرەوەریان و ئەو ڕۆژانەی لەگەڵ یەکتر بووینە، لە قۆناخێك لە قۆناخەکانی ژیاندا.

دەگوترێت: ((بەرزترین و مەزنترین شێوەی لاواندنەوە خۆی لە شیعردا دەبینێتەوە، چونکە شیعر دەمێنێ و ناوەکان دەپارێزێ

))[٢٤٢]. بیرەوەری و هەستی غوربەت و لاوانەوە و یاد و بیرەوەری خۆشەویستان لە ئەدەبی کوردیدا بەشێکی زۆری ناوەرۆك و پێکهاتەی دەقی شاعیرانی داگیرکردووە، شاعیرانی، وەك "عەبدوڵلا پەشێو و ئەنوەر قادر محەمەد و سەباح ڕەنجدەر". شیعرەکانیان بەدەرنین لەم ناوەرۆکە شیعرییە، کە هەڵگری چەمك و واتایی قووڵی نۆستالژیا و هەست و سۆزی غەریبی شاعیران دەورووژێنێت و دواجار دەقێکی تراژیدی و پڕ لە فرمێسك و لاوەنەوە، دێتە بەرهەم.

(٢٤٢) ئاشنا جەلال ڕەفیق، لاواندنەوە لە شیعری کوردی کرمانجی خوارووداُ، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، کۆلیژی زمان، ٢٠١١، ل ١٢.

## ــ نۆستالژیای خەم و حەسرەتی دووری لە ئازیزان و لەدەستدانیان لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

"عەبدوڵڵا پەشێو" لە بەشێکی زۆر لە دەقەکانی یاد و بیرەوەری ئازیزان دەکاتەوە، چ ئەوانەی هاوڕێ شاعیرن، وەك شاعیر و هونەرمەند، هەندێکیان ناوخۆی و کوردن و هەندێکیش لەم کەسانەی بیانی و خەڵکی ئەو وڵاتانەن، کە شاعیر لە تاراوگەدا ژیانی تێدا بەسەر بردووە، سۆز و ئەندێشەی نۆستالژی، دەبێتە هۆی ئەوەی دەقەکەی دەقێکی خەفەتبار و چاو بە گریان و دڵ بەژانی بێت. ئەوەتا شاعیر لە شیعری (کەژاوەی گریان)دا، بیرەوەری و یادی بۆ "شێرکۆ بێکەس"ی، شاعیر دەچێ و پەشێو یادی ئەو دەکاتەوە، کاتێ کەوا ئاماژە بە دیوانێکی "شێرکۆبێکەس" دەکات، بە ناوی (کەژاوەی گریان) و دەڵێ:

**((برام، شێرکۆ!**
**کەژاوەکەی گریانی تۆ،**
**وەك ئادەمیزادی ڕاپەڕیو**
**گیانی گەرمی لەبەردا بوو..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ١٤٣).**

شاعیر لێرەدا، وەك هاوڕێیەکی خۆشەویست، چ لە بواری نووسین و شیعر، چ لە بواری ژیانی کۆمەڵایەتی هاوڕێی نزیکی شاعیرە، شاعیر یاد و بیرەوەری خۆی پیشاندەدات و سۆزی دووری بۆ دەجووڵێت و یادی دەکاتەوە، هەروەها دیارە ئەم بیرکردنەوەی "پەشێو" دوای ئەوە دێت، کەوا "شێرکۆبێکەس" ئەم دیوانەی بۆ شاعیر دەنێرێت، شاعیریش، چ وەك هاوڕێیەك یانیش، وەك شاعیرێك و هاو هیواو ئاوات لەناو نووسین و دەقەکانی شیعری "شێرکۆبێکەس"دا وێنەی "شێرکۆ بێکەس" دەبینێ و دەکەوێتە ڕاز و نیاز و لاواندنەوەی، هەروەها "پەشێو" لە شیعرێکی دیکەدا، کە بۆ "تاڤگە"ی برازای نووسیوە، ئەم جۆرە نۆستالژیای خەم و حەسرەت و ژانی یاد و بیرەوەری یەکێك لە ئەندامانی خێزانە، کە برازایەتی دەکات، دەڵێ:

**((تاڤگە کاریلەی مامی خۆت!**

**تۆ جاران تەنیا تاڤگە بووی**

**ئەمڕۆ لای من گەورەتری**

**ئەمڕۆ لای من ئەلبومێکی**

**وێنەی هەموو منالأنی**

**کوردستانم بۆ هەڵدەگری**

**شەقام دەبڕم**

**وەك سێبەری**

**چێشتەنگاوی درەنگی خۆم**

**تۆ لە تەکمای**

**جار جار خۆمت لێ ون دەکەم**

**کەچی لە پڕ**

**وەك ڕۆژنامە لەناو دەستمای..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ٣١٦،٣١٨).**

"پەشێو" لە یاد و بیرەوەری، "تاڤگە"ی برازای، دەبینین هەست بە چ ژان و ئازارێکی ڕووحی و دەروونی دەکات، کاتێ لە هەر شوێنێکی تاراوگە بێت لەبەرە بەیانی بێت، یان لە کار، یان ناو مێترۆ، یان سەرشەقام و ڕێگا و بان و.....تاد، هەر لە بیر و یادی برازا خۆشەویستەکەیەتی، هەروەها شاعیر شتێکی دیکەمان بۆ ئاشکرا

دەکات، ئەگەر لەو دیو مانای وشەکانەوە و لە ئاستی قووڵی دەقەکە بڕوانین، دەبینین شاعیر ماوەی نەبینینی "تاڤگە"مان، بۆ دەخاتەڕوو، هەروەها تەمەنی برازاکەشی، چونکە دەڵێ: (تاڤگە کاریلەی مامی خۆت)، کەواتە ئەو کاتەی شاعیر لێرە بووە و "تاڤگە" منداڵێکی بچووك بووە، چونکە (کاریلە) هێما و نیشانەی بچووکییە، بەڵام ئێستا گەورە بووە و ئیتر منداڵ نییە، بۆیە دەڵێ: (ئەمڕۆ لای من گەورەتری) کەواتە ئەم بیرەوەرییە، یاد و بیرەوەرێکی زەمەنییە و ماوەکەشی زۆرە، بەمەش "پەشێو" بەو گەڕانەوەیە بۆ یادی یەکێك لە ئازیزانی خێزانەکەی، کە برازاکەیەتی سۆزی دڵ و دەروون و لافاوی غەریبی هەڵدەستێت بەرەو یاد و بیرەوەری برازاکەی، کە لە کوردستانە دەیهێنێت.

## ــ نۆستالژیای خەم و حەسرەتی دووری لە ئازیزان و لەدەستدانیان لە شیعرەکانی"ئەنوەر قادر محەمەد"دا

"ئەنوەر قادر محەمەد"، وەك شاعیرێکی تاراوگە، چونکە زۆرتر ئەزموونی شیعر نووسینی لە تاراوگە و دووری لە وڵات بووە، لەبەر ئەوەشە لە زۆربەی ڕووداوە خۆش و ناخۆشەکانی ناو خێزان و خانەوادەکەی لە کوردستان نەبووە، ئەمەش وای لێ کردووە، بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە و لاوانەوەی کۆرپەی دڵی و ژیرکردنەوەی، پەنا بباتە بەر نۆستالژیای گەڕانەوە و خەم و حەسرەتی دووری لە ئازیزان و هاوڕێ و هاوتەمەنەکانی، دیارە ئەمەش تاکە چارەسەر و سارێژکەرە، بۆ خودی شاعیر و ئارام کردنەوەی سۆز و هەڵچوونی دەروونە. ئەوەتا شاعیر لە (چەند هۆنراوەیەك بۆ دایکم)دا، خەم و حەسرەتی یاد و بیرەوەری دایکی، شاعیر بە چۆکدادەدات و وای لێدەکات هەمیشە نیگای چاوی بڕوانێتە وێنەی دایکی و لەگەڵی ڕاز و نیاز بکات و دەردی غەریبی و بێ دایکی لەبەر خۆیەوە باس بکات، چونکە شاعیر لە دوولاوە هەتیووە و خۆی بە بێ دایك دەزانێت، یەکێك نیشتیمانە یەکسانە بە دایك و دووەمیش دایك، وەك جەستە و دەستی نەرم و فرمێسکی میهرەبانی و ئامۆژگارییە حیکمەت دارەکانی بۆ ڕۆڵەکەی، بۆیە شاعیر دەڵێ:

**((هۆ دایە گیان! دڵنیابە،**

**هەموو ڕۆژێ کە خۆم دەکەم،**

**بە ژوورە غەریبەکەمدا**

**تێر دەڕوانمە وێنەکەت،**

**لەبەردەمیا دێم بە چۆکدا**

**چونکە دایە، لەوسیما خەمناکەی تۆشدا**

**وەك ڕوخساری وڵاتەکەم**

**چەنێ پەنجەی ڕۆژگاری دوون،**

**نەخشەی زام و کارەساتی تیا کەندووە..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ٨٥).**

شاعیر لە شیعری (کۆتەڵ)دا، کە بۆ کۆچی باوکی نووسیوە، دیارە لەو کاتەدا شاعیر لە غەریبی و ئاوەرەیدا دەژیا، بەڵام هەواڵی مردنی باوکی کاریگەریەکی ناخۆشی بەسەرەوە دەبێت و بە هۆیەوەی شاعیر هەست بە بێ تاقەتییەکی زۆر دەکات، زۆر بە کوڵ و زۆر کوردانە لەم دوورییە و غەریبستانەوە سۆز و خولیایەی جارێکی دیکە و لە خەفەت و ژان و ئازارێکی دیکەدا دێتەوە هەڵچوون، گڕی دڵ و فرمێسکی چاوی بە تینترن لە ئاگری بورکان و هێزی لافاو و باران، شاعیر لەم دەقەدا، بە هەڵی زانیوە و بە هۆی ئەم ڕووداوە،

یادی بەشێکی زۆری خزم و کەسە نزیکەکانی خۆی بکاتـەوە، ئـەوەتا دەڵێ:

**((لەوێ نەبووم خۆم لە دەوری گۆڕی پیرۆزت بگێڕم،**

**لەوێ نەبووم، وەکو دایکە خەمبارەکەم،**

**وەکو خاڵی زامی بەسۆ لە دڵ ماوم،**

**وەکو برا و خوشکانی باوک نەماوم،**

**کۆتەڵێ بگێڕم بۆ تۆ!**

**کوردانە بیکەم بەڕۆ ڕۆ**

**لەوێ نەبووم، بابە بمبەخشە بە غەریبیم!**

**بمبەخشە بە ئاوارەییم!)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵـە و زنار، ل ١٣٠).**

شاعیر یاد و خـەم و حەسـرەتی کۆچـی بـاوکی ئەوەنـدە بەسـۆ و کاریگـەرە، تەنانـەت ((شـاعیر هەسـت و سـۆزی خـۆی لـە بەرانبـەر لەدەســـتدانی خۆشەویســـترین کەســـی ئەخاتـــەڕوو، ئەگەرچـــی لەناوکۆمەڵگەی کوردیدا بـاوك پلـە و پایەیـەکی بـەرزی هـەبووە و بـە سـەرەگەورە و فەرمانـدەر و بەخێوکـەری مـاڵ دانـراوە))[٢٤٣]، بـەلاّم لەبەر چاویەتی، کەوا خوشك و برا و خاڵ و مامەکان و دایکی ئێستا چ

(٢٤٣) ئاشنا جەلال ڕەفیق، لاواندنەوە لە شیعری کوردی کرمانجی خوارووداد، نامەی ماستەر زانکۆی سلێمانی، کولێژی زمان، ٢٠١١، ل ٦٧.

شیوەنێکیان دەست پێ کردووە، خەم و ژانی شاعیر بۆ ئەوەیە، کەوا ئەویش لەوێ نەبووە، کەوا کوردانە بگری بۆ باوکی، ئەگەر ورتر بینەوە لە دەقەکە و زیاتر مانا دەلالیەکان (دال) ڕاڤە بکەین، ئەوا شتێکی دیکەمان دەست دەکەوێت، ئەویش وەفا و پیرۆزی و گەورەیی باوك و دایك و تەنانەت هەر کەسێك بێت، واتە بەراوردێکە لە نێوان ژیانی کۆمەڵگەی کوردی و ژیانی کۆمەڵگەی ئەوروپی، ئەویش لە دەستەواژەی (کوردانە بیکەم بەڕۆ ڕۆ)، کەواتە مردوو لەلای ئێمەی کورد خاوەن ڕێز و پایەو قیمەتی خۆیەتی، بەلاَم لە ئەوروپا ڕۆژانە چەندان کەس دەمرێت، بە چەند ڕۆژ و مانگ لەناو بینا و ژوورەکەی خۆیدا و شارەوانی بەخاکی دەسپێرێت، کەچی خۆ دەبینین، کە سۆز و گریان و هاوخەمی و بیرەوەری و یادگارییەکانی مردوو لە لای ئێمە چەندە بەڕێز و شکۆیە.

## ـ نۆستالژیای خەم و حەسرەتی دووری لە ئازیزان و لەدەستدانیان لە شیعرەکانی"سەباح ڕەنجدەر"دا

خەم و حەسرەتی و نۆستالژیای دووری و لاوانەوەی هاوڕێ و ئازیزان لە دەقەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا، بوونێکی زۆریان هەیە، بەتایبەتی لە ڕۆمانەشیعری (زێوان)دا، چونکە شاعیر بەشێکی زۆر شیعرەکانی سەرەتایی لە سەر کاریگەری و لاوانەوەی کۆچی دوای باوکی نووسیووە، واتە ئەم ئەزموونە تاڵ و ئەم ڕووداوە جەرگبڕە لەلای شاعیر بووەتە بناخە و بنیاتی بەشێکی زۆری دەقەکانی، شاعیر بەردەوام، تاکۆتایی دەقەکە بگرە لە کتێب و دیوانەکانی کۆتاییشدا، نەیتوانیوە ئەم خەم و ژان و ئێش و ئازارەیی کۆچی باوکی لەیاد بکات، ئەمەش شاعیری تووشی غوربەتێکی ڕووحی بەهێز و گەورە کردووە و پانتایەکی زۆری لە ژیانی شاعیر داگیرکردووە، چونکە ((مردن ئەو کۆستە گەورەیەیە، کە جەرگ و دڵی مرۆڤ دەهەژێنێ و دابڕانێکی هەمیشەییە لە ئازیزان، جا لەبەر ئەوە زۆر جار ئەو کۆستە بووەتە هۆی ورووژاندنی هەست و نەستی مرۆڤەکان و ڕەنگیداوەتەوە لەو شیعر و لاوانەوانەی، کە بۆ مردوو

دەگووترێــت))[٢٤٤]، بۆیــە بــۆ کۆچــی دوای بــاوکی لــە (زێــوان)دا دەنووسیٚ:

**((باوکم پیاوێکی زۆر باش بوو**

**لەناو دڵی تاوێرە بەرد**

**ماڵێکی ساکاری ڕازاندبووەوە**

**ڕابەرایەتی لەناو دەکرد**

**خودای لەگەڵ..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ٧٢).**

ئــەم غوربــەت و یــاد و بیرەوەرییــەی شــاعیر دوایــی تێکــدان و ڕاگواستنی خەڵکی گوندەکان و گوندەکەی شاعیر خۆی دێت و، زیاتر پەرەی ساند و تۆختر بوو لـەناخ و ڕووح و دەروونـی شـاعیر، چـونکە گۆڕی باوکی شاعیر لەم گوندە بووە و بە دوورکەوتنەوە و هاتنیان بۆ شاری هـەولێر، خـەم و ژان و ئێشـەکەی شـاعیر ڕۆژ بـە ڕۆژ گـەورەتر دەبێـت، ئـازاری زیـاتر دەبێـت، چـونکە ئـیتر نـاتوانیٚ بـۆ سـەردانی گۆڕەکەی باوکیشی، بچێتەوە زێدەکەی خۆی!

شاعیر لە کتێبی (ساڵی سفر)دا، باس و بەسەرهاتی کۆمـەڵێك یاد و بیرەوەری ناخۆشمان بۆ دەکات، کـە یـاد و بـەبیر هێنانـەوەیان

(٢٤٤) ئەرخەوان محەمەد عوبید، ڕەمز و نووسینی سەر گۆڕەکان بە نموونەی چوار گۆڕستانی باشووری کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨، ل ٢٥٣.

لەلای شاعیر دەبێتە هۆی ئازارێکی بێ دەرمان و نامۆیی و تەنیایەکی قووڵ و گۆشەگیریەکی بێ ئامان، چونکە لە لووتکەی نۆستالژیای خەم و حەسرەت و ژانی ئازیزاندا، باسی کۆمەڵێك لە ئەندامان و خێزانە نزیکەکانی خۆی دەکات، کە ئێستا بوونیان نییە و بوون بە یادگاری و ئەستێرەی ئاسمانی دڵی شاعیر،"سەباح ڕەنجدەر" لەم دەقەدا بیرەوەری کۆن و ڕابردووی، لە ڕۆژێکی هەفتەدا کۆ دەکاتەوە و بەدی و شومییەك بەم ڕۆژە دەبەخشێت، کە ڕۆژی (شەممەیە) بۆیە، دەڵێ:

**((لە شەممەدا باوکم فاتەڕەشەی ئەستوور بوو**

**لە شەممەدا دایك فەرشەی شکا**

**لە شەممەدا دوو برازام بەردی بن پێیان خزی**

**لە شەممەدا خوشکەزایەکم لەگەڵ ئاودا شەڕی ڕاگەیاند و شکا..))**

**(سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل ٢٦٤).**

شاعیر لەم دەقەدا، چەندین ڕووداوی ناخۆشی و خەماوی بەبیردادێتەوە و دەبێتە نۆستالژیایەکی تراژیدی و پرسە ئامێز، چونکە لەشەممەدا باوکی نەخۆش دەکەوێت و کۆچ دوای دەکات، لە شەمەدا دایکی هاوسەر و کوڕێکی لەدەستدەدات، لە شەممەدا (دوو برازام بەردی بن پێیان خزی)، ئاماژەیە بۆ شەهید بوونی باوکیان. کە برای شاعیر بوو و ناوی (خالید سابیر حەسەن)

بوو، لە (١٩٨٨/٨/٢٥) لە بەردەم دەرگای ماڵەکەی خۆیدا بە تەقـەی خۆشـی شـەهید کـرا، شـاعیر ((گوزارشـت لـە حـاڵ و هەسـتی خـۆی دەکـــات، بەرانبـــەر لـــە دەســـتدانی(بـــرا)ی و ئـــەو بۆشـــایی و ســەرگەردانییەی لــە ئــەنجامی دێتەکایــەوە پیشــان دەدرێ و بــاس دەکرێ، برا نرخ و بەهایەکی مەعنەوی و دەروونی هەیـە و مردنـی بـرا ئەبێتە هۆی تێکچوونی هاوکێشەی خێزانی))[٢٤٥].

(لـە شـەممەدا خوشـکەزایەکەم لەگـەڵ ئـاودا شـەڕی ڕاگەیانـد و شکا)، شاعیر دەگەڕێتەوە بۆ ڕووداوی خنکانی کوڕە خوشکەکەی لـە دەریای (ئیجە)، لە ڕێگەی چوونی بۆ هەندەران لە تەمەنی گەنجی دا، ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری لەسەر شاعیر درووستکردووە.

(٢٤٥) ئاشنا جەلال ڕەفیق، لاواندنەوە لە شیعری کوردی کرمانجی خواروودا، ل ٥٩.

## ٦-١ نۆستالژیای داهاتوو/ ئایینده‌سازیی (داهاتووی نموونه‌یی):

وه‌کو پێشتر له‌ جۆر و پێناسه‌کانی نۆستالژیادا ئاماژه‌مان پێکرد، یه‌کێك له‌ بنه‌ماکانی قوتابخانه‌ و ڕێبازی ڕۆمانسیزم، دڵته‌نگی شاعیره‌ بۆ داهاتووێکی نموونه‌یی و بێ وێنه‌، چونکه‌ نووسه‌ر و شاعیر جگه‌ له‌وه‌ی، که‌ باسی دڵته‌نگی و حه‌سره‌تی ڕابردوو ده‌کات و تووشی خه‌م و ژان و ئازار ده‌بێت، ئه‌وا ئاواتی داهاتوویه‌کی خۆشتر و گه‌ش و ڕووناکتر بۆ خۆی و خه‌ڵکی شاره‌که‌یشی ده‌خوازێت و مه‌لی خه‌یاڵی به‌ره‌و داهاتوو هه‌ڵده‌فڕێت، به‌ ئومێدی گه‌ڕان و دۆزینه‌وه‌ی ئه‌م داهاتووه‌ پڕ له‌ سه‌رکه‌وتن و گریمانه‌ کراوه‌ی شاعیر.

## ـــ نۆسـتالژیای داهـاتوو/ئاییندەسـازیی (داهـاتووی نموونەیی) لە شیعرەکانی "عەبدوڵلا پەشێو"دا

"عەبـدوڵلا پەشـێو" لـەو شـیعرانەی بـۆ منـداڵانی کوردسـتانی نووسیوە، دەیـەوێت و هەوڵـدەدات داهـاتووێکی باشـتر و خۆشـتر بـۆ میللەتەکەی دابین بکـات، شـاعیر پێـی وایـە ئـەم داهـاتووە و گۆڕانـە تەنیا دەبێت لەسەر دەستی منداڵەکانی دوارۆژ بکرێت، چونکە منـداڵ نـەوەی داهـاتووە و شـاعیر بـە ئومێـدەوە دەڕوانێتـە داهـاتووی ئـەو منداڵانە، دەیەوێت، وەکو ئـەوان نـەبن، یـان ئـیتر شـاعیر هەسـت بـە پیری و ئاوابوونی تەمەن دەکات، توانای گۆڕان و داهاتووێکی باشتری نییە، بـەڵام وەك هێمـا و ئاماژەیـەك منـداڵ دەکاتـە ڕێبـەر و گـۆڕانی ڕەوتی ژیانی کۆمەڵگەی کوردی و ئیتر ئەوەی ڕوویداوە لـە داهـاتوودا ڕوونەدەن و وڵات سەربەخۆی و ببێتە خاوەن دەوڵەت و کیانی خۆی، ئەمـەش تـەنیا منداڵـە و نـەوەی نوێیـە، بتوانێـت ئـەم گۆڕانکارییـە بهێنێتە بەرهەم، بۆیە لە (وانەی سێیەم)دا، دەڵێ:

((منداڵەکان!

ئێوەن زەلکاو دەشڵەقێنن

ئێوەن ئەو بوومەلەرزانەی

سبەی کانیی دەتەقێنن،

ئێوەن سبەی

سنووری دەستکرد دەشکێنن،

قەفی زنجیری لێکپچڕاو

بە یەکترەوە دەلکێنن..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ٢٢٤).

شاعیر لە ڕێگەی بەکارهێنانی (سبەی) وەك ڕەمز و مانایەکی دەلالی، کە هەڵگری چەمك و واتای داهاتوویێکی نوێیە لە لایەك، لە لایەکی دیکە وشەی (منداڵ) و بەکارهێنانی منداڵان بۆ ئەم گۆڕانکارییە، نیشانەی پێگەیشتن و هاتنی نەوەیەکی نوێ و ڕۆشنبیر و خاوەن بیروڕا و ئازادییەکی سەربەخۆیە، ئەمەش ئومێد و ئاواتی شاعیرە، کە بە درێژایی ژیان و ئەزموونی شیعری هەوڵی بۆداوە. بە ئومێدەوە داوادەکات، نەوەی نوێ سنوورەکان تێك بشکێنێ و دەوڵەتی کوردی دابمەزرێنێت.

شاعیر لە شیعری (هۆنراوەیەکی ساکار)دا، بەوپەڕی تووڕەیی یاخی بوونەوە، ڕووی دەمی دەکاتە خۆشەویستەکەی و داوای

لێـدەکات کـە ڕۆژێ دادێ، دەبـین بـە خـاوەن وڵات و دەوڵـەتێکی سەربەخۆی خۆمان، ڕۆژێك دادێ هەر چوار پارچەی کوردستان دەبن بە یەك و ئیتر دەبین بە خاوەن دەوڵەتێکی چەند ملیۆنی، شاعیر داوا دەکات هەموومان بەیەك دەنگ و بەیەك ڕەنگ و بەیەك زمان بجەنگین و خەبات بکەین، چونکە ئەگەر یـەکگرتوو نـەبین، ئـەوا نـاتوانین ئـەو خەونە بهێنینە دی، شاعیر لە ڕێگەی خەیاڵ و خـەون و گریمـانکردنی داهاتووێکی ڕۆمانسـی، دەقێکی نۆسـتالژیای تـاکی و هـەنگاونان بـۆ داهاتوویـەکی پڕشـنگدارتر و ئاییندەیـەکی نموونـەیی، بـۆ گەلەکـەی پێشبینی دەکات، دەڵێ:

**((خۆشەویستم!**

**ڕۆژێ دادێ**

**گڕ بەر بێتە شار و لادێ**

**ڕۆژێ دادێ کورد بپرسێ:**

**کەی ڕەوایە لێك بپچڕێ**

**گەردانەی کەژ و کێوم**

**ئەو ڕۆژی خۆت مەشارەوە**

**تاکو پێکڕا،**

**یەك دەنگ، یەك ڕا،**

**لەناو شریخەی تفەنگا،**

**لە ژێر چەتری شەوەزەنگا،**

**کوردستانی ملیۆنەها لە ناحەزان**
**بکەین بە کێلگەی کارەبا..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کڕێوە، ل ١٧١-١٧٣).**

ئەم یاخیبوون و تووڕەییەی شاعیر لەبەرانبەر ڕژێمی پێشووی بەعس بووە، بەڵام شاعیر داوا دەکات، بە شێوەزارە جیاکانی کورد کە مەبەستی کرمانجی سەروو، خواروو، شێوەزاری کوردەکانی پارچەکانی دیکەی کوردستانە، بەبێ هیچ جیاوازیەکی فیکری و ئیتمایی سیاسی یەکگرن و کوردانە و مەردانە ڕاپەرین، پێش هەموو شتێك کورد بن، نەوەك حیزب و زمان و شێوەزار و.....تاد، بۆ ڕزگارکردن و سەربەخۆی وڵات ڕۆژێ دادێت شۆڕشی تووڕەیی و بەرخودانی میللەتی کورد، ڕەگ و ڕیشەی دوژمن لەبناخەوە هەڵدەتەکێنێ.

## ــــ نۆســـتالژیای داهـــاتوو/ئاییندەســـازیی (داهـــاتووی نموونەیی) لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

"ئەنوەر قادر محەمەد" یەکێکە لەو شاعیرانەی، کە لەبەر ستەم و زوڵم و زۆرداری دەسەڵاتی سیاسی و ڕامیاری و باری کۆمەڵایەتی و دابونەریتی کۆمەڵایەتی ڕوودەکاتە دەرەوەی وڵات و تاراوگە و غەریبی دەکات بە هاوسەر و هاوژینی خۆی، دڵ و دەروون و چاویشی لە کوردستان جێ دەهێڵێت، ئەوەتا لە شیعری (وەرزی سەرهەڵدانی فەرهاد)دا، چاوەڕێی داهاتوویێکی باشتر و ڕۆژێکی خۆشتر دەدات، بە هاتنی پاڵەوان و یاخی بوویەکی "فەرهاد" ئاسا بۆ ڕزگار کردن و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و هێنانەدی ئومێد و ئاواتێکی پڕشکۆ و سەروەری بۆ میللەتەکەی، دەڵێ:

**((هۆ فەرهاد گیان!**

**نیگاکانم سۆماییان داهاتووە**

**ڕووە و ڕێگای ئاڵی بەیان**

**تینی چاویان هەڵخستووە**

**بۆ هاتنت شار برسییە**

**شار تینووە**

**شار هەنگاوی بەرەو ژوورەکەی**

**ڕێبوارێکی پەك کەوتووە..**

**شار هەنسکێکی ماندووە..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ١٣).**

شاعیر لە ڕێگەی تەوزیف کردنی پاڵەوانێکی داستانی کوردی، کە(شیرین و فەرهاد)ە، بەڵام بۆ مەبەست و مەرامێکی دیکە بەکاری هێناوە، کە مەبەستی سیاسی و ناڕەزایی و زوڵم و زۆردارییە، کەوا بەسەر میللەتەکەیدا هاتووە، بۆ ڕزگار بوون و گەشانەوەی هیوا و ئاواتی میللەتەکەی، پێویستە فەرهادانە ڕابن و دژی ستەم و زۆرداری بوەستنەوە و سەربەخۆی و ئازادی بۆ میللەتەکەیان فەراهەم بکەن، بەڵام شاعیر دڵنیایە لەوەی، کەوا هەڵاتنی ڕۆژی کورد نزیکە و ڕۆژ هەڵدێت و ئەمەش بووەتە هۆی داهێنانی دەقێکی نۆستالژی و خەم و حەسرەت، بۆ داهاتوویێکی باشتر و نموونەیی بۆ میللەتەکەی، بە هۆی

دەستەواژەی (نیگاکانم سۆماییان داهاتووە)، یان (بەیانی) نیشـانە و ئاماژەی داهاتوو دەدەن.

لـە شـیعرێکی دیکـەدا، شـاعیر ڕوودەکاتـە منـدالآن، بـە ئۆمێـدی دروسـتکردنی ئاییندەیـەکی گـەش و جـوان بـۆ وڵات و نەتەوەکـەی، چونکە منداڵ نەوەی نوێنە، جیهانێکی پاك و بێگەردن، هێشتا تێکەڵ بە پیسی و فرۆفێڵ و درۆی ژیان نەبووینە، جیهانی منـداڵ جیهـانێکی سـپی بـەفر ئاسـایە و مێشـکی منـداڵ، وەکـو میمۆریـەك بەتاڵـە و پەراوێکی سپییە، چی تێدا بنووسی ئەو دەخوێنێتـەوە، بۆیـە شـاعیر بەوپەڕی هۆشمەندی و بەرپرسیارییەوە، دەیـەوێت داهـاتووی وڵات و شارستانییەتی وڵات لەسەر دەستی مندالآن بگۆڕێ، بەلاّم بە مـەرجێ ڕابردوو لەبیر نەکەن، لەم بارەیەوە"هایندش بیل"، دەڵێ: ((ئێمـە لـە خۆڵەمێشـی ڕابـردووەوە بـۆ خۆڵەمێشـی ئاییـنـدە دڵـی خۆمـان خوشکردووە و لـە میـانی خۆڵەمێشـی ڕابـردووەوە، بـۆ ئاییـنـدەدا لـە توێژینەوەی خەڵقی زەمـەنی حـاڵ و بزاڤـی هێنـانی ژیـانین...))[٢٤٦]، دواتر ناتوانن داهاتوویـان باشـتر بکـەن، بۆیـە لـە شـیعری (نوقلآنـەی خۆشەویستی و باران)دا، بە تەواوی هەست بەو داهاتووە دەکەین، کە شاعیر پێشبینی دەکات، سەیرکە دەنووسێ:

(٢٤٦) دانا سەعید سوفی، دەقی هاوچەرخ، گۆڤاری سبەی، ژمارە(١)ی جۆزەردان، ١٩٩٣، هـەولێر، ل ٢٤.

**((ئەی وردیلانی دێیەکەم!**
**ساڵانێکە چۆلەکەکان بە نووکی شەنی پەنجەیان**
**تارمە پێخۆیی ئێسك و سەری هارڕوای شەهید**
**شەن ئەکەن...**
**هەر ئەڵێن باران ئەبارێ،**
**هەرنابارێ**
**ئەی هەورەکان، کەی ئەباری؟**
**ئەی دەریاکان، کەی ئەبارێ؟**
**ئەی شەهیدان،کەی ئەبارێ؟**
**وردیلەینە!**
**هۆنراوەکەم بارانێکە تەپ وتۆزی**
**سەر ڕوومەتی دێیەکەمان ئەشواتەوە..)) (ئەنوەر قادر محەمـەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل٢٣–٢٥).**

شاعیر بە بێزارییەوە لە ڕابردووی پڕخوێنەوە ڕوودەکاتە منداڵان و ڕابردووی پڕ خوێناوی وڵات و مێژووی خـاپووورکردن و زوڵـم و زۆریـان بۆ دەگێڕێتەوە، بە ئومیدی دووبارە نەبوونەیان لـە داهـاتوودا، بـەڵام شاعیر گەشبینە بە داهاتوو لـە سەردەسـتی نـەوەی نـوێ، پێـی وایـە ڕۆژێ دێـت ئـەو (بـاران)ە. هـەر دەبارێـت، چـونکە (بـاران) ڕەمـز و دەلالەتی هـاتنی شـادی و خۆشـی و نـوێ بوونەوەیـە، بۆیـە منـداڵان

ڕادەسپێرێ، بۆ ئەوەی ببنە ئەو بارانەی شاعیر خەونی پێوە دەبینی و بەدوایدا تامەزرۆیە و بەردەوام بەدوایدا دەگەڕێ و پرسیار لە هەموو شتێك دەکات، لە (هەور، دەریا، شەهید.....تاد)، دواجار خۆی مژدەی ئەم شادی و داهاتووە ڕادەگەینێت، کە لە هۆنراوە و دەقەکانیدایە، ئەمەش بۆ ئەوەی پێمان بڵێ، قەڵەم و شیعر و دووربینی شاعیر دەتوانێ ئاییندەیەکی پڕ خۆشی و شادیی بێنێتە بەرهەم، کەواتە شاعیر دەیەوێ بڵێ: منداڵینە بۆ ئەوەی داهاتوومان قەرەبووی ڕابردووی پڕ لە زوڵم و زۆرداری و ژێردەستی بکاتەوە، ڕووبکەنە زانست و قەڵەم و خوێندن و ڕۆشنبیری و .....تاد، تاوەکو ئاسۆی خۆتان و نەتەوەکەمان ڕوون و گەش و جوان بێت.

## ـ نۆستالژیای داهاتوو/ ئاییندەسازیی (داهاتووی نموونەیی) لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

"سەباح ڕەنجدەر" شاعیرێکی ئاییندەخوازی خاوەن دیدگا و ئاواتەخوازی داهاتوویەکی باشتر و گەشاوەترە، بۆ میللەتەکەی، ئەمەش بووەتە هۆی داهێنانی کۆمەڵێك دەقی جوان لەبارەی نۆستالژیای خەم و حەسرەتی داهاتوو، بۆ خۆی و نەتەوەیی، چونکە شاعیر هەمیشە بە هیوای داهاتوویەکی باشتر هەنگاوی ناوە و گەش بین بووە، شاعیر بە شێوەیەکی جیاوازتر لە هەردوو شاعیر "عەبدوڵلا پەشێو و ئەنوەر قادر محەمەد"دا، داهاتوو بەرجەستە دەکات. "سەباح ڕەنجدەر" هەوڵی داوە و دەیەوێت لە ڕێگەی خەونەوە، یان زیندەخەونەوە بگاتە ئەو ئاییندەی، کە خۆی دەیەوێت، چونکە لە ڕاستیدا خۆی دەلالەتی (خەون) واتا هەنگاونانە بۆ داهاتوو و ئاییندەخوازی، بۆیەش (خەون و زیندەخەون) فەزایەکی تەواوی بەسەر دەقەکانی شاعیردا کێشاوە و سێبەری هەمیشە بەسەر دیوانەکانی شاعیردا دیارە، وەکو ناوەرۆکێکی دیار شاعیر کاری لەسەر کردووە و هەوڵی داوە بەرجەستەیان بکات لەناو شیعرەکانیدا، شاعیر پێی وایە، ژیان خەونێکە و پێی ناگەین، خەونیش هەمیشە

**هەڵگری چەمکی هیوا و ئاواتە بەدینەهاتووەکانە، ئەوەتا شاعیر لە شیعری (مەرگی ئاوێنە)دا، دەڵێ:**

**((منداڵەکانی ڕۆژهەڵات**
**چووینە گەشتی نووستن**
**لەم خەونەدا بە چی دەگەن**
**منداڵەکانی ڕۆژهەڵات**
**گوللە دەزانن بۆن کەن**
**منداڵەکانی ڕۆژهەڵات**
**گوڵیش دەزانن بتەقێنن)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ١٩٣،٢١٠).**

شاعیر دەیەوێت ئەم گۆڕانە و داهاتووە لەسەر دەستی منداڵان و لە منداڵەوە دەست پێ بکات، بەڵام بە شێوەیەکی جیاوازتر لە "پەشێو و ئەنوەر قادر محەمەد"، چونکە "ڕەنجدەر" دەیەوێت خەون بکاتە تابلۆی ڕووداو و گێڕانەوەکانی، بۆیەش پەنایی بۆ خەون بردووە، چونکە خەون هێما و ئاماژەیە، بۆ خەونبینین بە داهاتوویەکی نەبینراو و داهاتووێکی پڕ لە سەروەری و شکۆمەندی و پڕ لە خۆشگوزەرانی، بۆ تەواوی مرۆڤایەتی و نەوەکانی کورد بەتایبەتی. کەواتە: ئەگەر هەر گۆڕانکاریەك بۆ باشتر و ئاسۆیەکی

ڕووناکتر بکرێت، دەبێت لە بناخەوە ڕابێت، بناخەی کۆمەڵگەش، منداڵە.

شاعیر بە جیهانبینیەوە ئەم کارەی ئەنجامداوە، بەڵام ئەو گۆڕانکاریەی ئەو دەیەوێ، دەبێ لە ڕێگەی گەشتەوە بێت، ئەویش بە منداڵ، نەك بە نووسەر و شاعیر و گەڕیدەکان و گەشتنامەمان بنووسنەوە. ئەگەر لە ئاستێکی قووڵتر و لە دیدگایەکی دیکەوە سەیری دەقەکە بکەین، دەبینین مانا دەلالیەکانی دەق پێمان دەڵێن: شاعیر دەیەوێت گەشتێکی فیکری و لەسەر ئاستی بیر و هۆش و ڕۆشنبیری بەشێك و ئەندێشە و خەیاڵی منداڵەکان بکات و بیانگوڕێت، چونکە بیر و ئەندیشەی منداڵ لە ڕۆژهەلات تەژیکراوە بە شەڕ و توورەی و ئازار و ئەشکەنجەوە، کۆمەڵگەی ئێمە خراپتریش، منداڵ لە کۆمەڵگەی کوردی یەکەم کەلوپەل و یاری منداڵان، کە دەستی بۆ دەبات دەمانچە و کلانشیکۆف و سەیارەی عەسکەری نایلۆنی منداڵانەیە، شاعیر دەیەوێت لە ڕێگەی گەشتی مێشکیانەوە ئەم کولتووره بگۆڕێ و داهاتوویێکی باشتر و گەشتر بهێنێتە بوون، تاوەکو لە شوێنی گوللە گوڵ بۆن بکەن، لە جیاتی یاری بە قەوان و بەردەقانی، یاری بە قەڵەم و ڕەنگ و تابلۆی سروشت بکەن.....تاد.

شاعیر لە دەقەکێکی دیکەدا، لە شیعری (ڕێزمانی کۆڵانەکان)، لە ڕێگەی نوێژەوە، دەیەوێت ئاییندەیەکی چاکتر بدۆزێتەوە و خەون و خەیاڵی هاتنی خۆشی و شادی دەکات، شاعیر بۆیە (نوێژ)ی

هەڵبژاردووە، چونکە ئەنجامدانی ئەم ئەرکە ئایینییە لە لای خەڵکی موسڵمان و بەتایبەتی لای سۆفییەکان ئارامی و بەختەوەرییەکی ڕووحی و دەروونی بە مرۆڤ دەبەخشێت و ئاسوودەیان دەکات، بۆیە دەڵێ:

**((نوێژ بۆ هاتنی بەختیاری دەکەم**

**بەختیارییەکی پاراو بمباتە گەشت**

**میوەی ڕژاو بکاتە بواری پەڕینەوە لە لافاو..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل٢٤٢).**

شاعیر دوای هەست کردن بە نیگەرانی و خەم و ژانی دەروونی بەرانبەر بە واقیعی حاڵ و بەرانبەر بەو ژیانەی تێیدا دەژی، بە تایبەتی دوای ئەوەی بە هۆی (شەڕی براکوژی)، هیچ تروسکایەکی ڕووناك و هیچ ئومێدێك بەدی نەدەکرا، شاعیر بە دوای ئارامی و بەختیاریدا دەگەڕێ و بەو هیوایەیە، کەوا داهاتوویێکی باشتری بۆ بێتە پێش خۆی و وڵاتەکەی، لەم نەهامەتی نیگەرانییە ڕزگاریان ببێت.

## ١-٧ نۆستالژیای شاری نموونەیی "المدينه الفاضلة" یۆتۆپیا:

بیرۆکەی بوونی شاری نموونەیی لە بیرۆکە و ئەندێشەی خەیاڵی مرۆڤە لە بەرانبەر سەختی و ئاڵۆزییەکانی ژیان و ڕۆژگاردا، چونکە مرۆڤ دوایی بێزار بوون لەو ژینگە و شوێنەی تێیدا دەژی، کاتێ هەست بە غەریبی و نامۆ بوون دەکات، ئەوا ئومێد و هیوای شوێن و شارێکی دیکە دەکات، کە دووربێت لە خەم و ژان و ئازار، شارێك بێت بەهەشت ئاسا و ئازادی و بەختەوەری تێدا دەست بکەوێت، بوونی شاری نموونەیی(مدینة فاضلة) مێژوویەکی کۆنی شارستانیەتی مرۆڤایەتی هەیە، شاری نموونەیی شوێنێکە، قەد دەست ناکەوێت و بوونی لەسەر ئەرزی واقیعدا نییە، کە لەرێگەی خەیاڵ و فانتازیاوە بەردەوام نووسەر دەیهێنێتە بەرچاوی و لە ئاسۆی ئارەزووەکانی مرۆڤ بە درێژایی مێژوو گەیشتنە بەو کۆمەڵگە و شارە، کە تێیدا ئازادی خۆی بەدەست بهێنێت، کاتێ مرۆڤ ئارەزووەکانی خۆی لە چوار چێوەی زانست بە ڕاست زانی، وێناکردنی شاری نموونەیی لە ئەفسانەکانەوە هێنایە دنیای عەقڵەوە. لە بارەی شاری نموونەیی و یۆتۆپیاوە، "یاسین النصیر"، دەڵێت: ((نووسەر لەرێگەی گریمانەوە کاتێك دەیانەوێت جیهان بگۆڕن، ڕوودەکەنە شوێنی "یۆتۆپیا" و

شاری نموونەیی و بۆیە شوێنی گریمانە بەبەردەوامی تووشی فڕین و تۆتۆپیا و خۆش باوەڕیت دەکات))[٢٤٧].

ئەدەبی کوردیش لە بەرهەمی شاعیران، بەتایبەتی شاعیرانی نوێ و هاوچەرخ پڕیەتی لە ئارەزوو و هیوای شاعیر بۆ گەیشتن و بەدیهێنانی ئەم شارە نموونەییە و گەڕان بەدوایدا، بۆخۆ ڕزگار کردن لە ژیانی تاك و ئاسوودەکردنی دەروونیان، بۆیە دەقەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو و ئەنوەر قادر محەمەد و سەباح ڕەنجدەر"یش، بێبەش نییە لەم هیوا و ئارەزووەی درووست کردن و گەیشتن بەم شارە نموونەییەی لە ئەندێشەی فراوانی خەیاڵیان دروستی دەکەن و وێنای بۆ دەکێشن.

(٢٤٧) سەباح ئیسماعیل، چەمك و ئێستێتیکای شیعر لە ئەدەبدا، ل ١٠.

## نۆستالژیای شاری نموونەیی "المدینة الفاضلة" یۆتۆپیا لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

"عەبدوڵڵا پەشێو"، وەك شاعیرێکی خاوەن ئەزموون لە پاشخانی ڕۆشنبیری و شاعیرێکی یاخی و سکاڵاکەر دژی سیستەم و ژینگە و دابونەریتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری بەردەوام بەدوای شارێکی وادا گەڕاوە و خەیاڵی پێیەوە خەریك کردووە، بەڵام وەك شاعیرێکی ڕۆمانسی زۆرجاران بە گەڕانەوە بۆ باوەشی یار و خۆشەویستەکەی، یان هەستی دۆزینەوەی شاری نموونەیی لە لای خۆشەویستەکەی و باوەشی ئەودا دۆزییوەتەوە، کە بە دوایدا وێڵبووە و هەمیشە بە ئۆمێدی دەست کەوتن و دۆزینەوەیەوە خەم و ژانی تەنیا و ئازاری نەگەیشتن بەم بەهەشتە شاعیریان کردووە بە شاعیرێکی نۆستالژی و ئاواتخواستنی بە گەیشتن و دۆزینەوەی ئەم بەهەشتە و شارە نموونەییە. بۆیە شاعیر لە شیعری (تەنیایی)دا، دەڵێ:

**((پەریی شیعر، ئەوەی کچی تەنیاییمە،**

**تۆم لانەبێ، لە تارمایی و کۆتەڵ دەکا**

**هەر ئیکسیری باوەشی تۆ**

**هەردوو بەهەشت،**

**گۆشەگیری و گەرمیی بەدەن، تێکەڵ دەکا..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٢٧–٢٨).**

لای شاعیر یۆتۆپیا و گەیشتن بە شارێکی بەهەشت ئاسا و دوور لە خەم و تەنیایی و گۆشەگیری، شارێك بۆ شاعیر هەڵگری بەختیاری و ئاسوودەیی ڕووح و ڕەوینەوەی تەمی نامۆیی و غەریبی و غوربەتی بێت، تەنیا باوەشی یارەکەیەتی.

"پەشێو" لە شیعرێکی دیکەدا، ئەو جارە بە تەواوی هەست بەوە دەکات، کەوا شوێنێك نییە خۆی و یارەکەی تێیدا بە ئاسوودەی بژین و دوور لە ئازار و ئەشکەنجە و چاوی ناحەز و یاسا قەدەغە کراوەکانی دابونەریتی کۆمەڵگە بێ، بۆیە بەدوای ئەم شارە نموونەییەدا وێڵە و لەگەڕاندا بەردەوامە، ئەمەش لە شیعری (ئەگەر دیسان)دا، بە ڕوونی دیارە و هەستی پێدەکرێ، کە دەڵێ:

**((هەر شەوێك و لە کونجێکا قۆناخ دەگرین،**

**تا ولاتێك بۆ خۆم و خۆت دەئەفرێنم**

**لە وێندەرێ**

**قەت ناهێڵم**

**شوینێك هەبێ لە لانەکەی ئێمە کرتر**

**قەتا ناهێڵم کەسێك هەبێ**

**لە تۆ شاد و تەڕ و برتر،**

**لەمن شێت و ئەڤیندار و بەرزە فڕتر)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٣٤٥).**

ئەوەتا ئەو شارەی "پەشێو" دەیەوێ دەبێ کڕ و بێ دەنگ بێ، دەبێ ئارام و هێمن و بێ خەم و ژان و ئازار بێ، دەبێ لە شادی و بەختەوەری ئاسوودەیدا هاوتای نەبێ و.....تاد، بێگومان ئەو شار و وڵات و شوێنە تەنیا لە خەیاڵ و زەینی شاعیر بوونی هەیە و یۆتۆپیای خەیاڵ و ئەندێشەی پەشێوە، ئەو شارە نموونەییە یە، لەسەر ئەرزی واقیعدا بوونی نییە.

## ـ نۆستالژیای شاری نموونەیی "المدینه الفاضلة" یۆتۆپیا له شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

"ئەنوەر قادر محەمەد"یش، به چەند شێوەیەك هەولّی داوه ئەم شاره نموونەیه له خەیاڵی خۆیدا دروست بکات و بەدوایی دابگەڕێ، بەمەش وێنەی پڕ له نۆستالژیای شاری نموونەیی و یۆتۆپیای دروستکردووه، ئەویش به سوود وەرگرتن و گەڕانەوه بۆ ئەفسانەکان و سوود وەرگرتن له ڕووداو و پاڵەوانەکانیان، بەلاّم بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی، نەك لاسایکردنەوه و دووبارەکردنەوەی ئەفسانەکان، ئەوەتا له شیعری (بانگ)دا دەڵێ:

**((کچەکەم تۆ له دڵما بووی**

**سیمرخ ئاسا دەمخستیته سەربالّی ناز،**

**به بێ پەروا بەناو درنجی شاخداردا،**

**دەمویست بڕۆین بۆ پشتی کێوی ئاسایش..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵه و زنار، ل ٧٩).**

وەکو دەبینین شاعیر، دەیەوێ شوێنێك بۆ خۆی و کچەکەی دەستەبەر بکات، لەو دیو پشتی کێوەکان و بەسەر باڵی سیمرخ، بۆی بچێ، چونکه تەنیا لەوێ دەتوانێ سەلامەت و پارێزراو بێت، چونکه

تەنیا (لەو دیو کێوی ئاسایش)دا، ئاسوودەیی و ئارامی هەیە، ئەم سەرزەمینە و ئەم وڵات و شارە شوێنێکی بەختیار و ئارام و بێ کێشە و گرفت نییە، ئەم کارەش تەنیا باڵندەیەکی ئەفسانەیی دەتوانێ ئەنجامی بدات و بۆ ئەو شوێنە بچێت، کە (سیمرخ)ە.

"ئەنوەر قادر محەمەد" شاعیرێکی هەست ناسك و نیشتیمان پەروەرێکی تاسەر لێوان سەخت و ئەوینی نیشتیمانە، "پەشێو"ئاسا، لەبەر کاریگەری و هەستی نەتەوەخوازی و مانەوەی لە وڵاتی غەریبی و بێکەسیدا، بۆیە لە ڕوانگەی ئەو، شاری نموونەیی و جوان و بەهەشت ئاسا، ئەگەر هەبێ لە جیهاندا، ئەوا بێگومان (کوردستان)ە، لێرەدا، یۆتۆپیا شاری نموونەییە لەسەر ئەرزی واقیعدا بوونی هەیە، کەچی هەر دەچێتە ژێر چەتری شاری نموونەیی و یۆتۆپیاوە، چونکە شاعیر جوگرافیای نەخشەی وڵاتان لە کوردستاندا بچووك دەکاتەوە و پێی وایە ئارامی و جوانی و بەختەوەری و ئاسوودەی، تەنیا لە کوردستانەکەی ئەو دەست دەکەوێ، لە شیعری (ئەگەر)دا، ئەمە دەخاتەڕوو، دەڵێ:

**((ئەگەر ئێوەش، لووتکەی بەرزە**
**بەفرینەکەی"پیرە مەگروون"تان دەبینی و**
**هۆگرییە بوون...**
**ئەگەر ئێوەش وەکو شارە نەشمیلەکەم،**
**دەبوونە فوای ئەسپەکەی شێخ،...**

**ئەگەر کچێکی چاو ڕەشی سلێمانی**

**جارێ بە ساقەتان دەبوو،**

**ئەی خەڵکینە:**

**ئێوەش وەك من،**

**خۆشەویستی کوردستاننتان،**

**لە دڵدا پیرۆزتر دەبوو، لە دڵدا گەورەتر دەبوو..)) (ئەنوەر قـادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ٩٤).**

## ـ نۆستالژیای شاری نموونەیی "المدينة الفاضلة" یۆتۆپیا لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

نۆستالژیای شاری نموونەی لەلای "سەباح ڕەنجدەر" بە شێوەیەکی جیاوازتر خۆی پێمان دەناسێنێ، بێگومان ئەزموونی "ڕەنجدەر"، ئەزموونێکی جیاوازترە لە هەردوو شاعیری دیکەوە"عەبدوڵلاً پەشێو و ئەنوەر قادر محەمەد" ، چ لەڕووی داڕشتنی وشە و دەستەواژەکان بۆ دیاردە و شتەکانی دەوروبەری بێ و چ وەك فۆرم و زمان و تەکنیکی نووسینەکانی، ئەوەتا "سەباح ڕەنجدەر" بۆ شاری نموونەیی و یۆتۆپیا، ناوێکی دیکەمان، بۆ دادەتاشی و پێمان دەناسێنێ، چونکە شاری نموونەیی، لای شاعیر شاری (پاکیزەکان)ە، وەك لە ڕۆمانەشیعری (زێوان)دا، دەڵێ:

**((لە دنیای ئەو دیو پاکیزەکان داوام لێ دەکەن**

**نمە ئاگای لە نمەی تەنیشتی نییە کەوتنی بە چی دەبێت..))**

**(سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم،ل ٨٩).**

شاعیر ئەو شارەی ئەو بەدوایدا دەگەڕێت و خەیاڵ و خەونەکانی ئەوی تێدا دێتە دی و بەرجەستە دەبێت، تەنیا شاری پاکیزەکانە، چونکە بەختەوەری و ئاسوودەی دڵ و ڕووح و دەروون لەو شارەیە،

چونکە خودی ناوی (پاکیزە) بە مانا و دەلالەتی پاك و بێگەرد و بێ کەم و کوڕی و بێ کێشە و گرفت دێت.

شاعیر لە دەقێکی دیکەدا و لە کتێبی (ساڵی سفر)دا، بیر و هۆشمان بۆ شارێك ڕادەکێشێ، کە ئەو شارە، بۆ شاعیر یەکمجارە، بۆی دەچێ و شتەکانی تۆمار دەکات، بێگومان خەیاڵکردن و خەون بینین لەلای شاعیر بۆ شارێکی بەهەشت ئاسا و شارێك لە جێگەی فرمێسك شادی و پێکەنین تێیدا میوان بێت، لە جیاتی خراپە چاکە سەردار بێت و لە شوێنی بێ ئاوی و بیابانی وشك، ڕەزوو باخ و بستان ئاوەدانی بکاتەوە، لە ئەنجامی بێ ئومێدی و نەدۆزینەوەی تروسکەی شادی و خۆشی و شوێنێکی ئارامەوە، لە خەیاڵی شاعیر سەری هەڵداوە، بۆیە شاعیر هیوا خوازە ئەوە خەونێکی خۆشی بێ و لەوەدا خەبەری نەبێتەوە و نەگەڕێتەوە ناو جیهانی واقیعی بۆ خەم و ژان و ئێش و ئازارەکانی ناخی، (خەونیش) هەڵگری مانا و دەلالەتی جیهانی دۆزینەوەی شتە بەرز و جوان و ونەکانە، بۆیە شاعیر خەون دەکاتە، هۆکارێك بۆ دۆزینەوەی ئەم شارە نموونەییە، ئەوەتا دەڵێ:

((یەکەمجارە دێمە ئەم شارەوە

پەرژین و

ڕەز و

باخی

تۆماردەکەم

سەریماندووم لەسەر دەرگای گەورەی دادەنێم
ئاواتە خوازم کتوپڕ خەوێك بێت و هەڵنەستمەوە
فریشتە جوامێری بەهەشتە
باڵندە بە هەزار باڵ بەرەو ئەو شوێنە دێن..))(سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل٢٧٣).

## ١-٨ نۆستالژیای خەم و حەسرەتی بەهەشتی ونبوو و گەڕان بەدوای ژیانی هەتاهەتای:

لەم جۆرە نۆستالژیایەدا شاعیر زیاتر بەدوایی ڕووحی خۆیدا وێڵ و سەر گەردانە و هەموو کات هەست بە نـامۆیی و تـەنیایی و نیگـەرانی دەکات، وادەزانـێ لەسـەر ئـەم زەمینـە نامۆیـە و لـە شـوێنی ئـارام و بەهەشتی خودایی دوورە و لە غەریبستانی ئەم زەمینەدا ژیان بەسەر دەبـات، ئـــەم جـــۆرە شـــیعرانە بـــە زۆری شـــاعیرانی ســـۆفیگەر و عیرفانیەکان پەنای بۆ دەبەن، بەڵام مەرج نییە، ئەمە تەنیا لـە دەقـە کـۆن و کلاسـیزمەکاندا بوونیـان هـەبێ، بـە پێچـەوانەوە لـە دەقـی هاوچەرخ و نوێدا پانتایـەکی زۆری داگـیر کـردووە، بەتایبـەتی دوایـی سـەرهەڵدانی هـەردوو جەنگـە گەورەکـەی جیهـانی، چـونکە مرۆڤیـان تووشی ڕەشبینی و نائومێدی زۆر کرد و مرۆڤ حەزی دەکرد بۆ ڕزگـار بوون لەباری نالەباری ژێر چەپۆکی شەڕ، بچووبوایە بەهەشتی خودا و بۆ هەمیشەیی لەوێ مابایەوە. کەواتە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو و ئەنوەر قـادر محەمـەد و سـەباح ڕەنجدەر"یش، بـێ بـەش نـیین لـە جیهان بینی و ڕوانینی ئەم جۆرە دەقانە.

## ـ نۆستالژیای خەم و حەسرەتی بەهەشتی ونبوو و گەڕان بەدوای ژیانی هەتاهەتای لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

"عەبدوڵڵا پەشێو" لە شیعری (گۆڕێك بۆ دوێنێ) لە پاش تەمنێك لە ناخۆشی و ئازار و نائومێدی و تەنیایی و بەسەر چوونی تەمەنی گەنجی و شکست هێنان و دووری لە یار و نیشتیمان و خەم و ناڕەزایی دەروون و هەستکردن بە لووتکەی نامۆیی و بە چۆك داهاتن لە دەست ئەو هەموو زوڵم و ستەم و زۆردارییەی بەرانبەر بە میللەتی دەکرێ، کە دەکوژرێ و دەبڕدرێ و گوند و زێدی خاپوور دەکرێ و شەرەف و ناموسی دەبردرێت، ئەو هەستەی لا دروست دەبێت، کە خۆزگە لەسەر ئەو جیهانە، بوونی نەبوایە و بە دوای بەهەشتێکی ونبوو دادەگەڕێت و داوای ژیانێکی هەمیشەی دەکات، لە بەهەشتی خودادا، کاتێ دەیەوێ بگەڕێتەوە لای خودای گەورە و بگات بەو بەهەشتەیی، کە ژیانێکی هەتاهەتایی تێدایە و هەمیشە و نەبڕاوەیە.

شاعیر دەڵێ:

**((گەڕامەوە بۆ دڵڵێدان**

**لە پەرستگەی پاکی یەزدان،**

**تا بە دڵی پڕ لە بڕوا**

**چاو ببڕمە ناو لەپی خوا**

**بەڵکو سرووش گیانم پڕ کا**

**سەدای ژینی پێشووم کڕ کا..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل١١٣).**

"پەشێو" لە دەقێکی دیکەدا، ئەوەندە بە حەسرەت و ژان و داخەوە بەسەربالآی نیشتیمان و دڵدار و هاوڕێ و ژیانی کۆن و سادەیی و.....تاد، بە دەستەواژەیەی زۆر حەسرەتدار و پڕ لە نۆستالژیا، کە (ئۆخەی)یە، شاعیر بە ئاواتی مردن و گەڕانەوەیە بۆ ناو خاك و گۆڕ، بەلآم بە مەرجێك ئەو خاك و گۆڕە لە کوردستان بێ، ئەوەندە نائومێد و ڕەش بینە بە سکالآیەکی سۆفیانە ڕوو لە خودا دەکات، کەوا ڕێگا چارەسەرێکی بۆ دابنێ، بۆیە لە شیعری (لە ڕوخساری شیعر گەڕێن)دا، دەڵێ:

**((ئوخەی مەرگی ناو ئازیزان،**

**چوونە ژوانی تاهەتایەی**

**خاك و خۆڵی بۆنداری کورد...**

**نەکرمم بچمە ژێر زەوی،**

**نە باڵدارم بچمە ئاسمان،**

**ئەدی چبکەم کردگاری کورد ؟ (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٤٤٥).**

شاعیر بێ دەسەلاتی خۆی ڕادەگەیێنێت و بە پاڕانەوە و نزاوە، دەڵێ: (خۆ من کرم نیم، یان باڵندەی ئاسمان نیم)، شاعیر سۆفیانە ڕوو لە بارەگایی خودا دەکات، داماو و گۆشە گیرە نازانێ چی بکات، لەبەر ئەو هەموو ژان و خەم و ئێشەی دڵی.

## ـ نۆستالژیای خەم و حەسرەتی بەهەشتی ونبوو و گەڕان بەدوای ژیانی هەتاهەتای لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

"ئەنوەر قادر محەمەد" وەك شاعیرێك ئەزموونی نووسینی ئەم جۆرەی نۆستالژیایەی کەمترە لە چاو جۆرەکانی دیکەدا، ئەمەش بۆ شاعیر و توانای شیعری شاعیر شتێکی ئاساییە، چونکە شاعیر ئەوەندەی گرینگی بە ناوەڕۆکی نیشتیمانی و هەستی نەتەوەخوازی و شیعری دڵداری و یاخیبوونی لە سیستەمی سیاسەت بۆ پەیامی شیعرەکانی داوە، ئەوەندە بایەخ و گرینگی بە تەکنیك و هونەرە جۆر بە جۆرەکانی دەقی شیعر نەداوە و لەگەڵ ئەوەشدا شیعری لەم جۆرەشی نووسیوە، بەڵام تاك و تەران و بە پەنجەی دەست دەژمێردرێت و لەیەك دوو شیعر تێناپەڕن، بۆ نموونە لە شیعری (خاك و زریان و خۆشەویستی)دا، ئەم جۆرە شیعرە بەرچاو دەکەوێت، شیعرێکی گەڕان و دۆزینەوەی ئەو ژیانە ئەبەدی و بەهەشتە ونبووەیە، کەوا شاعیر دەیەوێت بیدۆزێتەوە و بەدوایی شوناسێکی ڕەسەنی و حەقیقی دادەگەڕێ، کە ئەویش ژیانێکی نەبراوە و ئاسوودەیەکی بەختەوەرە، دەڵێ:

**((بە شمشاڵی پڕ فرمێسکی**
**ڕووبارێکی لە عەشقی پاك**
**ئەڕژانە ناو دەشتی ونبوون**
**ئەیوت لە کوێی؟ خوایە لە کوێی؟!**
**ئاخۆ جارێ ئەم هاوارە،**
**شەقەی باڵی پۆلە مەلی نەغمەکانم ئەگاتە تۆ؟!)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ٦٠).**

ئەوەتانێ دەبینین، کەوا شاعیر لە زاری شوانێك، چۆن چۆنی حاڵەتێکی سۆفیانەی بە دەقەکەی داوە، لە ڕێگەی پرسیار کردنەوە، کە ئەویش هێما و مانای دەلالەتی گەڕان و دۆزینەوە و تامەزرۆیی ئەم ژیانە ئەبەدییەیە، کە مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژووی بوونی خۆیدا، بەدوایدا گەڕاوە و لە ئاییندا نەبێ نایدۆزێتەوە، لە هەمان کاتدا شاعیر جیهانبینانە و فەلسەفیانە ڕۆڵی فەیلەسووف دەبینێت لە پرسیارە بەگومانەکانی بەتایبەتی دوای ئەوەی چەند جارێك وشەی پرسی (لەکوێی) دووبارە کردۆتەوە، ئەوەش مانا و دەلالەتی گەڕانە لە دوای شتە ونبووە نەدۆزراوەکان و نهێنیەکانی ژیان گرینگترینیان شادبووە بە دیداری خودای گەورە و نوری پاکی خودایە.

## ـ نۆستالژیای خەم و حەسرەتی بەهەشتی ونبوو و گەڕان بەدوای ژیانی هەتاهەتای لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

"سەباح ڕەنجدەر" نۆستالژیای بەهەشتی ونبوو، گەڕانە بە دوای ژیانی ئەبەدی، خەم و حەسرەتی گەڕانەوەی مرۆڤ، بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە هاتووە، کە بەهەشت و ژیانی هەمیشەییە، دوایی ئەوەیی شاعیر بێزار دەبێ لە ژیانی خۆی و کۆمەڵگە و هەست بە تەنیایی و نامۆیەکی زۆر دەکات، خەم و حەسرەتی ئەم جۆرە ژیانە دایدەگرێ و بە بەردەوامی، وەك ڕێبوارێکی هەمیشەیی خۆی بە میوان لەسەر ئەم دنیایە دەزانێت، "سەباح ڕەنجدەر" لەم جۆرە دەقانەی زۆرن لەناو دیوانەکانیدا، بەقەد دووهێند و سێ هێند لە "پەشێو و ئەنوەر جاف"دا، چونکە "سەباح ڕەنجدەر"هەمیشە ڕاز و نیاز و گفتوگۆییەکانی لەگەڵ خەوندایە، واتە شاعیر شاعیرێکی نەخەوتووە و نەبەئاگاییە، بۆیە چەمکی خەون و ڕەهەندی خەون و خەیاڵی زیندەخەونی تارمایی بەسەر تەواوی دیوانەکانی دا کێشاوە، چونکە شاعیر بەردەوام هەست بە غەریبی و غوربەتێکی ڕووحی درێژخایەن دەکات و لاوك بۆ ئەم بارودۆخە نالەبارەی ناو ژیاری کورد و ڕۆشنبیری کورد دەڵێ و بۆخۆ بەتاڵکردنەوە، هەمیشە لەو گەڕانە بەردەوامە و ماندوونابێت، چونکە لای شاعیر ئەم ژیانە سەرابە و

حەقیقی نییە، بۆیە لە شیعری (شوێن) لە کتێبی (سەد و یەك شەوە) بە دوایی ئەو شوێنەدا دەگەڕێت، کە لێی ونبووە و بەهیوا و ئاواتی دۆزینەوەیەتی دەڵێ:

**((هیچ شوێنێك نییە بۆی بژیم**

**گۆڕیش دەمی گورگێکە**

**کەڵبەکانی کەوتبن**

**بشمرم چاوانم بە کراوەی دەمێننەوە**

**ئەی دیداری خودا**

**شتێك لە نێوانمان ڕوویدا**

**پاشان کتێب و پەیامێك دۆزرایەوە)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم،ل ٩٤).**

لەم جۆرە نموونانەی لەبارەی نۆستالژیای بەهەشتی ونبوو، گەڕانەوە بۆ ژیانی هەمیشەیی و ئەبەدییەت، بەشێکی بەرچاویان لە شیعرەکانی "ڕەنجدەر" پێکهێناوە، چونکە شاعیر بە ڕووح و دڵ و دەروون غەریبە و هەست بە نامۆیەکی زۆر دەکات، هەمیشە سکالاٚ لە زەمەنی ئێستا دەکات و ئاواتە خوازی ژیانێکی پڕ لە خۆشی و دوور لەسەر ئەم زەمینە دەخوازێ، بۆیە شاعیر سۆفیگەرییانە دەقەکانی دەهۆنێتەوە، لەم دەقەی سەرەوە شاعیر پێی وایە، ئەو زەمیینە هیچ شوێنێکی تێدا نەماوە، تەنانەت گۆڕیش لەسەر ئەم زەمینە پڕ

غەوغایە، شوێنی ئومێد و ڕازی دڵی شاعیر نییە، بۆیە شاعیر لەم خەیاڵ و خەون و نامۆیەی دەروونی، تاکە ڕزگار بوون، گەیشتن و گەڕانەوەیە بۆ دیداری خودا، بێگومان گەیشتن و حەزی دیداری خودا، حەزێکی عیرفانی و توانەوەیی ڕووح و دڵ و دەروونی خودە لە توانەوە و دیداری خودادا، چونکە گەورەترین خەڵاتە بۆ مرۆڤ.

"ڕەنجدەر" لە دەقێکی دیکەدا، بەناوی (حەسانەوە) سۆفی ئاسا بە دوایی ڕووحی خۆیدا دەگەڕێت و پێی وایە تەنیا بە گەیشتن بە خودا و بەهەشتی خودا و ژیانێکی نەمریی دەتوانێ ئەو هەموو خەم و ناخۆشی و نەهامەتیەی ژیان لەبیر خۆی بباتەوە و دڵ و دەروونی ئاسوودە بێت، نۆستالژیای خەم و حەسرەتی بەهەشتی ونبوو و ژیانی نەمریی و هەمیشەی دوای ئەوەی مرۆڤ هاتووتە سەر ئەم زەمینە کەوتۆتە بیری مرۆڤەوە، چونکە لەسەر زەوی مرۆڤ خۆی بەنامۆ لە هەموو شتێك دەزانێت، تەنانەت حەزرەتی "ئادەم و حەوا"ش(سەلامی خوایان لەسەر) دوایی ئەو هەڵەی کردیان لە بەهەشت و دەرکردنیان و هاتنیان بۆ سەر زەوی هەموو شتێك نامۆ و نوێی بوون بۆیان، ئەوان زانیارییان لەبارەی هیچ شتێك نەبووە، بۆیە لەو ڕۆژییەوە تاوەکو ئەمڕۆ مرۆڤ هەوڵ و تێکۆشانی بۆ گەڕانەوەییە بۆ ئەو بەهەشتە و ژیانە نەمرییە، بە تایبەتی کاتێك هەست بە ناڕەحەتی و ئێش و ئازاری ژیان دەکەیت، "سەباح ڕەنجدەر"یش،

لەو دەقەی خوارەوەی، هەمان تـرس و نـامۆیی و نۆسـتالژیای هەیـە، کاتێ دەڵێ:

**((سوپاس و دروود بۆ ئازارەکانی ژیان**

**مرۆڤ دوای مردن**

**پێویستی بە چوونە بەهەشتە**

**جۆگەلە بباتە بن درەختی ئومێد و نەمریی**

**میوە لە شکۆمەندی دوای زەردەخەنە زیاتر نییە**

**خودایە ئاگریکم بۆ دەستنیشا بکە**

**چاوی هەموو بینینەکان بنووسێت**

**دلّم دەتوێنمەوە گوێڕایەڵی دەبم..))(سەباح ڕەنجدەر، سی سـالّ شیعر، بەرگی دووەم، ل ١١٨).**

شاعیر سوپاسی خوای گەورە دەکات، چونکە پێی وایە، ئەگەر لە ژیاندا ئەو هەموو ئـازار و ئەشـکەنجەی ڕووحـی و عـەقڵی و دەروونـی نەبوایە، ئەوا نەیدەتوانی و ئارەزووی ئەوەی نەدەکرد داوای بەهەشت و ژیانێکی نەمریی لەناوبەهەشت و لە نزیك خودا بکات، بۆیە "سـەباح ڕەنجدەر" دان بەو ڕاستیە دادەنێت، کەوا مرۆڤ هەتا تووشـی ئـازار و خەم و ئێشی دەروون نـەبێت و ژیـان چـۆکی پێدانـەدات، هـیچ کـاتی هەست بە خۆشی و شادی و بەختەوەرییە لە دەستچـووەکان ناکـات، کەواتە شاعیر دەیەوێت بـۆ پـڕ کردنـەوەی ئـەو بۆشـاییەی، کـەوا لـە

ناخیدا دروست بووە، بە خەیاڵ و گەیشتن بە بەهەشت و ئەبەدییەت لەناو ژیانی بەهەشتدا، جارێکی دیکە، ئەو شکۆمەندییە بۆ مرۆڤ بگەڕێتەوە، ئەوەتا "ئەحلام موستەغانمی" دەڵێ: ((بۆیە ئێمە دەنووسین، تا ئەوانەی لە کیسمان چوون و ئەوانەشی لەناکاو لێمان دزراون، هەموویان بەدەست بێنینەوە))(٢٤٨).

شاعیریش بە شێوازێکی تایبەت بە خودی خۆی ئەم جۆرەی نۆستالژیایەی بەرهەم هێناوە، بەتایبەتی نۆستالژیای توانەوە و گەیشتن بە دیداری خودا، شاعیر لەم دەقەدا سۆفییەکی، تا پلەی کۆتایی و دوا پلەی سۆفیەتییە، کە توانەوەیە، ئەوەتا، دەڵێت: (دڵم دەتوێنمەوە گوێڕایەڵی دەبم). لێرەدا شاعیر، وەك هەر سۆفی و عاریفێك دەیەوێ لە ڕێگەی (دڵ)ەوە، بگاتە پلە و پایەی گەشتن بە خودا، چونکە شاعیر بۆیە بە گوێی دڵی دەکات و گوێڕایەڵی دەبێ، لەبەر ئەوەی وێنەی خودا و جوانی خودا لەناو دڵیدا بەرجەستە دەکات، چونکە دڵ کانگەی گەیشتنە بە حەقیقەت.

(٢٤٨) جەبار سابیر، لەو دیو هەناسەی شیعرەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٢٦.

## ٩-١ نۆستالژیای خەم و حەسرەتی پیری و ترس لە مردن:

مـەرگ و مـردن یەکێکـە لـە ناوەرۆکـە فیکریـەکانی فەرهـەنگ و شارستانیەت، بابەتێکە کـە بـە درێـژایی مێـژووی مرۆڤایـەتی زەیـن و ئەندێشـە و خـەیاڵی مرۆڤـی بەخۆیـەوە خـەریك کـردووە و مـرۆڤ بـە تێپەڕبوونی کات لەسەر ئەم جـۆرە پـرس و بابـەت و باسـانە بەچـەند شـێوەیەك و جـۆری جیـا قسـەی کـردووە، بـیر و بۆچـوونی خـۆی دەربڕیـوە، ((بیرکردنـەوە لـە مـردن، هۆکـاری سـەرەکی تـرس و دڵەڕاوکییە لە مردن))[٢٤٩] بۆیە پیری و بیرکردنەوە لە تەمەنی گەنجی و ڕۆژگاری پڕ لە سەختی و مووی سپی و هەڵکشانی تەمـەن، یەکێکـە لـە بنـەما دیـار و بەرچـاوەکانی نۆسـتالژیا و خـەم و حەسـرەتێکی گەورەی مـرۆڤ، بـەڵام بـیر و بۆچـوون و هەسـتی نووسـەر و شـاعیران سەبارەت بـەم بابەتـە سـەرنجڕاکێش و گـرینگترە، چـونکە ئـەوان بـە هەست و سۆزی خۆیـان لـەبارەی بابەتـەکانی دەوروبـەریان دەدوێـن، بەمـەش دەقێکـی نۆسـتالژیای تـاك و خـەم و داخ و ژانـی دەروونـی تاکمـان بـۆ بەرهـەم دەهـێنێ و تـرس و دڵـەڕاوکی بـە شـاعیر و

(٢٤٩) مهرانگیز کاظمی، روانشناسی مرگ، مجله اطلاع رسانی همگانی، ص ٦٢.

نووسەرانەوە دیارە، بۆ ئەم ڕۆژە کە هەر دەبێ بێت، لەبەر ئەوەی مردن لە ئەدەبی هاوچەرخ و سەردەمی ئێستادا ((مردن وەکو ئامانجێکی ڕاستەقینەی ژیان سەیر دەکرێت و لێکدەدرێتەوە))[٢٥٠]، بە شێوەیەکی واقیع بینانە و دوور لە زیادەڕۆی لە ڕادەبەدەر.

(٢٥٠) جاك شورون، الموت فى الفكر الغربى، ت: كامل يوسف حسين، مراجعه امام عبدالفتاح امام، عالم المعرفه، الكويت، ١٩٨٤، ص ١٨٩.

## - نۆستالژیای خەم و حەسرەتی پیری و ترس لە مردن لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

"عەبدوڵڵا پەشێو" وەکو شاعیرێکی هۆشیار و بەئاگا لە مەترسیەکانی ڕۆژگار و دێوەزمەی غوربەت و تەنیایی تاراوگە و ترسی سەرنانەوە و مردن لە بێ کەسیدا، لە شیعری (دوو ئاوابوون)دا، دەڵێ:

**((دانی ئێواران**

**سەرنج دەدەمە ئاوابوونی خۆر...**

**دەزانم، منیش،**

**زوو بێ یا درەنگ، دەبێ ئاوابم**

**بەڵام، مخابن، دەمی ئاوا بوون**

**وەکو زەردەپەر سیحراوی نابم)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٢٨٥).**

شاعیر لەڕێگەی بەکارهێنانی وشەکانی (دانی ئێواران، ئاوابوونی خۆر، زوو، درەنگ، زەردەپەر و.....تاد)، دەقێکی تەواو لە نۆستالژی بەرهەم هێناوە، چونکە خۆر ئاوابوون، بە مانا و دەلالەتی کۆتایی تەمەن و نزیکی مەرگ دێ، هەروەها شاعیر دڵنیایە هەر دەبێ

بمرێ و خۆری ئاوابێ، بەڵام ئەوەی شاعیری نیگەران کردووە و ئەم ترسەی خستووتە دڵ و دەروونی، ئەوەیە ئێستا تەمەنی بەرەو هەڵکشان چووە و مووی سپی سەری تەنیوە و نیشانەی پیری و بێ تاقەتی لەسەر جەستە و ڕوخسار و دڵ و تەنانەت نووسینەکانیشی دیارە، بۆیە حەسرەت بۆ ڕۆژگارانی گەنجی و جوانی و هێز و تین و تاقەتی خۆی دەخوات، ئەمەش لە مانایی دەلالەتی وشەی (زەردەپەڕ) و (سیحراوی) خۆیان دەنووێنن.

"پەشێو" بەردەوام سکالا لە بەسەر چوونی تەمەن و پیری و مووی سپی دەکات، چونکە، وەکو شاعیران پێیان وایە، ئەوان خاوەنی پەیامێکن و دەیانەوی ئەم پەیامە بەسەرجەم جیهان بگەینن و مرۆڤ و مرۆڤایەتی ڕزگار بکەن لە نەهامەتی و نەزانین، "پەشێو"یش، ترس و نیگەرانی ئاوابوونی تەمەنی هەر لەو ڕوانگەیەوەیە کە هێشتا نەیتوانیووە، بگات بەوەی کە دڵ و ویستی شاعیر دەیەوێ، بۆیە دان بەو حەقیقەتە دادەنێ و باس لە هەڵکشانی تەمەنی خۆی و گەیشتن بەرەو وێستگەی کۆتایی تەمەن دەکات، کە (کەنار)ە، چونکە (کەنار) دەلالەتی کۆتایی ڕێگا و گەیشتنە شوێنی وەستان لەخۆ دەگرێ، کە لەم دەقەدا بەمانای پیری و نزیکبوونەوە لە مردن و میوانی مەرگ دێت، ئەواتا لە شیعری (من و پنجێك گیا)دا، دەڵێ:

**((چما منیش پنجێك گیانیم؟**

**ئەدی بۆچی**

**ساڵە و ساڵ، بەهارە و بەهار**

**سەوزاییەکەم، دادەمرکێ و**

**زێتر دەکێشم بەرەو کەنار)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٣٣٤).**

ترس و نیگەرانی لە مردن و پیری و ئاوابوونی وەرزی تەمەن لە وشەکانی: بەهار ⟵ گەنجی ⟵ سەوزایی

هێما و نیشانەی گەنجییەتی و ڕۆژانی خۆشی شاعیرە، بەڵام نەمانی سەوزایی و دامرکانە ⟵ بەرەو کەنار چوون، نیشانە و دەلالەتی نزیکی مردن و کۆتایی تەمەنە.



## ـ نۆستالژیای خەم و حەسرەتی پیری و ترس لە مردن لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

"ئەنوەر قادر محمەد"، وەکو شاعیرێکی تاراوگە و دوورە ولاَتی، ئەگەر تەواوی بەرهەمەکانیشی نەبێت، بەشێکی زۆریان هەڵگری چەمك و دەلالەتی غوربەت و تاراوگەن و لە تاراوگەدا نووسراون، ئەوەتا شاعیر لە شیعری (دڵە ڕاوکە)دا، دەڵێ:

**((ڕووی هەنگاوم بەرەو هەڵدێرە**

**ئەی کچە چاوترێی ڕەشەکەم**

**ئەی چرۆ دوو بەهارییەکەم،**

**کێ دەزانێ تۆ تاکو کەی**

**لە پایزە دەشتی تەمەنما،**

**لەناو ڕۆشنایی دیدەما**

**بە بێباکی بۆ خۆت یاری و سەما دەکەی؟)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ١٦٣).**

شاعیر خۆی هەست بەو ڕۆژە کەمانەی، کەوا لە تەمەنیدا ماوە دەکات، نازانێ و دڵنیا نییە، کە تەمەن چیتر ڕێگای پێدەدات لەو غەریبی و غوربەت و دوورە وڵاتییە یاد و بیرەوەری خۆشەویستان و

کەسە نزیکەکانی خۆی بکاتەوە، یان نا؟ بۆیە (ڕووی هەنگاوم بەرەو هەڵدێرە) و (لە پایزە دەشتی تەمەنما) بەهێزترین دوو ڕستەی ئەم دەقەن و وێنەیەکی تراژیدی و پڕ لەترس و نیگەرانی دروستکردووە، بەلابردنیان، ئەوا دەقی نۆستالژیا بوونی خۆی لەدەست دەدات، چونکە (هەڵدێران، پایز، تەمەن) وشەگەلێکی لێوان لێون لە چەمکی و ڕەهەندی نۆستالژیا، بە ئاشکرا خەم و ترس و نیگەرانی بە شاعیرەوە دیار دەخەن، خودێکی نائارام و دەروونێکی شڵەژاوی خۆی دەخاتە ڕوو.

## ـ نۆستالژیای خەم و حەسرەتی پیری و ترس لە مردن لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

"سەباح ڕەنجدەر"یش، وەکو شاعیرێکی هاوچەرخ و خاوەن کۆمەڵێك بەرهەمی ئەدەبی بەرزە، دەقەکانی بەردەوام بەشێکی زۆری هەڵگری چەمکی ژیان و مردن و ترسی مردن لەخۆ دەگرێ، باسکردنی ئەم جۆرە پرس و خواسە لای "سەباح ڕەنجدەر"، پرسێکی زۆر گرینگە و شاعیر بایەخێکی زۆری پێداوە، بەتایبەتی لە ڕووە فەلسەفیەکەیەوە، "سەباح ڕەنجدەر" بەردەوام لە پرسی مردندایە، ترسی مردنی لێنیشتووە، چونکە مردن بۆ هەموو مرۆڤێك ڕاستییەکی تاڵە و بەئاسانی پەسەند ناکرێت.

"سەباح ڕەنجدەر" بەردەوام هەوڵی داوە، لەڕێگەی خەونەوە باسی بابەتەکان بکات، چونکە ژیان لای شاعیر خەونێکی سەرابیە و حەقیقەت و ژیانی هەمیشەیی دوای مردنە. وەکو "ڕۆسۆ" دەڵێ: ((ئەگەر خەونەکانم ببێتە ڕاستەقینە و هەموویشی لە واقیعدا بێتە دی، ئەوە هێشتا دابین نابم پێی، بەڵکو لەمە زیاتر بیردەکەمەوە خەو دەبینم، چونکە ئارەزووەکانە سنووریان بۆ نییە، لە دەروونمدا هەست بە بۆشاییەك دەکەم هەرچەند دەکەم، بە هیچ شتێك بۆم

پڕنابێتەوە))[٢٥١]. بۆیە شاعیریش دەیەوێ ئەم بۆشاییانەی دەروونی بە خەون و زیندەخەون پڕ بکاتەوە، لەبارەی ئەم جۆرەی نۆستالژیای خەم و حەسرەتی پیری و ترسی مردن شاعیر لەدەقی (کووپە لە میوانداری ماسیدا)، دەڵێ:

**((لەسەر خۆتر بەرەو لام وەرە ئەی پیری**

**بلیتی سوار بوونی چەرخ و فەلەك**

**هێشتا سووڕی خۆی تەواو نەکردووە..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل ٢٧).**

شاعیر داوای نەهاتنی مردنی لەناکاو دەکات، دەیەوێ جارێ پیری بەرۆکی نەگرێ، چونکە شاعیر مەبەستیەتی، ئەو ئەرك و ئامانجانەی پێ سپێردراوە و دەیەوێ پێیان بگات، هێشتا نەهاتوونەتە دیی.

لە لایەکی دیکە و لە ئاستێکی دیکەی قووڵی دەقەوە شاعیر پێمان دەڵێ: هێشتا پیرنەبوویمە و توانام ماوە بۆ گۆڕانکاری و داهێنان، بەڵام زۆر نیگەران و شڵەژاوە، کە پیری لە دەرگای بدات و ئەم کاروانەی پێ کورت بکاتەوە، لێرەدا شاعیر بە شیعرییەت قسە دەکات، نەك بە زمانی فەرهەنگی. یان لە شیعری (چاو) باسی پیربوونی خۆی دەکات و پێی وایە ئیتر گەیشتووەتە کەناری تەمەن،

(٢٥١) خورشید ڕەشید ئەحمەد، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا، چاپخانەی الجاحظ، بغداد، ١٩٨٩، ل ٤٠.

بەتایبەتی کاتێ دەڵێ: (تەمەن، ساڵ، نقوومبوون، کەنار، ترسناك، نەوەیەك...)، ئەم وشانە وشە و دەستەواژەی پیری و ترسی مردن و دڵەڕاوکێ و غوربەتێکی نۆستالژیای لەلا دروستکردووە، چونکە شاعیر ئێستا، کەوتووەتە تەمەن و بووەتە جوامێر، ئەمەش مانایی پیربوون و کەناری تەمەنە. شاعیر دەڵێ:

**((تەمەن لە ساڵەکان نقوم بوو**

**لە کەنارە ترسناکەکانیدا**

**نەوەیەکم پێوەندی کرد بە ڕووناکی لە ناکاو)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ٤١٥).**

## ١٠-١ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سروشت:

گەڕانەوە بۆ باوەشی سروشت ناوەرۆکێکی دیار و گرینگی شیعر و شاعیرانی ڕۆمانسیە، چونکە ئەوان پێیان وابوو، بۆخۆ ڕزگارکردن و هەڵاتن لەو ژیانە پڕ لە کێشە و گرفتەی سەردەم، بە تایبەتی دوای شالاوی جیهانی تەکنەلۆژیا و ئامێرەکانی سەردەم و پیس بوونی ژینگە، بە ئامێرکردنی مرۆڤ، زیاتر ڕەشبینی و نائۆمێدی ڕووی لە شاعیران کرد، بۆ ئەمەش گەڕانەوە بۆ سروشتیان بە یەکێك لە چارەسەرە هەرە گرینگەکان و گونجاو دادەنا، شاعیری هاوچەرخیش لە ئەدەبی کوردیدا بەشێوەیەکی هونەری و داهێنەرانەوە ئاوڕیان لەم بابەتە داوەتەوە، چونکە دنیای نوێ و سەدەی نوێ، سەدەی سەرمایەداری و بازرگانی و بازاڕی ڕەش و جیهانی پەترۆڵ و نەوت و گاز و ژیانی ئاڵۆزە، بۆیە ئیدی لەلای شاعیران سوود وەرگرتن لە سروشت و بەکارهێنانی بە شێوەیەکی هونەرییانە ئامانجێکی دیار و خاسیەتێکی گرینگی و بەبایەخی شیعری نوێ و هاوچەرخ بووە.

نۆستالژیا و گەڕانەوە بۆ سروشت و ژیانی کۆنی گوند و چیا و دەشت و کانی و ڕووبار و شوانکاری و.....تاد. باسێکی باش و کاریگەرە، بۆخۆ بەتاڵکردنەوە لەو خەم و ژانی دڵ و دەروون و ناخی مرۆڤدا.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سروشت لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

"عەبدوڵڵا پەشێو"، وەك شاعیرێکی نوێی ئەدەبی کوردی، بە شاعیرێکی ڕۆمانسی هەژمار دەکرێت، چونکە ناوەرۆکەکانی تەژین لە ڕەشبینی و نائۆمێدی و یاخیبوون و ڕەتکردنەوەی واقیع و .....تاد، بۆیە سروشت و گەڕانەوە بۆ سروشت بابەتێکی گرینگ و دیاری ئەم شاعیرەیە، تایبەتمەندی گەڕانەوە بۆ سروشت بەلای "پەشێو" سروشتی کوردستانە، چونکە شاعیر لە تاراوگە و دوورە وڵاتی دەژیت و هەر (بەردێك، تۆزێ، خۆڵێ، وێنەیەك، ئەستێرەیەك، مانگ و.....تاد)ی کوردستان، بۆ شاعیر مایەی تێڕامان و بەهەشتی ڕووحی و خەم و ژانی دوورە مەفتەنی پێ دەشواتەوە. لە شیعری (گۆڕێك بۆ دوێنێ)دا، دەنووسێت:

**((گەڕامەوە بۆ پێکەنین**
**بۆ ڕووناکی، بۆ خۆشیی ژین**
**بۆ چیمەنێك لە بەهاردا**
**بۆ دیمەنێك لە گوڵزاردا...**
**گەڕامەوە بۆ جوانی**
**بۆ سروشتی و کامەرانی..**

**بۆ ورشەیەکی نێو چەمان**

**بۆ ئاوازێکی ژێی کەمان..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ١١١).**

شاعیر دەیەوێت ئەو خەم و ناخۆشـی و ژانـەی دوێنێـی تاراوگـە و بێ وڵاتی و دوورە وڵاتی لە بـیر بکـات و بـە گەڕانـەوە بـۆ سروشـت و جوانی کوردستان هەموو ئێش و ئازارێکی لە بیر بچێت، ئەوەتا لە نێو تێکستەکانیدا هەست بە شادی و ئاسوودەیی ڕووحی شاعیر دەکەین، هەر ئەوەشە وای لە "ڕۆسۆ"کردووە، بڵێ (گەندەڵی لە شارستانییەت سەرچـاوە دەگرێـت)، بۆیەشـە ڕێگـا چـارەیەك کـە "ڕۆسـۆ" بـۆ بەرەنگاری کردنی گەندەڵی و لە ڕێگـا دەرچـوونی کۆمەڵگـە پێشـنیاز دەکات (گەڕانەوەیە بۆ سروشت)[٢٥٢].

یان لە دەقێکی دیکەدا، دەبینین "پەشێو" چـەندە بـە تامـەزرۆ و حەسرەتەوە، دڵخۆشی خۆی دەردەبڕێ، بۆ گەڕانەوە، بۆ ژیانی گوند و سروشـت و جـوانی سروشـتی کوردسـتان، کـاتێ لـە شـیعری (لەڕوخساری شیعر گەڕێن)دا، دەڵێ:

(٢٥٢) لیلیان فورست، رومانتیسم، ترجمەی: مسعود جعفری، چاپ اول، نشر مرکز، تهران، ١٣٨٠، ص ٥٥.

**((ئۆخەی ئاسمان،**

**ئۆخەی زەوی، ئەستێرە و مانگ،**

**ئۆخەی هاوین، پایز، زستان، بەهاری کورد...**

**ئۆخەی ئاوی زنە و کانی، دۆی کوندەلان**

**ئۆخەی خەوی بن سابات و دەواری کورد..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٤٤٤).**

شاعیر وشەی (ئۆخەی)، کە هەڵگری خەم و ژان و حەسرەتێکی نۆستالژی زۆر قووڵە، بۆ گەڕانەوە بۆ سروشت و نیشتیمان و زێد بەکاری هێناوە، چونکە شاعیر، وەك وێنەگرێکی سروشت ئاسا دیمەنی ئەم ژیانە سروشتییە خۆشەمان بۆ دەخاتە ڕوو لە زەمەنی کۆن و کاتی ژیانی گوند و بەهۆی وشەکانی، وەك: (ئاسمان، زەوی، پایز، زستان، بەهار، هاوین، ئاوی کانی، دۆی ناو مەشکە، خەوی بن سابات، ڕەشماڵ )، شاعیر لەرێگەی ئەم وشە سادە و کوردیانەوە، توانیوویەتی سۆزێکی وا دروست بکات، کە خوێنەر بە ئاشکرا هەست بە دەروونی شاعیر بکات، سۆز و هەڵچوونی دەروونە، واتە دەنگی خەم و ژان و هیوا و ئاوات و ئازاری ناخە، بۆیە " سانت بێڤ ١٨٠٤ – ١٨٦٩"، لە کتێبی (لێدوانەکانی دوو شەمووان ) دا، دەڵێ: ((بە بۆچوونی من ئەدەب لە مرۆڤ جیانییە، دەکرێ چێژ و زەوق لە بەرهەمێکی ئەدەبی وەرگرم، بەڵام ناکرێ بڕیاری لەسەر بدەم بەبێ

ناسینی نووسەرەکەی ))[٢٥٣]. بۆیە ئەگەر"پەشێو"یش، لە تاراوگە و دوورە وڵاتی و غەریبی و غوربەتی نەبووایە و ئێمەش ئاگاداری بە شێکی زۆری ژیانی نەباین، ئەوا نەیدەتوانی بەم شێوە ورد و جوانە ئەم گەڕانەوەیە، بۆ سروشت ئەنجامبدات، ئێمەش کەشفی بکەین.

(٢٥٣) خورشید ڕەشید ئەحمەد، ڕێبازی ڕۆمانسیکی لە ئەدەبی کوردیدا، چاپخانەی، الجاحظ، بغداد، ١٩٨٩، ل٤٠.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سروشت لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

وەکــو شــاعیرێکی غــەریبی و غوربــەت و تاراوگــەیی، هــەمان ئەزموونیان هەیە، بۆ گەڕانەوە بـۆ سروشـت و سروشـتی کوردسـتان، کەواتە ئەزموونی شیعری "عەبدوڵڵا پەشێو، ئەنوەر قادر محەمەد" لە یەکەوە نزیکترە، وەك لە "سەباح ڕەنجدەر".

"ئەنوەر قـادر محەمـەد"، لـە شـیعری (داسـتانی ئـەڤینی سـێوەخان)دا، بـە شـێوەی گێڕانەوەیـەکی حەکایـەت ئـامێز، وەك درامایەك وێنەی گوندێکی کوردستانمان بۆ دەکێشـێ و بـە شـێوەیەك ئـەم تێکـەڵاو بوونـەی لەگـەڵ سروشـتدا کـردووە، وەك دوو عاشـق نەتوانن لە یەکتری دابڕێن، وەسفی ئەم دێیە دەکات، تەنانـەت شـتە ورد و تایبەتییەکانیش لەبیر ناکات، کاتێ دەڵێ:

**((دێیەك هەبوو،**
**بە زستانان کراسی بەفری دەپۆشی،**
**بەهارانیش گوڵاڵەی دەکردە بەری،**
**ڕەز بەهاوین کراسی ئاودامانی بوو،**
**پایزانیش خۆی هەڵدەژەند لە گەڵای زەردی ئاڵتوونی..**
**دێیەك هەبوو، دێیەك چ دێ؟!**

**دێی قەد شاخی کوردستان بوو**

**چەمێك بوو بووە کەمەرەی زیوینی قەدی**

**هەوری، سپی... سپی، جارجار دەبوو،**

**بە چەتری شیرینی سەری..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل١٣٧).**

شاعیر باسی هەموو وەرزەکانی ساڵی بە ئەرك و خەسڵەتەوە کردووە، باسی شاخی کوردستان و چەم و هەور و.....تاد، وەك خۆیان وێناکردووە، لە کاتێکدا خۆی لە دەرەوەی وڵات دەژی، چونکە ئەم دەقەی لە تاراوگەدا، لە (لینگراد) نووسیووە، بە شێوەیەکی وا بەسۆز گەڕاوەتەوە، بۆ سروشت و دار و بەرد و ئاو و کانی کوردستان، وەك فۆتۆگرافێك بە ناو سروشتدا دەگەڕێ و دڵ و ڕووح و دەروونی پێ خۆش دەکات.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ سروشت لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

ئەزموونی گەڕانەوە بۆ سروشت و جوانی و دیارییەکانی سروشت بۆ مرۆڤ، بە شێوازێکی تایبەتی خۆی دەخاتە بەرنامەی کاری دەقەکانی و هەوڵی داوە ڕووحێکی فەلسەفی زیاتریان پێ بدات، لە شاعیرانی پێش خۆی و تەنانەت سەردەمی خۆشی، بۆیە شاعیر سروشت بە پزیشکێك، یان سفرەیەکی خودایی دادەنێت، بۆ مرۆڤ و هەموو زیندەوەرانی سەر ئەم زەمینە، لە کوردەواری خۆمانیش دەڵێن: "خێری خوای، گیای بەهاریێ". شاعیر لە کتێبی (ساڵی سفر)دا، دەنووسێت:

**((سامانی سروشت چێشتی خودایە**

**بۆ**

**ئادەمیزاد و**

**ئاژەڵ و**

**پەلەوەر و**

**زیندەوری لێ ناوە..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل٢٩١).**

یان لە کتێبی (سرودی زەوی )دا، بەم شێوەیە، دەڵێ:

**((سروشت پزیشکێکی خۆڕسکە**

**خەمۆکیمان چارە دەکات..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل٣٤٠).**

شاعیر پێیوایە، هەر کاتێ خەم و ناخۆشی و ئازارمان لەناوناخ و دڵ و دەروونیدا بەدی کرد، پێویستە ڕوو لە سروشت و پێکهاتەکانی بکەین، چونکە تەنیا ئەوە دەتوانێ خەمەکانمان چارەسەر بکات و دکتۆری دەردی دڵی پڕ خەم و ژانمان هەر سروشتە.

شاعیر نامۆ و تەنیایە لە دەست ئەم ژیانەی مرۆڤی بە ئارەزووی خۆی دەکاتە، هەڵگری خەم و ژان و دەرد و نە هامەتی، یان ئەم سەردەمەی ئێستا، کە ژیان تەنیا بووەتە سەرمایە و هیچ شتێك لە شوێنی خۆی نەماوە و هەستەکان، سۆزەکان، پەیوەندییەکان لەسەر هێڵێکی زۆر باریك دەڕۆن، هەرکە زانیمان پچڕا دەپچڕێ، بەمەش شاعیر داوا دەکات، ڕوو لە سروشت و پێکهاتەکانی بکەین، بۆیە ڕێگا چارەش، گەڕانەوەیە بۆ سروشت، هەر ئەوەش بوو، کە(ڕۆسۆ) هەوڵی بۆ دەدا و کردبوویە سەر مەشقی کارەکانی خۆی.

# بەشی دووەم

◄ تەوەری یەکەم
دووەم

- جۆرەکـــانی نۆســـتالژیای گشـــتی لـــە شـــــیعرەکانی"عەبــــدوڵڵا پەشـــێو، ئەنوەر قادر محەمەد، سەباح ڕەنجدەر"دا.

تەوەری یەکەم

## دووەم

- **جۆرەکانی نۆستالژیای گشتی لە شیعرەکانی "عەبدوڵلا پەشێو، ئەنوەر قادر محەمەد، سەباح ڕەنجدەر"دا.**

## دووەم// : نۆستالژیای گشتی/ کۆ(جمعی):

ئەم جۆرە نۆستالژیەی شاعیران گەڕانەوەیە بۆ مێژوویی نەتەوەیی و ئەفسانە کۆنەکان و کولتوور و کەلەپووری کۆنی نەتەوەیی، شوێنەوار و کەسایەتییە ئایینی و سیاسی و مێژووییەکانی و شاعیرانی نەتەوەیی و ڕووداو و بەسەرهاتە سیاسییەکانی نەتەوەیی لەخۆدەگرێ، شاعیران بەم گەڕانەوەییە هەست و نەستێکی کۆ و

گشتی دەبەخشن، چونکە لەم جۆرە نۆستالژیایە هەموو خەڵك بەشدارە و خەم و حەسرەتەکان و خۆشی و شادیەکان پەیوەستن بە تەواوی کۆمەڵگەوە، گرینگترین بەشەکانی ئەم جۆرەی نۆستالژیا لەخوارەوە دەخەینەڕوو:

## ٢- ١ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ ئەفسانە کۆنەکان:

ئەفسانەکان بەرهەمی خەیاڵی مرۆڤە سەرەتاییەکانن، بەڵام لە ئاستێکی بەرزی مەعریفیدا، بۆیە لەم بارەیەوە"د.مەولوود ئیبراهیم حەسەن" دەڵێت: ((ئەفسانە بەرزترین و گرینگترین و کۆنترین ئاستی بیرکردنەوەی مرۆڤە و مرۆڤ بەردەوامە لەم جۆرە بیرکردنەوەیە بە شێوازی جیاجیا))[٢٥٤]، بەکارهێنانی ئەفسانە و ڕەمزە ئەفسانەییەکان لە شیعری نوێدا گرینگی بەرچاوی پێدراوە، بووەتە باس و خواسی ڕەخنەگرانی ئەدەبی، چونکە لەوەوە سەرچاوە دەگرێ، کە ڕەمزە ئەفسانەییەکان وێنەیەکی هەستی دروست دەکەن، کە ئەم وێنەیە بەرهەم هێنی واتا و دەلالەتی قووڵە و گرینگی ئەفسانەکان لەو ئامادەبوونە سەرچاوە دەگرێ، کە لە ڕۆشنبیری گشتیدا هەیەتی، زانا و بیرمەندەکان لەسەدەی (١٩)دا، بایەخێکی زۆریان بە لێکۆڵینەوە ئەفسانەکاندا، ((بەتایبەتی زانایانی

(٢٥٤) مەولوود ئیبراهیم حەسەن(د)، پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی، ل٢٥.

ئەنترۆپۆلۆژیا لایان وابوو ئەفسانە بەشێکی دانەبڕاوە لە سیستەمە کۆمەڵایەتی و ناتواندرێ لە کۆمەڵگە جیابکرێتەوە))[٢٥٥]. کەواتە، ئەفسانەکان هەڵگری هەست و نەستی کۆن و هەموو تاکێکی کۆمەڵگە جیاوازەکان تێیدا بەشدارن. "بۆرخیس" لەبارەی گرینگی ئەفسانەوە، دەڵێت: ((ئەفسانە خەونێکە لە هەموو قۆناخێکی خوێندنەوەدا گوزارشتێکی تازە هەڵدەگرێت، واتا هەر بەشێکی مەبەستێکی هەیە...، هەروەها خودی وشەی ئەفسانە شیاوی ڕێزلێنانە))[٢٥٦].

ئەفسانەکانیش لەڕووی ژینگەی و درووستبوونیانەوە، دوو جۆرن، یان ئەفسانەیی خۆماڵین و هی نەتەوەی شاعیرە، یان ئەفسانە جیهانییەکانن و لای ئەدەبی هەموو نەتەوەیەك ئاشکرایە و دیارە.

(٢٥٥) أحسان محمد الحسن(د)، موسوعة علم الاجتماع، طبعي الأول، الدار العربية للموسوعات، بيروت، ١٩٩٠، ص٧٨.

(٢٥٦) دواگفتو گۆکانی بورخیس و ئوسڤالدوفراری، وەرگێڕانی لە فارسیەوە: ڕەووف بێگەرد، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل١٦٧.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ ئەفسانە کۆنەکان لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

شـاعیر گرینگیـەکی زۆری بـە ئەفسـانەکان و داسـتان و دەقـە کۆنـەکان داوە، بـەڵام شـاعیر زیـاتر پـەنایی بـۆ ئەفسـانە و دەقـە کۆنەکانی خۆماڵی کوردی بردووە، لەناو شیعرەکانی خۆیـدا تـەوزیفی کردووە، توانییوویەتی ئێستێتیکای هونـەری و شـیعرییەتی دەق بـە دەقـە شـیعرییەکان ببەخشـێت، ئـەوەتا شـاعیر لـە دەقـی"بۆشـڤان" دەڵێ:

**((بێدەنگ مەبە !**

**دەنگت: باڵی سیمرخێکە**

**هەموو ڕۆژێك،**

**دڵی تەنگم بەسەر دوندی چیا دەخا )) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل٤٨).**

شـاعیر بـە هـۆی گەڕانـەوە بـۆ باڵندەیـەکی ئەفسـانەیی، کـە"سـیمرخ"ە، چ لـە ئەفسـانە خۆماڵییـەکان بـێ، چ لـە ئەفسـانە جیهانییەکان، ئەم باڵندەیـە تـەنیا لـە دەقـە ئەفسـانەییەکاندا بـوونی هەیە، شـاعیر بەسـوود وەرگـرتن لـەم نـاوە ئەفسـانەییە، ئـەم جـۆرە

نۆستالژیایەی داهێناوە، خەسڵەتی ئەو باڵندەشی، کە شتی مەحاڵ ئەنجام دەدات، بۆ خۆی گواستۆتەوە و شیعرییەتێکی بە دەقەکە بەخشیوە. لە شیعری"ماچ"یشدا، دەڵێ:

**((ئەوەی تۆ گوشیت دەست نەبوو**

**ئەژدیهاییەکی پێنجسەر بوو ))   (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ١٦٣).**

"ئەژدیهایەکی پێنج سەر"، دەلالەتی زۆرداری و دڕندەیی دەگەینی، واتە لێرەدا شاعیر، دەیەوێ بڵێ: ئەوەی تۆ بەدەستی دەینی و دەستی بۆ دەبەیت، ئەوە دەست نییە و وەکو ئەژدیها پێت وەدەدات، لێرەدا شاعیر دڕندەی ئەژدیهایەکی ئەفسانەیی، بۆ مەبەست و مەرامی تایبەتی خۆی، وەك ڕەمزێکی زۆرداری و خیانەت بەکاری هێناوە.ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی مەعریفی و بە ئاگایی شاعیر لە گرینگی بابەتە ئەفسانەییەکان، هەر لەم بارەیەوە، "ئەرستۆ" دەلێت: ((ئەوەی هاوڕێی ژیری و دانایی بێ، بەهەمان شێوە هاوڕێی ئەفسانەکانیشە))[٢٥٧].

---

(٢٥٧) رنیا سەمارە، ئەفسانە و ئەدەب، وەرگێڕانی، حسێن سابیر علی، ل٢٣.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ ئەفسانە کۆنەکان لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

شاعیر لە زۆر شوێنی شیعرەکانیدا ئەفسانە و ڕەمزە ئەفسانەییەکانی بەکارهێناوە و بۆ ئەفسانەکان گەڕاوەتەوە، بەتایبەتی بۆ پاڵەوان و ڕووداو و کەرەستە ئەفسانەیەکان، لەئەمەش توانیوویەتی دەقێکی کراوە، بهێنێتە بەرهەم.

نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ ئەفسانەکان لە بواری کارکردن و تەوزیفکردنی ئەفسانەکان، بۆ مەبەستی تایبەتی و لە بەرژەوەندی دەقدا بەکارهاتووە، لەناو دەقەکانی شاعیر ڕەمزە ئەفسانەیەکانی، وەکو: (سەمەندەر، قەقنەس، سیمرخ، درنج، مێردەزمە) بەکارهاتوون، بە مانا و دەلالەتی جیاوازە، هەندێك جاریش، ئەفسانەکان تێکەڵ بە دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان بووینە، هەر ئەوەشە وایکردووە، ئەفسانەکان لەناو کورد بە زیندووی بمێنەوە، لەم بارەیەوە، "د.مەولوود ئیبراهیم حەسەن" دەنووسێت: (ئەو دابونەریتە کۆمەڵایەتیانە ڕۆڵێکی گرینگ و کاریگەریان هەیە، لە دروستبوون و ڕاگرتن و هێشتنەوەی ئەفسانەکان)[٢٥٨]. بێگومان ئەم دیاردە لەناو کۆمەڵگەی کوردی بە زەقی دیارە، زۆرجار دەبینین

(٢٥٨) مەولوود ئیبراهیم حەسەن(د)، گەڕان بەدوای نەمریدا، ل٢٥.

دابونـــەریت و ئـــایین و ئەفســـانەکان ئاوێتـــەی یـــەکتر دەبـــن و جیاکردنەوەیان ئەستەم دەبێت. شاعیر لەم دەقـەی خـوارەوە، بـاس لە باڵندەیەکی ئەفسانەی دەکات و دەڵێ:

**((وەك سەمەندەر پەڕو باڵم ئاگرینە**

**وڵاتی گڕ هێلانەمە..)) (ئەنوەر قادر محەمەد ، زریـان و زایەڵـە و زنار، ل٧).**

شاعیر خەسڵەتی باڵندەی "سەمەندەر"ی، ئەفسانەیی، بۆ خودی خۆی گواستووەتەوە و خـۆی لـەم باڵنـدە ئەفسـانەیەدا بینیوەتـەوە، بەمەش دەیەوێ بڵێ: چۆن ئەم باڵندە ئەفسانەیە دەگمـەنن و زیـاد و کەم ناکەن، بەردەوام لە سووتان و توانەوە و لە دایکبوونەوەدان، بـۆ شاعیریش دووری و غوربەت و خەم و ژانی میللەت و نیشـتیمانەکەی، وەك (ســـەمەندەر)[*] ، بـــەردەوام دەیســـووتێنێ و نـــاشمرێ و لەدایکدەبێتەوە.

(*) سەمەندەر: باڵندەیەکی بێ ئازارە، پێستەکەی شتێکی لینج دەردەدات و سووتێنەرە.
عەبدوڵڵا خدر مولود(د) و مولود ئیبراهیم حەسەن(د)، هێما ئەفسانەییەکان لە دیوانی"نـالی و سـالم و کوردی"دا، گۆڤاری ئەکادیمی کوردی، ژمارە(١٨) ی، ساڵی ٢٠١١، هەولێر، ل ١٩٩.

لە دەقێکی دیکەدا، دەڵێ:

**((بۆ گیانی قەقنەسیی من داخرا،**

**دڵم بووە گڵکۆیەکی بچکۆلانەو**

**لە بەفرە دەشتێکدا بەجێهێڵێرا..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ١٩٠).**

شاعیر بە گەڕانەوە بۆ باڵندەیەکی ئەفسانەیی، کە (قەقنەس)[*]ە، دەقێکی نۆستالژی و لەهەمان کاتدا مانایەکی دەلالی و ئێستێتیکایەکی جوان و فەزایەکی خەیاڵی بە دەقەکە بەخشیوە، شاعیر پێی واییە، ئیتر تەواو ئەو خۆشی و شادییەی، کە هەبوو نەما و دڵتەنگی و خەم و نیگەرانی ڕووی لە دڵ و دەروونی کردووە، بۆیە ئەو ڕۆژە خۆشانە بەسەر چوون، خوێنەر لەڕێگەی ئەفسانە و کەسایەتییەکان و ڕووداو و کەرستە ئەفسانەییەکانەوە، بە کۆمەڵێك کۆد و نهێنی شاراوەی ڕەمز ئامێز دەگاتن، چونکە ((ڕۆڵی ئەفسانەش بریتییە لە دۆزینەوەی ئێستامان و هەنگاونان بۆ پڕۆژەی داهاتووماندا))[٢٥٩].

(*) قەقنەس: باڵندەیەکی ئەفسانەییە، بە زمانی ڕۆمی باڵندەیەکی یەکجار دەنگخۆش و خۆش ڕەنگە، دەڵێن دەندووکی ئەم باڵندەیە سێ سەد و شەست کونی تێدایە، لەسەر کێوی بڵند و ڕوو لە با ئاوازی سەیری لێ بەرزدەبێتەوە، بەم هۆیەوە باڵندەی زۆری لێ کۆ دەبێتەوە...

سەرچاوەی پێشوو،ل ١٩٩–٢٠٠.

(٢٥٩) رنیا سەمارە، ئەفسانە و ئەدەب، وەرگێڕانی، حوسێن سابیر عەلی، ل١٩ .

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ ئەفسانە کۆنەکان لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

"ڕەنجدەر" لەهەردوو شاعیر زیاتر گرینگی بە ئەفسانە و ڕەمزە ئەفسانەییەکان داوە، بەمەش توانیوویەتی ببێتە خاوەنی داهێنانی دەقی شیعری بەرز و هونەری و شیعرییەتی دەق بە شیعرەکانی ببەخشێ و هەمیشە دەقەکانی هەڵگری مانا و دەلالەتی قووڵ و فەلسەفەی ژیانیان لەخۆیاندا کۆکردووەتەوە، ئەمەش وای لە دەقەکانی شاعیر کردووە، خۆی ڕادەستی یەك قوتابخانەی شیکاری نەکات و خۆی بەیەك تەئویل و مانا نەبەستێتەوە و بەردەوام خوێندنەوەی جیاواز لەخۆ بگرێ و بەکراوەیی بمێننەوە، بۆ نموونە:

شاعیر دەڵێ:

**((داوای پەناگەیەکی لێ دەکەم پێشی ڕادەگەیەنم**

**ئێسکی <u>هوما</u> پاپی پاشایە کوێرەکانە..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ٨٨).** شاعیر لەڕێگەی بەکارهێنانی باڵندەی ئەفسانەیی (هوما)* گەڕاوەتەوە، بۆ نەستی کۆ، بەمەش

---

(*) هوما: باڵندەیەکی ئێسك خۆرە، ئێسقان لەسەر زەوی هەڵدەگرێ و یەکسەر بەرز دەفرێ و بەسەر تاوێرە بەردا فرێی دەداتە خوارەوە، تا پارچە پارچە دەبێ و دوایی دەیخوات، پێشینان وایان دەزانی سێبەری "هوما" بکەوێتە سەر هەر کەسێ، دەبێتە مایەی کامەرانی و بەختیاری بۆی.

هەســــــتێکی گشــــــتی و نەتــــــەوەیی دروســــــتکردووە، چونکە"هوما"باڵندەیەکی ئەفسانەییە لەناو ئەفسانە ڕۆژهەلاتی و ئێرانیەکاندا و لە نێو کوردیشدا بە باڵندەیەکی خۆشبەختی ناسراوە.

"سەباح ڕەنجدەر" زیاتر پەنای بۆ باڵندە ئەفسانەییەکان و کەسایەتییە ئەفسانەیە و ئایینیەکانی، وەك (سیمرخ، هوما، سەمەندەر، خدری زیندە، نوح، گلگامیش، سیزیف...تاد)، بردووە، شاعیر لەم دەقەی خوارەوە پەنایی بۆ ئەفسانەیەکی جیهانی بردووە، کە ئەفسانەی "سیزیف"ە، وەك ڕەمزێك بۆ خودی خۆی سوودی لەم ئەفسانەیە وەرگرتووە.

لەم بارەوە (ئەلبێر کامۆ ــ Albert Camus ١٩١٣ــ١٩٦٠) دەڵێ: ((ئەفسانە دەلالەتێکی ڕەمزی حەشاردراوی تێدایە، هەر کاتێك شاعیر ئەم دەلالەتەی دۆزیەوە، ئەکتیڤ دەبێت))[٢٦٠]، بەمەش شاعیر دەیەوێ خۆی، وەك "سیزیف" نیشان بدات، شاعیر "سیزیف" ئاسا بارێکی قورسی کۆمەڵگەکەی خۆی لەسەر پشتە و هەمیشە هەوڵی سەرکەوتن بۆ لووتکە دەدا، دواجار بەردەبێتەوە، بەلام سەر

---

عەبدوڵلا خدر مەولوود(د) و مەولوود ئیبراهیم حەسەن(د)، هێما ئەفسانەییەکان لە دیوانی"نالی و سالم و کوردی"دا، ل١٩٩– ٢٠٠.

(٢٦٠) طلال سالم الحديثي، الرمز والاسطورة في الشر الحديث، مجلة، "التراث الشعبي"، عدد(٨)، ١٩٧٠، ص٩.

لەنویێ دەست پێدەکاتەوە و کۆڵ نادات، بۆیە بێ هیوا نەبوونی "سیزیف" دەخوازێتەوە، بۆ خۆی، دەڵێ:

**((بەبەغا لەسەر بەردی سەر شانی سیزیف***

**نیشتووەتەوە**

**نیاز دەخوێنێ و فاڵ دەگرێتەوە..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل ٢١١).**

شاعیر ناخۆشی و خەم و حەسرەتی ژیان بارێکی قورسە لەسەر شان و ملی شاعیر، بەڵام هێشتا بێ ئومێد و بێ هیوا نابێت، وەکو "سیزیف" بەردەوام هەوڵدەدات، تاوەکو سەردەکەوێت. "ڕەنجدەر" ئەفسانە، وەك قاڵبێکی ڕەمزی وەرگرتووە، توانیویەتی کەسایەتی و ڕووداو و هەڵوێستە وەهمیەکان بگۆڕێت، بۆ کەسایەتی و ڕووداو و هەڵوێستی سەردەمیانە و ڕووحێکی زیندوویان پێ ببەخشێت.

(*) سیزیف: ئەفسانەیەکی یۆنانییە، کە بەهۆی ئەوەی ڕازی خوداوەندەکانی ئاشکرا دەکات، خوداوەندەکان بڕیاری سزادانی دەدەن، سزاکەشی ئەوەیە، کە بەردێکی گەورە لەسەر شانی خۆی هەڵبگرێت و بەسەر چیایەك سەرکەوێت، بەڵام دوای چەند جار بەر بوونەوە و هەستانەوە، لەکۆتایدا گەیشتە لووتکەی چیایەکە، بەڵام لێی بەردەبێتەوە، بۆ خوارەوەی چیایەکە "سیزیف" بەردەوام ئەو کارە ئەنجام دەدات و کۆڵنادات...

(آلبر کامو، افسانەی سیزیف، ت: علی صدوقی و محمدعلی سپانلو و اکبر افسری، چاپ اول، چاپ نوبهار، نشر دنیای نو، تهران، ١٣٨٢).

## ٢- ٢ نۆستالژیای گەڕانەوە
## بۆ شوێنەوارە کۆن و دێرینەکان:

گەڕانـەوەی شـاعیران، بـۆ شـوێنەوارە کـۆن و دێرینـەکانی وڵات، بەردەوام دەبێتە، هۆی ئاوڕدانـەوە و دووبـارە زیندووکردنـەوەی ئـەم شـوێنەوارە کـۆن و دێرینانـە، لـە نـاخ و ویـژدانی شـاعیران. بەمـەش دەقێکی نۆستالژیای کۆ دێتە بەرهەم.

### ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ شوێنەوارە کۆن و دێرینەکان لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

پەشـێو، وەکـو شـاعیرێکی ناسیۆنالیسـتی، بەرهـەم و بابەتـە کەلەپووری و کولتوورییەکانی نەتەوەیی بەلاوە جێگای تێڕامان و چاو خسـتنە سـەرە، بەتایبـەتی دوای سـاڵانی ئـاوارەیی و غوربـەت و بـێ وڵاتی، بەمەش نۆستالژیایەکی گشتی بەرهـەم هێنـاوە، گەڕانـەوە بـۆ ئەم جۆرە شوێنەوارانە، جۆرێك سۆز و هەڵچوون و خـەمی نەتـەوەی لـە پشـتە، بەمـەش شـاعیر ڕووحێکـی ئیسـتاتیکی و زینـدوو بـە کولتوورەکـە و دەقـەکانیش دەدا. "پەشـێو" لـە شـیعری " هەگبـەی دەنگوباس" دا، کە بۆ شێرکۆ بێ کەسی، نووسیووە دەڵێ:

**((هاوڕێم!**

**کە چوویتەوە: سلێمانی**

**لە ڕێگاتا لە بیرنەکەی:**

**لە قەڵات و منارەوە،**

**لە موغەکانی شارەوە،**

**چەپکە هەواڵێك بەرەوە..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ١٤٨).**

شاعیر بە دەنگێکی پڕ لە سۆز و سەدایەکی خەمبارانە، داوا لە هاوڕێیەکەی دەکات، ڕەمزی شارەکەی لە بیرنەکات، کە " قەلا و منارە" یە، دوو هێمای دێرینی شارەکە و شوێنەوارن.

لە شیعری (هەولێر لە یەکی شوبات)یشدا، وەك کامێرەمانێك، بەناو هەموو شوێنێکدا تێ دەپەڕێ و سۆزی غەریبی و ئاستی نۆستالژیای دڵ و دەروونی دەگاتە لووتکەی تەنیایی و نیگەرانی، بۆنی خوێن و کروزانی دڵی شاعیر لەناو دێرەکاندا بەرچاو دەکەوێ، ئەوەتا دەڵێ:

**((لە بەرچاومە و دەزانم**

**بەچ دەردەسەرییەك تۆ تەعجیلت فرچك دا**

**بەچ شەونخوونییەك**

**قەیسەریت هەراش کرد**

**خانەقات لە خەم ڕەخساند..))(عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا ل٣٦٩).**

لێرەدا شاعیر باسی سێ گەڕەکی کۆنی شاری هەولێر دەکات، کە ئێستا بوونەتە شوێنەواری نەتەوەیی کوردستان و شاری هەولێر، کە گەڕەکەکانی ((تەعجیل و قەیسەری و خانەقا))نە، کە هەندێکیان ئێستا حوکمەتی هەرێم چۆڵی کردوون و خستوونەیتە خانەی شوێنەوارەکانی شار.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ شوێنەوارە کۆن و دێرینەکان لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

وەکو شاعیرێکی هۆشیار و بە ئاگا و دوورە مەفتەن و تاراوگە، هەست و سۆز و نەستی خۆی دەکاتە، هەوێنی داهێنانی دقی نۆستالژی گشتی، لە شیعری "کۆتەڵ "دا، دەگەڕێتەوە بۆ باسی شوێنەواری (قەڵای مەریوان)، کاتێ باسی مەرگی باوکی دەکات، دەری دەخات چۆن شاعیر لەدوورە وڵاتی و ئاوارەییدا بەحەسرەتەوە ئەم خەم و ژانە، کە کۆچی دوای باوکییەتی ئارامی لێ دەبڕێت، چونکە باوکی بۆ شاعیر، وەکو " قەڵای مەریوان "ە، لە پشت و پەنا و هاوکاریدا، دەڵێ:

**((تۆ بۆ ئێمە، باوکە " قەڵای مەریوان " بووی**

**بۆ شەوگاری تاڵی ژینمان**

**ورشە ورشی ئەستێرە بووی..))(ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل١٣١).**

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ شوێنەوارە کۆن و دێرینەکان لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

شاعیر لەشیعرەکانیدا شوێنەوارە دێرینەکانی هەولێر و تەنانەت جیهانی بەشێوەیەکی جوان تەوزیف کردووە، لەو دەقانەیدا ئەم جۆرە گەڕانەوەی ئەنجامداوە، ئەوەش بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیی و بۆ گەیاندنی ئەو فەزایەی دەیەوێ بیگەیەنێ، شاعیر هیچ کات ئەو شوێنەوارە دێرین و ڕابردووە کۆنانە لە بیر ناکات، ئەوەتا دەگووترێ: ((هەر کەسێ بەبێ کەلەپوور و شوێنەوارە دێرینەکانی ڕابردووی نەتەوە و یادگاری بژی، شاعیر بێ ئەو شتانە ئۆقرەی نییە و لاوك بۆ ڕابردوو دەڵێت، ئێستا درێژە پێدەری ئەوسایە))[٢٦١].

بۆیە لە شیعری (گا/ گوڵ) دا، دەگەڕێتەوە بۆ قەڵا و منارە و چایخانەی "مەچکۆ"، چونکە ئەوانە بۆ شاعیر ڕەمزی شاری هەولێرن، هێما و نیشانەی بینین و ڕێ نیشاندەرن، بۆیە شاعیر بە یاد کردنەوەیان هەست بە پڕکردنەوەی بۆ شایی ناخی دەکات، لەلایەکی دیکە ئاماژەیەکە بۆ کۆبوونەوەی نووسەر و شاعیرانی شارەکە لەم

(٢٦١) ڕزگار عومەر فەتاح، ڕۆمانسیزم لە شیعری" هێمن و محەمەد نووری"دا، نامەی ماستەر، زانکۆی کۆیە، کۆلیژی زمان، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٢٩.

چـــایخانه، وەکـــو کـــۆنترین چـــایخانەی شـــارەکە، "ڕەنجـــدەر" نووسیویەتی:

**((چاوێك له قەلاّ و چاوێك له مناره**

**ڕووناکیی زۆریان ڕژایێ**

**ختووکەی مەچکۆیان دا**

**هەولێر له ناوکی خۆخێـك هێـزی وەرگـرت..))(سـەباح ڕەنجـدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ٤٤٧).**

یان له شیعرێکی دیکەدا، دەڵێ:

**((هەولێر جەستەی داپیرە گەورەی زەوییە**

**چاوی له قەلاّ و مناره داڕێژراون**

**ئەوه بیرەوەری بەردێکه..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شـیعر، بەرگی دووەم، ل٦٩).**

شـاعیر بـەهۆی گەڕانـەوه بـۆ قـەلاّ و منـاره، وەك نۆسـتالژیایەکی گشـتی بـاس لـه تەمـەنی گـەورەیی شـاری هـەولێر دەکـات، چـونکه زانایـانی شوێنەوارناســی ئـەوەیان پشــت ڕاســت کردووەتــەوه، کــه تەمەنی شاری هەولێر دەگەڕێتەوه بۆ نزیکەی (٦٠٠٠) هەزارساڵ پێش زایین، کۆنترین شاره، که تاوەکو ئێستا ژیان تیایدا بەردەوامه.

## ٢- ٣ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ کەسایەتییە مێژوویی و نەتەوەییەکان:

ئەم جۆرە نۆستالژیایە گەڕانەوەیە، بۆ کەسایەتییە مێژوویی و نەتەوەییەکان بە چەند جۆرێك لەلای شاعیران ئەنجامدراوە، یان ئەوەتا کەسایەتییەکان کەسایەتی مێژووین، یان شاعیران کۆنی کۆچکردووی نەتەوەین، یان هونەرمەند و گۆرانیبێژی میللی، یان کەسایەتی سیاسی و شۆڕشگێڕن، کەسایەتی و پیاوی ئایینین و.....تاد.، کەواتە: ئەم جۆرە گەڕانەوەیە، بریتییە لە ((هێنانی کەسایەتییەکان، لە ڕێگەی ناوهێنانیەوە، یان ناوهێنانی ناوبانگەکەی بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە، پێویستە ئەو کەسایەتییانە لە سیاقی شیعرەکەدا، وەك سیمای کەسی، یان گشتی بەکاربێن، چونکە ئەگەر لە دەقەکەدا نەبن، ئەوا ئەو دەقە توانای کۆدی ڕەمزی و کاریگەری شیعری لە دەست دەدات))[٢٦٢]. بۆیە بەکارهێنان و دووبارە ناوهێنانیان لەلایان شاعیرانەوە، جوانی و ئێستێتیکای دەقەکە زیاتر و بەهێزتر دەکات، بەمەش شاعیران لەناو شیعرەکانی خۆیاندا مەزراندوویانە، ئەمەش لەلایەك وەك ئیلهامبەخش بووە بۆ شاعیر،

---

(٢٦٢) احمد طعمة حلبي(د)، التناص بين النظرية والطبيق شعر البياتي نموذجاً، الهيئة العامة السورية لكتاب، دمشق، ٢٠٠٧، ص ٢١٦ــ ٢١٧.

لەلایەکی دیکەوە، بۆ مەبەستی یادەوەری و بیرهێنانەوەی هەڵوێستێك، یان کار و کردەوەیەکی بۆ نەتەوەکەی کردووە، شاعیر دەیکات بە نموونەیەك بۆ پەند و ئامۆژگاری بۆ نەوەی نوێ و خەڵکی وڵاتەکەی.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ کەسایەتیە مێژوویی و نەتەوەییەکان لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

پەشێو بەشێکی زۆری لە دەقەکانی ئەم جۆرە گەڕانەوەی تێدایە، بەتایبەت کەسایەتییە نەتەوەیەکانی، وەکو شاعیران و نوسەرانی کۆنی نەتەوەیی "پەشێو" لەرێگەی ناوهێنانی شاعیرانی کورد، وەك "نالی و حاجی و خانی و گۆران و.....تاد"، بۆ ئەوەی ئارامییەك بە دەروون ببەخشن، توانیویەتی لە دەقەکانیدا بۆ خزمەت و پێویستی شیعرییەتی دەقەکان بە کاریان بهێنێ. پەشێو لە شیعریکدا باس لە هەرسێ شاعیری گەلەکەمان "بێکەس و حاجی و گۆران" دەکات، خەم و حەسرەتی خۆی دەردەبڕێ لە بەرانبەر لە بیرکردن و ئاوڕ لێنەدانەوە، لە شاعیرانی کۆنی نەتەوەیی، دەڵێ:

**((لە مەڵبەندی**

**بێکەس و حاجی و گۆرانا**

**گەر بگەڕێی سەرتاخوار وەك غەریبیٚ،**

**بەدی ناکەی تاپۆی پەیکەری ئەدیبیٚ!)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ١٥٣).**

شاعیر لە شیعری (دوانزدە وانە بۆ منالآن)یش، لە (وانەی سێیەم) دا، شاعیر وەکو جیهان بینێك ڕوو لە مندالآن دەکات و ئەو شتانەی لە مێژووی سیاسی کوردستان ڕوویانداوە، جارێکی دیکە بۆیان دەگێڕێتەوە، لەرێگەی کەسایەتیەکاندا، وەك بیرەوەرییەك بە بیریان دەهێنێتەوە، وەك ڕەمزی نیشتیمانی و نەتەوەیی، کە باسی"قازی و شێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحموود و مەهاباد و دیار بەکر و قامیشلی" یان، بۆ دەکات و دەنووسێت:

**((ئێوەن سبەی**

**لە قامیشلی،**

**لە دیار بەکری شێخ سەعیدا،**

**لە سلێمانی بریندارا،**

**لە مە هابادی قازی دا،**

**بەیەك فەلسەفە پیٚ دەگەن..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ٢٢٥).**

شاعیر لێرەدا بۆ کۆمەڵێك شۆڕشگێڕ و سەرکردەی کورد لە مێژووی خەباتی ڕزگاری و ئازادیخوازی کورد لە هەر چوار پارچەی کوردستان گەڕاوەتەوە، بەمەش هەست و نەستێکی کۆی خستووەتەڕوو، ئەو کەسایەتیان جارێکی دیکە، بەگوێی منداڵانی کورد ئاشنا کردووەتەوە.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ کەسایەتیە مێژوویی و نەتەوەییەکان لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

شاعیر هەوڵیداوە لەرێگەی گەڕانەوە، بۆ ئەم کەسایەتییانە، خەمەکانی خۆی و دەروونی خۆی بەتاڵ بکاتەوە، لە ناخۆشی و خەم و ژانی تەنیایی و تاراوگەیدا خۆی ڕزگار بکات، لەشیعری (ئەگەر)دا، دەنووسێت:

**((گەر "نالی" یەك دەبووە قوربانی تۆزی ڕێی**
**شنەباتان**
**ئەگەر ئێوەش،**
**دەیان پشت و خوشك و برا و خۆشەویستتان...**
**دەبوون میوانی هەتا هەتایی "سەیوان"...)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل٩٤).**

"ئەنوەر قادر محەمەد" لێرەدا گەڕاوەتەوە بۆ شاعیری بەرزی گەلەکەمان "نالی" و ئیلهامی شیعرەکەی خۆی لەسەر دێرە شیعرێکی ئەو نووسیوە، کە"نالی"یە، دیارە شاعیر "نالی" ئاسا لە غەریبی دا هەست بە غوربەت و نا ئارامی و تەنیایی دەکات، هەروەها شاعیر شانازی بە شاعیرێکی بەرزی، وەکو "نالی" دەکات، چ وەك "سلێمانی"یەك، چ وەك"جاف"ێك، چونکە شاعیر خۆشی"جاف"ە، هەروەها ناوهێنانی "سەیوان" ئاماژەیەکە، بۆ گۆڕستانێکی ناسرا و دیاری "سلێمانی"، کە شوێنی سەدان شاعیر و کەسایەتی نەتەوەییە.

یان لەشیعری (چراوگە) و(سیما و ئاڵا)دا، شاعیر گەڕاوەتەوە بۆ "قازی محەمەد و چوارچرا و مەهاباد و سابڵاخ"، بەمەش دەقێکی نۆستالژیای گشتی بەرهەم هێناوە، چونکە "قازی محەمەد" کەسایەتی و ناوێکی دروشاوەیە لەناوهزر و بیری تاکی کوردی لەهەر چوار پارچەی کوردستاندا، بووەتە ڕەمز و هێمای قوربانی دان و بەرخودانی و چاو نەترسی ئەو سەرکردە مێژووییەی گەلەکەمان دەگەینێت. بۆیە شاعیر دەنووسێت:

**((شەوی "سابڵاخ" بە نسێیە**

**خوێنی"قازی"چراوگێکە**

**نیشاندەری ڕاستە ڕێیە..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل٩٦).**

یان لەم دەقەدا:

**((پێشەواکەی "چووارچرا"کەی**

**ئاڵای شەکاوەی شارەکەی**

**لە خوێندا نوقم کراوبوو )) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل١١٣).**

ئەم کەسایەتییە نەتەوەیی و مێژووییانە لەلای هەر شاعیرێك بە جۆرێك لەناو بەرهەمەکانیاندا ڕەنگدانەوەی دەبێت، کە بەپێی سەردەم و هزر و بیری شاعیرەکە دەگۆڕێت و دەبێتە مایەی تێڕامانی شاعیر و گرینگی پێدەدات و هانای بۆ دەبات، چونکە ((مرۆڤی ئەم سەردەمە درێژبوونەوەیەکی سرووشتی ئەوانەی پێش خۆیەتی و ناتوانێت دەستبەرداریان ببێت،...، چونکە مرۆڤ مێژووە و مێژووش لەناو ناچێت، بەڵکو گەشە دەکات و بەردەوام دەبێ لە گەشەکردن، و ئەڵقەیەکە ئێستا بە ڕابردووەوە دەبەستێتەوە و داهاتووش، کە لە ئێستا و ڕابردوو پێکدێت، پێکەوە سوودیان لێ دەبینێت ))[٢٦٣].

(٢٦٣) یسری خلف حسین، التناص في شعر حمید سعید، کلیة التربیة ابن رشد، جامعة بغداد، رسالة الماجستیر، ٢٠٠٢، ص٤٦.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ کەسایەتیە مێژوویی و نەتەوەییەکان لە شیعرەکانی " سەباح ڕەنجدەر"دا

ئــەمجۆرە گەڕانــەوە لای "ڕەنجــدەر" شــێوەیەکی تایبــەت و فراوانتری بە خۆیەوە بینیوە، شاعیر زۆربەی ئەو کەسایەتیانەی، کە باسـیان دەکـات و بۆیـان گەڕاوتــەوە هەنـدێکیان هـاوڕێ و ڕەفیقـی شـاعیرن و مـاوەن، بـەلاّم هەنـدێکیان کەسـایەتی گشـتین و ڕەمـز و هێمای نەتەوەین، شاعیر بۆ مەبەستی تایبەتی خـۆی لەناودەقەکانـدا مەرزاندوویەتی و شیعرەکانی پێ دەوڵەمەند و ڕەنگ ڕێژ کردوون، لـە ڕۆمانەشـیعری"زێـوان" بـاس لـە "نـالی و حەبیبـە"، دەکـات، شـاعیر لێرەدا، دەیەوێ بڵێ: عەشقی منیش "نالی" ئاسا و هیچی لە عەشـقی "نالی بۆ حەبیبە"، کەمتر نییە."ڕەنجدەر" دەڵێ:

**((ئاو جێ دەهێڵن دێنە لای مۆڵەق دەمێننەوە**

**نزیك ماڵی <u>نالی</u> دەوەستم..**

**پۆرترێتی <u>حەبیبەم</u> دەداتێ بە دیاری بۆ نواڵەی ببـەم )) (سـەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل٧٦).**

یان لە شیعری (چاو)دا "سەباح ڕەنجدەر" دەڵێ:

**((قومرییەك لەناو<u>چوارینەکانی</u> <u>باباتاهیر</u>**

**تێر دانی ئەفسانەی خوارد...**

**ئەڵقەی بەختی خەواڵووی**

**حاجی قادری کۆیی دەسووڕێنیٚ..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل ٦٨).**

لەم دەقەشدا شاعیر دەیەویٚ بەهۆی ئەم گەڕانەوە گشتییە و بە ناوهێنانی "باباتاهیر"، ئەوە بڵیٚ: یەکەم شاعیری ئەدەبی کورد، وەکو مێژوو "باباتاهیری هەمەدانی"یە، هەروەها یەکەم شاعیری کوردیشە، کە "چوارینەی" نووسیووە، هەروەها بەناوهێنانی "حاجی قادر کۆیی"، کە ڕەمز و هێمای بووژانەوەی هەستی نەتەوایەتییە، ئاماژەی بە یەکێك لە قەسیدە دیارەکانی کردووە، بەناوی "وتم بە بەختی خەواڵوو.." شاعیر دەیەویٚ، بەهۆیانەوە لە دەروونی خوێنەرانیدا یاد و بیرەوەری ئەم شاعیرانە بکاتەوە، کە دووبارە بوونەوەیان مەحاڵە و ئێستا بوونەتە ڕەمز و نیشانەی ئەدەبی کوردی، هەست و نەستێکی گشتیان لەلای خەڵکی دروستکردووە، بۆ هەموو تاکێکی کورد"باباتاهیر و حاجی قادری کۆیی" ناسراو و مایەی شانازین.

## ٢- ٤ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ داستانە کوردی و جیهانییەکان:

داســـتانە کۆنـــەکانی هـــەر نەتەوەیـــەك، کەرســـتەیەکی خـــاوی داهێنانەکانی نووسەر و شاعیرانن، چ وەکو گەڕانەوە بۆیان و تەوزیف کردنیان لەناو دەقە شیعرییەکانیاندا، چ وەکو ئیلهام لێ وەرگرتنیـان، چونکە داستانەکان یەکێکن لە بەرهەمە فۆلکلۆرییەکان، کە مێژوویێکی زۆر کۆنیـان هەیـە، کـورد خـاوەن دەیـان داسـتانی خۆمـاڵین، وەکـو: داســـتانەکانی ئـــەڤینی و دڵـــداری و قارەمانیـــەتی و سوارچـــاکی و نیشتیمان پەروەری و.....تاد، ە، بۆیە شـاعیران بـەردەوام لەرێگـەی نەستی کۆوە، ئاوڕیان لەم داستانانە داوەتەوە. ئەمە جگە لە داستانە جیهانییە بەناوبانگەکانی میللەتان، کە سنووری نەتەوایەتیان بڕیوە و تێکەڵ بە ئەدەبی میللەتانی دیکەی جیهانی بووینـە، وەك: (داسـتانی گلگـــامێش، لـــەیل و مـــەجنون، یوســـف زولیخـــا، هەزارویـــەك شەوە،...تاد). نموونەی داستانە کوردیەکانمان زۆرن، وەکو: (مـەم و زیـن، شـیرین و فـەرهاد، سـیامەند و خـەجێ، محەمـەد و سـێوێ، و ئەسمـەر و مامـەر.....تـاد) کەواتـە: دەتـوانین بڵـێین: کـە دوو جـۆر داســـتان هەیـــە ((داســـتانێك، کـــە هـــی کـــورد خۆیـــەتی و چەشـــنە

داستانێکیش، کە بەشی گەلانی تری پێوەیە، واتە لەناوگەلانی ڕۆژهەلأتدا گەلێك داستانی هاوبەش هەیە ))[٢٦٤].

شاعیرانی ئێمەش (عەبدوللا پەشێو ، ئەنوەر قادر محەمەد، سەباح ڕەنجدەر) یش، دەقەکانییان پڕیەتی لە بابەتی داستانە کۆنەکانی کوردی و پالەوانەکان و ڕووداوەکانی ئەو داستانە کوردییانە، ئەگەرچی هەندێکجار پەنایان بۆ داستانە جیهانییەکانیش بردووە، جا چ وەکو سۆزێکی نۆستالژی بێت و بەهۆیانەوە بێزاری و نەهامەتی واقیعی ژیانیان پێ لەبیربکەن و بە باسکردنیان ئارامیان دەست کەوێت، چ وەکو هونەر و لایەنێکی ئێستاتێکی و بە دەقکردنی ئەم داستانانە و بەخشینی شیعرییەتی دەق بەدەقەکانیان بێت، لە هەردوو حالەتەکەدا دەقێکی نۆستالژی لێ دێتە بەرهەم و لە دایك دەبێ.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ داستانە کوردی و جیهانییەکان لە شیعرەکانی "عەبدوللا پەشێو"دا

وەکو شاعیرێکی نەتەوەیی و لێوان لێو لە یاخیبوون و ڕەتکردنەوەی واقیعی ژیانی کوردستان لەڕووی سیاسی و ئیدارییەوە،

(٢٦٤) کامەران موکری، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٤، ل٦٩.

"پەشێو" هەمیشە بەجەستە لە تاراوگە و بە دڵ و ڕووح لە کوردستان و بەردەوام تیلە چاوێکی لە ڕابردووی نەتەوەکەی بووە، بەخۆشی و ناخۆشیەوە، بۆ ئەمەش بەشێوەیەکی هونەری و جوان، بۆ مەبەستی گەیاندنی ناوەرۆکی دەقەکانی خۆی پەنای بۆ ئەم جۆرە گەڕانەوە گشتییانەی بردووە، بۆ نموونە لەشیعری (کاك )دا، دەڵێ:

**((لە ماوەی چاو قوچانێکدا**

**هەزار و یەك خەونی شیرین**

**دەمکەن بە مەم، دەتکەن بە زین )) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل١٣٢).**

"پەشێو"هەوڵیداوە، بەهۆی ئەم گەڕانەوەیە بۆ نۆستالژیای گشتی و گەڕانەوە بۆ داستانی (مەم و زین)ی، "ئەحمەدی خانی"، لە لایەك دەیەوێ باس لە گەورەی شاعیرێکی، وەکو"خانی" بکات و لە لایەکی دیکەوە، باس لە و عەشقە پاکەی (زین و مەم) بکات، چونکە ئیتر ئێستا "ئەحمەدی خانی" بە تەنیا خاوەنی ئەو داستانە نییە، بەڵکو هەر کوردێك لەهەر شوێنك بێ بەهی خۆی دەزانی و بووەتە هەست و نەستێکی کۆ و گشتی، ڕووحێکی نەتەوەیی وەرگرتووە، شاعیر باسی پاکی ئەو خۆشەویستیەی خۆی دەکات، وەکو "مەم" بۆ "زین"، گەورەی عەشقەکەیان، وەکو گەورەی عەشقی (مەم و زین) وایە، ڕۆژێك دەبێت بە چیرۆك و داستانێکی (مەم و زین) ئاسا،

گواستنەوەی هەندێك لە کەسایەتی و ڕووداوەکانی ناو داستان و کەلەپووری کوردی بۆ ناو شیعر هاوچەرخ، دەبێتە هۆی زیندوو هێشتنەوە و بەردەوامی دەقەکە و بەهۆی خەیاڵ و ئەندێشەی شاعیرەوە، زیاتر بۆ ئامانجی، ((بەیەکگەیاندنی ئێستا و ڕابردوو، بە مەبەستی خوڵقاندنی بنچینەیەکی چەسپاو بۆ داهاتوو))[٢٦٥].

لەلایەکی دیکەدا، "پەشێو" لە شیعری (خۆشم دەوێی)یدا، پەنجە دەخاتە سەر یەکێك لە دڕك و ناحەزانی عەشقی نێوان دوو دڵدار، کە بووەتە ڕەمزێك لەناوکورد و ئەدەبی کوردی، بۆ نیشاندانی وێنەیەکی خراپ و دوو بەرەکی، ئەویش(بەکۆی مەرگەوەڕ)ی، ناو داستانی (مەم و زین)ە، شاعیر ترسی زۆری لەوە هەیە کەسێکی، وەك (مەرگەوەڕ) بێتە ناو ئەو عەشقەیان و ببێتە هۆی دابڕان و جیاکردنەویان، بۆیە دەڵێ:

**((زۆر دەترسم،**

**لەناو دێری شیعرەکانما شار بتناسێ،**

**کامێرەی چاوی مەرگەوەڕ**

**وێنەت بگرێ و هەڵیواسێ..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل١٨٧).**

---

(٢٦٥) پەخشان سابیر حەمەد(د)، ڕەمز لەشیعری هاوچەرخی کوردی کرمانجیی خوارووی کوردستان(١٩٧٠ – ١٩٩١)، ل ٣٤٩.

"پەشێو" زیاتر گرینگی بە داستانە کوردییەکان داوە، لەناو ئەوانیش داستانی(مەم و زین)ی "ئەحمەدی خانی"یە، چونکە ئەو داستانە داستانێکی خەم و حەسرەتی نەتەوەیی و یەکڕیزی و دەوڵەتی کوردییە، شاعیر وەك نەتەوەخوازێك و بەردەوام بوونی ڕێچکەی "خانی" لەو دیو بابەتێکی دڵداری بابەت و باسێکی نەتەوەیی و نیشتیمان پەروەری خستووەتەڕوو، بۆیە "پەشێو"یش، هەمان خەم و ژان و ئازاری "خانی" هەیە. بەمەش خەم و حەسرەتێکی نۆستالژیای گشتی و نەستی کۆی بەرهەمهێناوە.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ داستانە کوردی و جیهانییەکان لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

شاعیر بەشێکی زۆری ئەم گەڕانەوەی بۆ نۆستالژیای گشتی ئەنجامداوە، لەڕێگەی داستانە کۆنە کوردییەکان، نەك هەر تەنیا بە ناوهێنان بۆ ئەو داستانە کوردییانە گەڕاوەتەوە، بەڵکو بە شێکی زۆری لە دەقەکانی ئەو داستانانەی هێناوەتە ناو دەقەکانی خۆی و تەوزیفی کردووە، بەڵام بۆ مەبەستی خزمەتکردن بە پەیام و ناوەرۆکی شیعرەکەی و بەتێڕوانینی خۆی خستوونیەتەڕوو.

شاعیر زیاتر داستانەکانی (محەمەد و سێویٚ و شیرین و فەرهاد و مەم و زین)ی، کردووەتە ئامانج لەناو دەقەکانیدا تەوزیفی کردوون،

بەمەش دەقێکی نۆستالژی گشتی و نەست و سۆزێکی کۆی بەرهەم هێناوە، بۆ نموونە، لە شیعری (وەرزی سەرهەڵدانی فەرهاد)دا، ئاماژەی بە داستانی (شیرین و فەرهاد) کردووە و دەڵێ:

**((فەرهاد! .. فەرهاد!**

**قولێنگەکەت بوەشێنە**

**لەدڵی ڕەقی بێستوونا**

**بۆ شارێکی برسی و تینوو**

**ئاودەربێنە...گوڵ بڕوێنە**

**فەرهاد!..فەرهاد!..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل١٣).**

شاعیر لێرەدا بە سوود وەرگرتن و گەڕانەوە، بۆ نۆستالژیای گشتی و لەرێگەی داستانێکی کۆنی نەتەوەیی، خەسڵەتی چاو نەترسی و جوامێری (فەرهاد)مان، بۆ دەخاتەڕوو، کە مژدەی ئازادی و سەرکەوتن و ڕزگارکردنە، لەدەست ستەم و زۆرداری و هاتنی خۆشی و شادیە، شاعیر لێرەدا، بۆ ئەوە نەگەڕاوەتەوە سەر ئەم داستانە، تاوەکو باسی خۆشەویستی فەرهادمان بۆ بکات، بەڵکو بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی بەکاری هێناوە، (فەرهاد) لێرە ڕەمز و نیشانەی خۆری هیوا و جوامێری کۆڵنەدانە و میللەتیش (شیرین) ئاسا کەوتووەتە ژێر ستەم و زۆرداری، پێویستی بە ڕزگارکردن و

هێنانی خۆش بەختییە، چونکە ((ئەم بەرچاو ڕوونییەی شاعیر نرخێکی هونەرمەندانە و ئایدۆلۆژیی گەورەی هەیە، چونکە لەگەڵ ئەوەدا، کە چۆتەوە سەر، "شیرین و فەرهاد" و دەبوو تراژیدیایەکی خەمناك ببینێ، بەلاّم فەرهادی ئەو بەدەستی پیرەژن ناکوژرێت و ئاو بۆ خەڵك دەهێنێت))[٢٦٦]، واتە شاعیر باس لە ئازادی و هەلاّتنی ڕۆژی کورد دەکات.

هەروەها لەشیعری (داستانی ئەڤینی سێوەخان)دا، کە شیعرێکی درێژە، بە گەڕانەوەی بۆ (داستانی محەمەد و سێویێ)، بەلاّم شاعیر ناوی "محەمەد"ی، گۆڕیوە بۆ "جوامێر"، کە ناوێکی کوردییە، شاعیر بەسوود وەرگرتن لەم داستانە پەردە لەسەر مەسەلەیەکی گرینگ لادەدات، کە ئەویش خیانەت و لەناو بردنی یەکترییە، چونکە شاعیر "حسەین ئاغا"، وەکو ڕەمزێکی خیانتکار و زاڵم وێنای بۆ کێشاوە و ئاماژەیە بۆخۆفرۆش و خیانەتکارانی میللەتی کورد بەشێکی ئەو ئاغا و کوێخایانە جاشبوون و خیانەتیان لە میللەتەکەی خۆیان دەکرد و بە کوشتنیان دەدان، شاعیر باس لە پەرتە وازەی گەلەکەی دەکات و داوادەکات هەموومان یەك ڕیز و یەك دەنگ بین، بۆ ئەوەی دوژمن لە ڕەگ و ڕیشە دەربهێنین، کەواتە: شاعیر بۆ

---

(٢٦٦) عزەدین مستەفا ڕەسووڵ(د)، شیعرەکانی ئەم ژمارەیە و چەند سەرەنجێك، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە(٨)، ١٩٧٣، ل٤٤.

مەبەستی تایبەتی خۆی ئەم داستانەی لەناو دەقە شیعریەکەی خۆیدا، بەکارهێناوە و دەڵێ:

**((هۆ سێوەخان!**

**گوڵەکەی تەڕبووی بەر باران،**

**بۆت دەبم بە تیشکی هەتاو،**

**گیانت گەرم دادەهێنم،..**

**جوامێرەکەم حسەین ئاغا مارێکە و هیچ کەس ناناسێ،**

**منی بینی، بڵێسکەی زمانی پیسی**

**ئارەزووی ڕەش و گڵاوی دەردەهێنێ!**

**تۆ دەکوژێ،...**

**بەیەکەوە و ئەگەر یەك بین،**

**ڕووبارێکین، دەریایەکین،**

**بە شەپۆڵی تووڕەیی و قین**

**دنیا دەهێنینە لەرزین..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ١٤٢،١٤٣).**

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ داستانە کوردی و جیهانییەکان لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

"ڕەنجدەر"یش، بەشێکی باشی ئەم جۆرە گەڕانەوەی، بۆ نۆستالژیای گشتی ئەنجامداوە، شاعیر، وەکو هەر شاعیرێکی دیکەی ئەدەبی هاوچەرخی کوردی، کەوتووتە ژێرکاریگەری ئەم جۆرە داستانانە و بەکاری هێناون و سوودی لێ بینیون، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی هۆشیاری و پاشخانێکی ڕۆشنبیری و بەئاگایی شاعیر، لە بەرهەم و سامانی نەتەوەیی و لەبیر نەکردنیان، تا جارێکی دیکە، لە دەقەکانی خۆیدا بە هونەر و تەکنیکێکی ئیستاتیکی بیانخاتەوەڕوو. ئەوەتا شاعیر لە ڕۆمانەشیعری (زێوان)دا، گەڕاوەتەوە بۆ داستانێکی جیهانی و کە داستانی سۆمەری (گلگامێش)ە، دەڵێ:

**((<u>گیای نەمریم</u> بەرەواژی بینی**

**زێوان حەزدەکات گەردەلوولێك هەڵبکا و بیبات..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر بەرگی یەکەم، ل٨٠).**

شاعیر باس لە (گیای نەمریی) دەکات، کە لە ئەفسانەی گلگامێشدا ئەو گیایە تاکە ئومێد و هیوای گلگامێش بووە بۆ گەیشتن

بە نەمریی، بـەڵام هـەوڵ و مانـدوو بـوونی بـێ سـوود و ئـەنجام بـوو. "ڕەنجدەر" بە سوود وەرگرتن لەم گیایە و ئەرکی ئەم گیایە خۆی لە وێنــەی گلگامێشـدا دەبینێتــەوە، کـە بـەردەوام بـە دوای نـەمریی و ژیـانێکی پـر لەسـەرووەری و کـار و بەرهــەمی داهێنــراودا دەگـەڕێت، چونکە نەمریی لای شـاعیر چـەمکێکی دیکـەی هەیـە و پێچـەوانەی " گلگامێش"ە، چونکە لای شاعیر مرۆڤی داهێنەر و خاوەن هەڵوێسـت، کە دوای خۆی شتێکی بەسوود جێدەهێڵێت و شوێن پەنجەی دیاربێ، ئەوە گەیشـتووەتە نـەمریی و ئـەم گیایـەی دۆزیووەتـەوە، بۆیـە لـەم دیدگایـەوە، شـاعیر ئـەم گیایـە تـەوزیف دەکـات و خوێندنەوەیـەکی دیکــەی پێدەبەخشــێ، دەبــێ ئــەوەش بخەینــەڕوو، کــە"ســەباح ڕەنجدەر" زۆرتر گرینگی بە ئەفسانە و داستانە مێژووی و کەسایەتیە ئایینیەکانـداوە، وەك"خـدری زینـدە" لـە بەشـێکی زۆری دەقـەکانی شاعیر دەرکەوتووە، بەڵام ئەمەش بەو مانایـە نییـە، کـە بـۆ داسـتانە کوردییەکان نەگەڕاوەتەوە، بـەڵکو باسـی کۆمـەڵێك داسـتانی کـوردی کـردووە، وەك (قـەڵای دمـدم، مـەم و زیـن، لاس و غـەزال، شـیرین و فەرهاد)، شاعیر لە شیعری (سرووش)دا، دەنووسێ:

**((ژیری ڕۆژهەڵات**

**قاقایەکی ئاشتیخوازانەی بە ڕوومدا بەرەڵڵاکرد**

**بەشیری ڕووەك ئومێدی کردمە قەڵای دمدم ))** **(سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر بەرگی یەکەم، ل٣١٨).**

لــــەم نۆســــتالژیایەدا، باســــی بــــەهێزی و ئومێــــد و ورەی"قـــەڵای دمـــدم" دەكـــات، لـــە كـــاتی ڕووبـــەڕوو بوونـــەوەی دوژمنەكان، شاعیر، وەك: ئاماژە دڵی خۆی لـە شـوێنی قـەڵای دمـدم داناوە لە بەرانبەر ستەمی ڕۆژگار و خەم و ئێش و ژانی نەتەوەكـەی، هەمیشە خەون دەبینێ و دەیـەوێت بگـات بـە لووتكـەی بـەختیاری و ئارامی دەروون.

## ٢- ٥ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ بەرهەمە فۆلکلۆرییەکان:

یەکێك لە هۆکارەکانی نوێگەری و نوێبوونەوەی شیعری لای میللەتان بەگشتی و شیعر و شاعیرانی کوردی بەتایبەتی گەڕانەوە بووە بۆ بەرهەمە جیاوازەکانی فۆلکلۆری نەتەوەیی، بە هەموو ژانر و جۆرەکانیەوە، چ لەڕووی ڕیتم و کێش و سەرواوە بێ، چ لەڕووی وشە و دەستەواژە فۆلکلۆریەکانەوە بێ، بەمەش فۆلکلۆر شوێنێکی باش و بەرچاوی لە ئەدەبی هاورچەرخ و نوێی کوردیدا، داگیرکردووە، وای لێ هاتووە، کە هیچ بەرهەمێك نادۆزیتەوە لەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری نەتەوەکەی نەخواردبێتەوە، چونکە ئەو هونەرە زۆر دەوڵەمەندە و شایانی گەڕانەوە و سامانێکی پڕ لە کانزا و خەزێنەیەکی ئەدەبییە، ئەمەش بە چەند جۆرێك شاعیران لەناودەقە شیعریەکانیاندا مەزراندوویانە، کەواتە: ((فۆلکلۆر هەر بەرهەم و کارێکی هونەری، کە پەیوەندی بە گەلەوە هەبێ لە ڕووی بەرهەم هێنانی ئەو بەرهەمە، یان ڕێبازی بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارە فۆلکلۆریە..، بە مەرجێ خاوەنەکەی نادیار بێت))[٢٦٧] فۆلکلۆریش، چەند جۆرێکی لێ

(٢٦٧) ئیسماعیل ڕەسوولێ، چەند باسێك دەربارەی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەب، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨١، ل٧٦،٧٥.

دەبێتــەوە، لەوانــە:(حەکایــەت، پەنــد، قســەی نەســتەق، گــۆرانی فۆلکلۆری، حەیران، جل و بەرگ و کولتووری کـۆن، ئـامێر و ئـامرازی کۆن،...تاد).

## ـ نۆسـتالژیای گەڕانـەوە بـۆ بەرهەمـە فۆلکلۆرییـەکان لـە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

شاعیر زۆرتـرین ئـاوڕی لـەم لایەنـە داوەتـەوە، دەتـوانیین بڵـێین: فەرهەنگێکی وشە و دەستەواژەی کۆنی کوردی، کە ئێستا بەکارنایـە و لــەناو دەقەکانیـدا دەدۆزینــەوە، ئــەوە جگــە لــە ئـامێری کـۆن و بــەکارهاتووی ســەردەی گونــد و ژیــانی ســادەی و پەنــد و گــۆرانی فۆلکلۆری و.....تاد، هەر ئەوەشە وای لە شیعرەکانی شاعیر کردووە، سادە و خۆش و ڕوون و ڕەوانبن، لـە ڕووی ڕیـتم و مۆسـیقاوە، ڕوون بێژییەکی ئیستاتیکی بە دەقەکانی بەخشیووە و خوێنەرێکی باشی لە خۆی کۆکردۆتەوە. شاعیر لە شـیعری (وشـەی پـەردە)دا، پـەنای بـۆ پەندێکی کوردی بردووە و لەناو دەقەکـەی خۆیـدا تـەوزیفی کـردووە، بەڵام "پەشێو" ئەرك و خەسڵەتێکی پێچەوانە بەو پەندە دەبەخشێت و شاعیر پێی وایە، کە هەر چەندە هەوڵ و تێکۆشـان دەکـەین، بـەڵام لەبەر دەستەڵاتی ستەم و زۆرداری ئاغا و کوێخاکـان، کـە خۆیـان بـە خـاوەنی گونـد و دیهـات و جوتیـار و هــەموو شـتێك دەزانــی، هــیچ

ئەنجامێکمان دەست ناکەوێت لەم چاندنە، چونکە کاتێ شاعیر ئەم دەقەی تێدا نووسیووە، ئاغا و کوێخاکان دەستەڵاتیان بەسەر هەموو شتێکدا هەبوو.

- **پەندی پێشینان**

شاعیر دەڵێ:

((ئاغا گووتی:

من پەیکەری خوام کتومت،

دەبێ گشت لا

بمپەرستن هەروەکو بت..

**<u>بچینە دە دووریەوە</u>**

**جاران پەندی وا هەبوو**

**منیش لە زۆر هەردم چاند،**

**بە زبلم بڕوا هەبوو**

**کەچی ئێستاش، داخەکەم**

**قەت هیچم نەدووریەوە.)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل٥٢،٥٣).**

شاعیر سوودی لەم پەندە کوردییە وەرگرتووە، کە دەڵێ (چ بچینی ئەوە دەدووریەوە)، شاعیرانی نوێی کورد زمانێکی ڕەسەنیان بەکارهێناوە، هەموو هەولێکیان، بۆ خۆ دوور خستنەوە بووە، لە

زمانی فارسی و عەرەبی و تورکی، کە ئەمە لەشیعری کلاسیکی بە بەراورد مەرجێکی سەرەکی بووە و دەبوایە شاعیر پەیڕەوی بکات، لەم بارەیەوە،"د.کەمال مەعرووف"، دەڵێ: ((لە ئاستی زمانەوانیدا شیعری کوردی نوێ بەوە جیادەکرێتەوە، کە وشەی کوردی ڕەسەن بەکاردەهێنێت و وشەی عەرەبی و تورکی و فارسییەکان پشت گوێ دەخەن))[(٢٦٨)]

- **گۆرانی فۆلکلۆری:**

گۆرانی کۆن و فۆلکلۆرییەکان و ئەو گۆرانییە مىللییەکانش، کە خاوەنەکانیان گوتوویانە بەشێکی زۆری فۆلکلۆرن و ئەوانیش لەوانەی پێشە خۆیان گوێیان لێبووە و گوتوویانەتەوە، ئەو شیعرە فۆلکلۆریانە هەریەکەیان گۆرانیەکە بۆ خۆی و گیانی زیندووی فۆلکلۆرە، چونکە ((گۆرانی لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا پەیدابووە و ڕەنگدانەوەی خەم و پەژارە و خۆزگە و ئاواتەکان بووە، بۆ مرۆڤی کوردیش وێستگەی حەسانەوە و دڵدانەوە و ئارام بەخشی بووە،..))[(٢٦٩)].

(٢٦٨) کەمال مەعرووف(د)، ڕەخنەیی نوێی کوردی، بەرێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٧٣.

(٢٦٩) سابیر ڕەشید، گۆرانی فۆلکلۆری، گۆڤاری، (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە(٢١)، ساڵی، ٢٠٠٦، لاپەڕەی دواباس.

"عەبدوڵڵا پەشێو" لەو دەقەی خوارەوە، بە ناوی (هەولێر لە یەکی شوباتا)، گەڕاوەتەوە، بۆ ناوی حەیران بێژ و مەقام و قۆریاتی کۆنی هەولێریان، کاتێ دەڵێ:

**((دەمێکە لە خرینگەی بازن و بەر بازنی**

**چەتیمە حەیرانی ڕەسووڵ،**

**وچانێك لە هانکە هانکی کارمامزی**

**ئەنگاوتەی قۆریاتی مشکۆ...))(عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٣٨٨).**

شاعیر باسی حەیرانبێژی ناسراوی نەتەوەکەمان "ڕسووڵ گەردی" دەکات، هەروەها سۆز و لاوانەوە بۆ قۆریاتی "مشکۆ" دەکات، چونکە لە هەولێر شەوانە ئەو قۆریاتانە لەلایەن تورکمانەکانی هەولێر گووتراوە و مشکۆش یەکێکە بووە، لەگۆرانیبێژە بەناو بانگەکانی قۆریاتی شاری هەولێر. شاعیر دەگەڕێتەوە، بۆ ئەو سەردەمە خۆشانەی لە هەولێر بووە و هەستێکی خۆش و دلگیر بووە، بەلام بۆ ئێستایی شاعیر گەڕانەوەیەکی نۆستالژی خەم و حەسرەت و ژان بە دڵ و دەروونی شاعیر دەبەخشێت.

- **کەل و پەلی فۆلکلۆری:**

"عەبدوڵڵا پەشێو" زۆرجار گەڕاوەتەوە بۆ کۆمەڵێك ئامراز و کەلوپەلی کۆنی کوردی سەردەمی گوندی، کە ئێستا نەوەی نوێ ناوی ئەو جۆرە ئامێر و کەلوپەلانە نازانێت وتەنانەت ناشیان ناسێت. شاعیر لە شیعری (پرێسکە)دا، دەڵێ:

**((ئەنگوستیلەی کامەرانیم**

**لەناو پرێسکەیەکدایە..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٢٢٠).**

"پرێسکە"، کە شاعیر بەکاریهێناوە، چ وەك وشەیەکی کۆن، چ وەك کەلوپەلێکی کۆن، کە پێشتر بەکاردەهات، کە ئێستا بەکارنایەت و نەماوە. پرێسکە: وەك سندووقێك لە کۆندا، بۆ هەڵگرتنی شتومەکی ئاسایی ڕۆژانەیان لەناو دادەنا، لە قوماش و پارچە پەڕۆیەك دروست دەکرا.

## - نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ بەرهەمە فۆلکلۆرییەکان لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

شاعیر زیاتر گۆرانی فۆلکلۆری و پەندی بەکارهێناوە، بۆ نموونە لە م پەندەدا:

- **پەندی پێشینان:**

پەندی پێشینانی کوردی ڕەنگدانەوەیەکی بەر چاوی هەیە، لەناو شیعری شاعیران بە گشتی و شاعیرانی نوێخواز و هاوچەرخ بە تایبەتی، چونکە ((پەندی پێشینان بەشێکی گرینگی فۆلکلۆرە، بەرزی و جوانی زمان و لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری و فەلسەفی ژیانی گەلی کوردمان بۆ دەردەخاتن))[270] لە شیعری "سێوێ" دا دەڵێ:

**((کچم! نەکەی**

**تەور هەڵگری بۆ دار بەڕووی بنەچەت و**

**تف بکەیتە ئاوی ڕوونی بنەوانت... (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل١٦٢).**

شاعیر لێرەدا دوو پەندی تێکەڵ بە یەکتری کردووە و بۆ مەبەستی ئامۆژگاری کچەکەی خۆی بەکاری هێناوە، بەلام مەبەستێکی گشتی هەیە و دەیەوێ بڵێ: مرۆڤ نابێ ئەسڵ و فەسڵی خۆی لە بیر بکات و لێی یاخی بێت و تف و نەفرەتی لێ بکات، چونکە ڕستەی (تەوری هەڵگری بۆ دار بەڕووی بنچەت) ئەسڵی پەندەکە بەم شێوەیە (دار کرمی لە خۆی نەبێ تەمەنی هەزار ساڵە)،

(٢٧٠) شوکریە ڕەسووڵ(د)، وەرز و ساڵنامەی میللی لە پەند و شیعری کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی، وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٢٩.

یان (تەور دەسکی لە دار نەبێ لێی مەترسە)، پەندی دووەمیش، کە شاعیر سوودی لێ وەرگرتووە و مەرزاندوویەتی لەناودەقەکەی خۆیدا، لە بنەڕەتدا پەندەکە بەم جۆرەیە (لە کانییەك ئاوت خواردەوە بەردی تێ مەگرە)، ئەویش ڕستەی (تف بکەیتە ئاوی ڕووی بنەوانت)دا، تەوزیف کراوە، شاعیر لەڕێگا ئەم پەندانەوە دەیەوێ هەستی نەتەوەخوازی لە دڵ و دەروونی کچەکەیدا پەروەردە بکات و داوای لێ دەکات بێ وەفا و بێ ئەمەك نەبێ بەرانبەر بە نیشتیمان و ولاتەکەی.

- **گۆرانی فۆلکلۆری:**

شاعیر لە شیعری (زیندەخەون و تارماییەکان)دا، دەڵێ:

**((کە شەو دادێ ئاسمانی شین پێ ئەکەنێ**

**لە باوەشیا مانگ ئەبێتە گۆرانیبێژ..**

**<u>لەیل هۆ لیلێ</u>... <u>بارمەکە لەیلێ</u> ئەڵێ..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ٢٠).**

شاعیر گەڕاوەتەوە، بۆ گۆرانییەکی کۆنی کوردی، کە هەست و سۆزێکی خۆشی بە شاعیر بەخشیوە، لە کاتی خۆی بۆ ئێستا و بیرهاتنەوەی حەسرەت و خەم دایدەگرێ.

- **کەلەپوور و ئامێری کۆن:**

شـاعیر وەك، کەسـێکی ئاگـادار و بـە شـێوەیەکی نەسـتی کـۆ، بەردەوام ژیانی گوندی و سادەی لەگەڵ برا و خوشك و دایك و بـاوکی لەبەر چاوە و ناتوانێ هـیچ کـات لـەیادی بکـات، بـەڵام بـەبێ ئـەوەی خۆی ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوانەی لە مێشك و زەینی خـۆی تۆمـارکردبێ، خۆیان لەناوزەین و نەستی شاعیر دەمێننەوە و لـە کـاتی پێویسـت و لە بـێ ئاگاییـەوە بـە دیاردەکەونـەوە. شـاعیر لـە شـیعری (بـە یـادی فەرهاد)دا، دەڵێ:

**((ئەوشەوانی دڵم ئاشنای عەشقی خاك و**

**چاوم هینی "<u>دەنگی داس</u>" و زاریشم هی " ئازادی خوای**

**کوردین ئێمە " و..**

**گوێیشم دەیبیست: دایەگەورە، خەمت نەبێ کوڕی سوورتە**

**لە ئەسارەت هـەر دێتـەوە..)) (ئـەنوەر قـادر محەمـەد، زریـان و زایەڵە و زنار، ل٩٠،٩١).**

شاعیر ئەم ئامێرەکۆنەی، کە ئێستا بەکارنایەت، یـان تـاك و تـەرا بـەکاردێ، کـە (داس)ە، بـۆ مەبەسـت و ئایدیایـەکی تایبـەت و گرێـی داوە، بە ئایدۆلۆژیا و بیری مارکسی و حیزبی شوعی، کە ڕەمـزی نـاو ئاڵاکـەیان بـریتی بـووە، لـە (داس و چەکوشـێك) ئاماژەیـە بـۆ مانـا و

دەلالەتی چەوسانەوە و کرێکار و ستەم و زۆرداری لەلایەن خاوەن زەوی یەکانەوە.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ بەرهەمە فۆلکلۆرییەکان لە شیعرەکانی " سەباح ڕەنجدەر"دا

لە دەقەکانیدا سوودی زۆری لە بابەتە فۆلکلۆریەکان وەرگرتووە و توانیووەتی بە هۆی ئەو توانا هونەریەی هەیەتی ڕووح بەبەر ئەو وشانەدا بکات، کە هەڵگری مانا و ڕەهەندی نۆستالژیان.

- **پەندی پێشینان**

شاعیر لەم شیعرەدا گەڕاوەتەوە، بۆ پەندێکی کوردی، کە دەڵێ:

**((بەردی هاوێشتە ناو فەخفووریی پڕ خواردنی**

**ماڵە جوان و ڕووناکەکانمان..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ٣٤٣).**

لەم دەقەی شاعیر دەتوانیین دوو خوێندنەوەی بۆ بکەین، یان دوو پەند لەخۆ دەگرێت، پەندێکیان دەڵێ: "لەکانییەك ئاوت خواردەوە بەردی تێ مەگرە"، پەندی دووەمیش "ئەگەر نمەکی ماڵێکت کرد

خیانەتی لێ مەکە" لە هەر دوو حاڵەتەکە، شاعیر بۆ مانـا و دەلالـەتی بێ وەفای و سپڵەیی بەکاری هێناوە، چونکە ئەگەر کەسـێك باوەشـی بۆ کردیتەوە، نابێ لەبری ئەوە چەقۆی ژەهراوی لـە دواوە لێ بـدەی. کەواتە شاعیر دەیەوێ بیر و بـەهرە لـەم پەنـدە جـوان و پـڕ مانایانـە وەربگرێت و دەقەکانی خـۆی پـێ بڕازێنێتـەوە و ئاسـتی شـیعرییەتی دەقەکانی بەرز بکاتەوە و خوێنەر پەلکێشی ناو شـیعرەکانی بکـات و چـێژێکی ئیسـتاتیکی پـێ ببەخشـێت، چـونکە پەنـدی پێشـینان، ((سەرچاوەیەکی ڕۆشنبیری دیکەیە، بۆ شاعیرەکان لە شیعرەکانیاندا بەر جەستەی دەکەن، ڕوون و ئاشکرایە شاعیر پەیوەندی بـە شـوێنی ژیـان و دەورووبـەرەوە هەیـە، چ ئـەوەی گـوێی لێ بـووە، چ ئـەوەی دەماو دەم گێڕاویانەتەوە لەلایەن خەڵکەوە ))[٢٧١].

- **گۆرانی فۆلکلۆری:**

شاعیر لـە کتێبـی (سـاڵی سـفر)دا، دەگەڕێتـەوە، بـۆ گۆرانییـەکی کـۆنی فۆلکلـۆری کـوردی، کـە گـۆرانی (لۆرکێ..لۆرکێ..خاتوونێ..لۆرکێ)یە، شاعیر ئەم گۆرانیەی لەرێگەی هەست و سۆزی خۆی و بەهۆی نەستەوە، جارێکی دیکە بـەبیر خـۆی

(٢٧١) شوکریە ڕەسووڵ (د)، و شـوکریە ڕەسـووڵ و جـەلال تـەقی(د)، پەنـدی پێشـینان و قسـەی نەستەقی کوردی، لە چاپکراوەکانی ئەمینداریێتی ڕۆشـنبیری و لاوانـی ناوچـەی کوردسـتان، هـەولێر، ١٩٨٤، ل٤٧.

هێناوەتـەوە و بەمـەش نۆسـتالژیای گشـتی لەڕێگـەی نەسـتی کـۆوە داهێناوە، شاعیر دەنوسێ:

**((ئەوەی لەبزەی مۆنالیزا بزرمان کرد**

**لەدڵ و گیانی گەرمی**

**گۆرانیی لۆرکێ و لۆرکێدا نایدۆزینەوە..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل ٣٠٤).**

- **کەلەپوور و ئامێری کۆن:**

"سەباح ڕەنجدەر" ئامێرەکۆنەکانی کەلەپوور و نەتەوەیی کوردی زۆر بەکارهێناوە، بۆ سوودی تایبەتی خۆی، بۆ ئەوەی دەقی ئەدەبی دەوڵەمەندتر و بەپێزتر بێت و هەر چەند ڕۆژگار بە سەریدا تێپـەڕێت، بە زیندووی و نەمریی بمێنێتەوە، ئەوا پێویستە ئەو دەقانە سوود لـە کەلـەپووری میللەتەکـەیان ببیـنن و بـەر جەسـتەی بکـەن، ئەمـەش بووەتە هۆی گەڕانەوەیـەکی نۆسـتالژیای گشـتی. شـاعیر لـە شـیعری (سووڕی پاراو بوونی بۆن)دا، دەڵێ:

**((دایك و باوکم و دایك و باوکیان**

**چرا و شەربەیان لە سێبەری قەلاّ بۆ دانام..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل٣٣).**

شاعیر ناوی دوو کەرەستەی کەلەپووری کۆنی کوردی هێناوە، (چرا و شەربە)یە. شاعیر ئەم دوو کەرستە کۆنەی بۆ دوو مانی دەلالی بەکارهێناوە، کە دەکرێ لە ئاستێکی دیکەی قووڵی دەقەکەوە، (چرا) بۆ هێما و ئاماژەی بوونی ڕووناکی لە شاری هەولێر بێ، واتە کۆنترین شارە، تاوەکو ئێستا ژیان تێیدا بەردەوام بووە و ڕووناکی لێ نەکوژایەتەوە. هەروەها وشەی (شەربە) کەرستەیەکی کۆنە و ئاوی تێ دەکرێ، ئاویش نیشانەی ئاوەدانی و ژیانە، کورد گووتەنی (ئاو و ئاوەدانی)، بۆیە دەگووترێت: ((نووسەر دەبێت بە زیرەکی و وەستایانە مامەڵە لەگەڵ ئەو کەلەپووردا بکات و بە شێوەیەکی ئەو تۆ، کە بە هیچ شێوەیەك دژایەتی نوێخوازی نەکرێت بۆ ئەوەی بەرهەمێکی ئەدەبی جوانمان شێشکێش بکات ))[٢٧٢].

(٢٧٢) ئیبراهیم حەسەن حەمەد، ڕەنگدانەوەی کەلەپوور لە ڕۆمانی هاوچەرخی کوردیدا لە باشووری کوردستان (١٩٨٥ – ١٩٩١)، نامەی دکتۆرا، بەسەر پەرشتی، پ.ی.د.(هیمداد حوسێن بەکر )، زانکۆی سەلاحەددین/ کۆلیژی زمان، هەولێر، ٢٠١٠، ل٣٥.

## ٢-٦ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ ڕووداوە سیاسی و مێژووییەکان:

میللەتی کورد، نەتەوەیەکە زۆرترین ڕووداوی سیاسی لە مێژووی نەتەوەکەیدا تۆمارکردووە، ڕووداوەکانیش ڕووداوی زوڵم و زۆرداری خوێناوی دژ بە گەلەکەمانن، چونکە ئێستاشی لەگەڵ دابێ بەردەوامن و دووبارە دەبنەوە، بۆ شاعیرانی کوردیش بووەتە هۆکارێکی باش، بۆ هەڵچوونی هەست و سۆزی شاعیران و هەوێنی داهێنانی چەندین دەقی داهێنەرانە و زیندوو و دیارن، جا ڕووداوەکان ڕووداوی مێژووی و کۆن بن، کە مێژووەکەیان بۆ سەدان ساڵ دەگەڕێتەوە، یان ڕووداوە نوێ و سەردەمەیەکان بن. شاعیران سوودێکی زۆر وەردەگرن لە ڕووداو و کارەسات و بەسەر هاتە مێژووییەکان و بەردەوام لەناودەقەکانیاندا بەکاری دەهێنن، چونکە ((شاعیران مێژوو تەوزیف دەکەن بە لە دایك بوونێك، لە بیرەوەریەکانی مێژوویان لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان، یان بەبیر هێنانەوەی کاتە ڕابردووەکان و لە وێنەی شیعری خۆیاندا بلاّوی دەکەنەوە، بە زۆری ئەم بیرهێنانەوەی ڕابردوو پێکچوونە و نزیك بوونەوەی وێنەی شیعرییە لە میانەی ئێستا و ڕابردوودا))[٢٧٣].

(٢٧٣) هاوژین سلێوە عیسا، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری "شێرکۆ بێ کەس"دا، ل ٢٩١.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ ڕووداوە سیاسی و مێژووییەکان لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

شاعیر بەهۆی ڕوودانی ئەم هەموو ڕووداوە سیاسی و مێژوویە خوێناویانەی بەسەر نەتەوەکەیدا هاتووە، لە شیعرەکانیدا بەشێوەی بەرچاو ئەم ڕووداوو و تەنانەت ناوی ئەو کەسانەش دەباتن، کە دەستیان هەبووە، لەو ڕووداوانەی بەسەر نەتەوەی کورددا هاتووە، سۆز و هەڵچوونێکی خەماوی لەرێگەی تەکنیکێکی هونەرییەوە بەدەقی کردوون. شاعیر ویستوویەتی نەوەی نوێ لەم ڕووداوانە ئاگادار بکاتەوە و خۆزگەی دووبارە کردنەوەی سەرکەوتنەکانی خواستووە و ترسی دووبارە بوونەوەی خراپەکانی هەیە، وەك: ڕووداوە سیاسیەکانی، (حەرس قەومی و هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلوول و شەڕی براکوژی.....تاد)، شاعیر لە شیعری (لەدایکبوونی سەر کۆمارێك )دا، باسی ڕووداوێکی مێژووی و کەسایەتیەکی مێژوویمان بۆ دەکات، کە هێرشی "هۆلاکۆ"یە، لەسەدەی (سێزدەم) و هاتنی بۆ کوردستان و کارە دڕندانەکانییەتی، بەمەش نۆستالژیایەکی گشتی بەرهەم هێناوە. واتە ((بەکارهێنانی کەسێتی مێژووی لە شیعردا، دەبێتە ڕەمزێك چەندین دەلالەت لە بیر و هەڵوێستدا دەورووژێنێت، لە ڕابردوودا دادەبڕێ و تا

لەگـەڵ واقیعـی هاوچـەرخ یەکبگرێتـەوە..))[٢٧٤]. بـەکارهێنانی ئـەو ڕووداوە مێـژووی و کەسـایەتیانە، زیـاتر بـۆ مەبەسـت و گەیانـدنی ئایدۆلۆژیای خودی شاعیرە، لەمەڕ ئەم ڕووداو و کارەساتانە. شـاعیر دەنوسێت:

**((سەدەی سێزدەم بوو**

**کاتیٚ...هۆلاکۆ**

**بەکوردستاندا وەك پەتا ڕەت بوو..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل١٤٢).**

---

(٢٧٤) پەخشـان سـابیر حەمـەد(د)، ڕەمـز لەشـیعری هاوچـەرخی کـوردی کرمـانجیی خـوارووی کوردستان(١٩٧٠ – ١٩٩١)، ل ٣١٦.

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ ڕووداوە سیاسی و مێژووییەکان لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

وەك شـاعیرێکی خـاوەن باکگراوەنـدێکی مـەعریفی و هەسـت بـە بەرپرسـیارەتی نەتـەوەیی، ڕووداوەکـانی فـەرامۆش نـەکردووە، کـە بەسەر میللەتەکەی دا هاتووە، ڕووداوە سیاسی و مێژوویەکانی لـەناو دەقەکانی تەوزیف کردووە، چ ئەو ڕووداوانەی شاعیر خۆی، وەك تاك تێیـدا بەشـداری کـردووە، چ وەك ڕووداوێکـی گشـتی بـێ، بەتایبـەتی شکست هێنانی شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی(١٩٧٤)، یان ڕووداوی سیاسی (حەرس قەومی) ساڵی (١٩٦٣)،.....تاد.

شاعیر لە شـیعری (ئـەو کەژانـە)دا، باسـی دیمـەنی جـوان و دەشت و کەژی کوردستانی دەکات، لە جوانی و پاکی خۆشیدا، بەڵام شاعیر دەڵێ: تەنیا شەڕی نەگریسی برا کـوژی دەتـوانی ئـەم کەژانـە ناشیرین بکات و بیشێوێنێت و لەناوی ببات، چونکە ئەو شـەڕە بـووە هـۆی وێرانکـاری و خـوێن ڕشـتنێکی زۆر و سەدسـاڵ کوردسـتانی و شارستانییەتی کوردی بەرەوە و دواوە بردەوە، هەست بە ڕەشـبینی و خەم و ژانی شاعیر لەناودێرەکاندا دەکەین، کاتێ دەڵێ:

**((ئەو کەژانەی، کەس نییە چۆکیان پێ دادا و**

**هێزیش نییە، لووتیان بێنێتەوە بۆ زەوی،**

**مەگەر شەڕی برا کوژی..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل١٠٠).**

## ـ نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ ڕووداوە سیاسی و مێژووییەکان لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

شاعیر یەکێکە لەو شاعیرە هاوچەرخانەی، کەوا زۆرترین گەڕانەوەی بۆ کەسایەتی و بیری ڕووداوە سیاسی و مێژوویەکان ئەنجامداوە، بێگومان ئەمەش ئاستی تێ گەیشتن و گرینگی ئەم ڕووداوانە بۆ شاعیر دەگەینێ، ئەگەرچی هەندێکیانی بە چاوی خۆی بینیووە، بەلأم هەندێکجار گەڕانەوەکان بۆ مێژوویەکی زۆر دێرین و کۆنی سەدان ساڵ دەگەڕێتەوە، بەمەش شاعیر جیهانبینی بۆ ژیان و داهاتوویێکی باشتری خستووتەڕوو، بەمەبەستی دووبارە ڕوونەدانەویان، بووەتە هۆی بەخشینی شیعرییەت بە دەقەکانی و دروستکردنی هەست و نەستێکی کۆ، چونکە ڕووداوەکان ڕووداوی نەتەوەین. شاعیر لەڕۆمانەشیعری (زێوان) دا، دوو ڕووداوی سیاسی تێکەڵ بەیەك کردووە، کە ماڵوێرانی و ڕاگواستن و تێکدانی گوندەکانی کوردستان و هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلوول دەگرێتەوە،

بـــەبیر هێنانـــەویان، دەبێتـــە هـــۆی خـــەم و ژان و ئـــێش و ئـــازارێکی نەتەوەیی درووستکردووە.

شاعیر دەڵێ:

**((نواڵە هێندەی ئاگری شەست و سێ دڕندەی**

**گوندی گەنجینەی منداڵیمی کرد بە پاشماوەی باخچەیەکی سڕ**

**نواڵە هێندەی ئاگری حەفتاوپێنج دڕندەی**

**گوندی گەنجینەی منداڵیمی کرد بە پاشماوەی باخچەیەکی سڕ))**

**(سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل٦٥).**

"سەباح ڕەنجدەر"ی، شاعیر بەسوود وەرگرتن لـەم دوو ڕووداوە، کە یەکـەمیان کودەتـای بەعسـی(حـەرس قـەومی) سـاڵی(١٩٦٣)یـە، دووەمیان پیلانی (شکستهێنانی شۆڕشی ئەیلوولە، لەساڵی ١٩٧٥)دا، وێنەیەکی ئیستاتیکی و هونەری و بەرزی داهێناوە، ئەوەتا شاعیر بێ وەفایی و ئازاری دڵ و دەروونی دوای جێ هێشتن و دابڕانی یارەکـەی (نواڵە)، بەرجەستە دەکات، ئـەم ئـاگرەی لـەناخی شـاعیر بـەربووە، بەهۆی دووری و بێ وەفایی یار، زۆر زیاتر و سووتێنەرترە لـە ئـاگری سووتان و کاولکاری گوندەکانی لەسـاڵی(١٩٦٣)"حـەرس قـەومی"ە، هەروەها لـە پیلانـی سیاسـی و مێـژوویی نسـکۆی شۆڕشـی ئـەیلوولی ساڵی (١٩٧٥)ە، شاعیر دوای بێ وەفایی و دابڕانی خۆشەویسـتەکەی خەم و ژانی عەشق ناخی دەسووتینێ و بۆخـۆ بەتاڵکردنـەوەی نـاخ و دڵ و دەروونی پەنا دەباتە بەر ڕابـردوو و خەسـڵەتی دڕنـدەی ڕژێمـی

بەعس دەداتە (نواڵە)ی، خۆشەویستی، چونکە ئەو هیوا و ئاوات و کۆشەکە و ئەوینەی لەناو دڵیدا بۆ (نواڵە) وێنەی شار و گوندەکانی کوردستان دروستی کردبوو، (نواڵە) ڕژێمی بەعس ئاسا، گڕی تێبەردا و سووتاندی، بەڵام دەگووترێ: ((ڕادەی دڵتەنگی هەرچەند بێ، ئەوا دەتواندرێ بەهۆی جۆرە بیرکردنەوەیەك هێوربکرێتەوە..))[٢٧٥].

"ڕەنجدەر"یش، بۆخۆ ئارام کردنەوەی ئەم هەڵچوون و تووڕەیەی دەروونی پەنا بۆ ڕابردوو و کارەساتێکی سیاسی، کە بەسەر میللەتی کورد هاتووە دەبات و سوود لە دڕندەی و بێ ویژدانی ئەم ڕووداوانە وەردەگرێت و بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی جارێکی دیکە، دایان دەڕێژێتەوە و دەقێکی دیکەیان لێ بەرهەم دەهێنێ.

شاعیر"ڕەنجدەر" ← وێنەی گوند و شارە سووتێندراوەکانی کوردستانە و گوندی خۆی، کە "دڵ"ە.

شاعیر"ڕەنجدەر" ← وێنەی شۆڕشی ئەیلوول ستەم و خیانەتی لێ کراوە.

"نواڵە" ← وێنەی ڕژێمی بەعس دڕندە و ستەمکارە.

"نواڵە" ← وێنەی گڕی ئاگری سووتاندنی گوندی گەنجینەی منداڵی(دەربەندی گۆم)، عەشقەکەی سووتێنەر و دابڕانەکەی کاریگەرە.

---

(٢٧٥) نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد(و)، دابەشبوونی ئیگۆ لە بەرگری کردندا، گۆڤاری کاروان، ژمارە(١٣٥)، هەولێر، ١٩٩٩، ل٩٠.

تەوەری یەکەم

# سێیەم

## سێیەم// ئەو هەلومەرجانەی ئەو شاعیرانەی بەرەو نۆستالژیا هێناوە:

ئـەدەب و داهێنـانی لـە بۆشـاییەوە، نایێتـەبوون و بەرهـەم نـایێن، نۆستالژیا و دەقی نۆستالژیش بە هەمان شێوە، لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆکاری گشتی و تایبەتی، خودی و دەرەکی دێتـە بەرهـەم، چـونکە مـرۆڤ زۆر جـار لـە دڵ و دەروونـی خـۆی بـە تـەواوی ئـارام و بـە ختەوەرنـەبووە و هەسـتی کـردووە لـەوەی ئـەو دەیـەوێ و ئـەوەی

دەستی دەکەویْ لـە ژیانـدا لێـك دوورن، حـەزوو و ئارەزووەکـانی پـڕ ناکەنەوە، بۆیە لەم بارانەدا خەونی مرۆڤ زیاتر و زۆرتر بـووە، لـەوەی لە حەقیقەتدا بوونی هەیە، ئەوپرسە بۆ شاعیران زۆرتر و کاریگەرترە، بەمەش بەرهەمەکانیان هەڵگری چـەمکگەلێکی لـەو شـێوەن، بۆیـەش زۆرجار خودی دەقەکە ئەو خـاڵ و هۆکارانـە دەردەخـەن، بەشـێوەی دەقێکـی زینـدوو لەرێگـەی کۆمـەڵێك ڕەمـز و هێمـا و هونـەرەکانی ڕەوانبێژییـەوە، ئێمـە لـەخوارەوە بەچـەند خاڵێـك گـرینگترین ئـەو هۆکارانە دەخینەڕوو:

**یەکەم: تێکچوونی ئێستا و ژیانی هەنووکەی مرۆڤ:** لە چاو جـاران و نەمانی خۆشی و شادییەکان و سـادەیی و بـیْ تـەماحی جـارانی لـە بەرانبـەر ئاڵۆزبوونـەکانی ئـەمڕۆ. لـەم بارەیـەوە"سـەباح ڕەنجـدەر" دەڵـیْ: ((هەسـت دەکـەم، ژیـان لـە دۆخگۆڕینـدا جـۆرە بـەرزی و نزمییەکی ناڕێکی تێدایە، دەمەویْ لەم دۆخگۆڕین و بـەرزی و نزمییـە ناڕێکەدا ڕزگارم ببێت، لەناو شیعری پەتیدا بژیم و مانایەك بە ژیـان و دادپـەروەری بدەم ))[٢٧٦].

**دووەم: واقیعی بچووکتر لە خەونی بـیْ سـنووری شـاعیران:** واتـە ئەوەی هەیە لەناو واقیعدا زۆر کەمترن لەو خەون و خەیاڵەی شاعیران

(٢٧٦) سەباح ڕەنجدەر، ئەزموون وەك ئاخاوتنێك لـەناو ژیانـدا، چـاپخانەی حـاجی هاشـم، هـەولێر، ٢٠١٤، ل١٣.

ئاواتی بۆ دەخوازن و هەمیشە خەونی پێوە دەبینن، بە ئومێد و ئامانجی بەرجەستەکردنیانە لەناودەقەکانیاندا.

**سێیەم: تاراوگەیی و دوورکەوتنەوە:** بە هەر هۆیەك لە هۆیەکان بێ، کەوای لە شاعیران کردووە، بۆ ئازادکردنی دڵ و دەروون لە زیندانی خەم و ئیش ئازار و غوربەتی دوورە وڵاتی و.....تاد، بەرەو دڵ و دەروون و جیهانی ناخی خۆیان و بیرەوەرییە کۆنەکانی جارانیان بڕۆنەوە، لەم بارەیەوە، "ئەنوەر قادر محەمەد" پەردە لەسەر ئەوە لادەدا، کە دووری و خەمی نیشتیمان و تاراوگە تەواوی شیعرەکانی (زایەڵە)ی داگیرکردووە، ئەوەتا دەڵێ: ((شیعرەکان دەربڕی ئەندێشەی کەسێکن وڵاتێکی بە هەموو جوانی کارەسات و بیرەوەرییەکانەوە بە جێهێشتووە، ئێستا لەکەنارێکی تری دووری دنیا لە دەورووبەرێکی ژیاریی و کولتووری تردا دەژی..))[٢٧٧].

**چوارەم: ناعەدالەتی کۆمەڵایەتی:** شاعیر زیاتر لە خەڵکی ئاسایی هەست بەو بابەتە دەکات، دەبینێ لەناو کۆمەڵگەکەیدا زوڵم و زۆرداری و دەست بەسەر داگرتنی هەموو پایەکانی ژیان و جیاوازی کردن لە نێوان چینەکانی کۆمەڵدا بە زەقی مومارەسە دەکرێ، ئەم

(٢٧٧) چاپێکەوتن لەگەڵ (ئەنوەر قادر محەمەد)، لە سلێمانی، کۆلێژی زمان، بەشی کوردی، لە رێکەوتی(٢١/٤/٢٠١٤)، کاتژمێر(١١)ی بەیانی.

بابەتە هەست و سۆزی دەورووژێنێ و وای لێ دەکات، بێ دەنگ نەبێ لە بەرانبەر ئەو کارە چەوت و هەڵانەی بەردەوام بەبەرچاویەوە ئەنجامدەدرێن و.....تاد.

**<u>پێنجەم</u>: مردن و ترسی مردن:** کاتێ شاعیران تەمەنیان بەرەو کەنار دەچێ و وا هەست دەکەن ئیتر ئەو گڕوتین و هێزەیان نەماوە، بۆ خۆ ڕزگارکردن و ئارامی دەروون پەنا بۆ ئەم شیعرانە دەبەن، کە هەڵگری مانا و چەمکی نۆستالۆژین.

**<u>شەشەم</u>: ڕووداوە سیاسی وشەڕ و ناکۆکییەکانی ناوخۆی وڵات،** بە تایبەتی و ئەوانەی بەرانبەر میللەتی کورد کراوە لە سەر دەستی ڕژێمە یەك لەدوا یەکەکانی عێراق و شەڕی نەگریسی براکوژی، کە شەڕێکی ناخۆی لە نێوان دوو حیزبی دەستەلاتداری هەرێم بوو، بەمەش لەبەر هەمەکانی هەرسێ شاعیردا ڕەنگی داوەتەوە و هەڵوێستی خۆیان دەربڕیوە لەسەر ئەم شەڕە و بووەتە هۆکاری ڕەشبینی خەم و ژان و نیگەرانی شاعیرانی ناوبراو.

تەوەری دووەم

# یەکەم

## ت٢- ١/ زمان لە دەقی نۆستالژیدا:

### لە ڕووی تیۆرییەوە:

ئاخاوتن و نووسین لەبارەی هەر ڕەگەزێکی شیعری بەگشتی و لەسەر زمان بەتایبەتی و زمانی شیعریش کارکردنە لەسەر ئەو بایەخ و گرینگیەی، کە لێیەوە شیعری بەهێز و نوێ و داهێنەرانە دێتە بەرهەم و لە شیعری دیکەی شاعیران جیادەکرێتەوە، بۆیە سەخترین پایە لە شیعردا، پایەی زمانە، لەبەر ئەوەی شاعیری سەرکەوتوو، لە پێناو سەرخستنی کایە شیعریەکەی، پەنا بۆ دروستکردن و بەدەستهێنانی ئەم زمانە باڵایەی شیعر دەبات، تاوەکو بتوانێ ئەو

چەمك و فۆرمەی خۆی دەیەوێ لەچوارچێوەی ئەم زمانـە شـیعریەدا، بەرجەستەی بکات.

زمان بۆ شیعر پێکهاتەیەکی سەرەکی و بناخەیـە، چـونکە هـەموو شیعرێك لە کۆمەڵێك وشە و پەیڤ پێکهـاتووە، وشـە هـەڵگری هـەموو مانـا دەلالیـەکانی ژیـار و ژیانـە، شـاعیر دەبـێ هەمیشـە بـۆ خـۆی فەرهـەنگێکی وشـە بێـت و شـارەزایی و ئـەزموونێکی باشـی هـەبێت لەسـەر هــەموو دیالێکــت و شــێوەزارەکانی زمــانی نەتەوەکــەی و ســوودیان لــێ وەرگرێــت و بیانکاتــە کەرســتە و زەخیرەیــەکی دەوڵەمەندی شیعری و ئەندێشە و بیر و سۆزی شیعرەکانی پێ بخاتـە ڕوو، شاعیری سەرکەوتوو هیچ کات بۆ وشە و دەستەواژە دانـامێنێ و هەمیشە چەند وشەیەك، وەکـو دانەپـەیڤ لـە فەرهـەنگی ئەندێشـە و خەیاڵیـدا بـوونی هەیـە، بێگومـان ئـەوەش تـەنیا بـە گەڕانـەوە بـۆ فەرهەنگی کۆن و شارەزابوون لە کولتووری کۆنی نەتـەوە و بەرهەمـە فۆلکلۆریەکانی باب و باپیرانی، دەتوانێ ئەم فەرهەنگە دەوڵەمەندەی دەسـت بکـەوێ، نۆسـتالژیاش، هۆکارێکـە بـۆ دەوڵەمەنـد کـردن و زیندووکردنەوەی سەدان وشە و دەستەواژەی کۆن و مـردووی زمـانی کــوردی و وشــە و زاراوەکــانی ناوچــە گوندنشــین و کــۆنی بــاب و باپیرانیانە و.....تاد، لەبەر ئـەوەی ((زمـان لای شـاعیر جگـە لـەوەی هۆکـاری گەیانـدن و پەیوەنـدی کردنــە بــە جــەماوەر، لــەو لاوەش تایبەتمەندییەکی تریشی هەیە ئەویش ئەوەیە، دەبێـت زمـان ڕەوان و

پڕ واتا و چەشە بەخش و ناسك و تەڕ و جوان و سەرنجڕاكێش بێت، كە ئەمە وا دەكات شاعیر لەنێو هەموو وشەكانی زمانەكەدا هەندێكیان هەڵبژێرێت بۆ داڕێشتنی شیعرەكانی، نەك هەر وشەیەك بەسەر زاری داهات واتای پیّ دروست بكات))[٢٧٨]. كەواتە، ئەگەر شاعیر خاوەنی ئەم فەرهەنگە نەتەوەیە بیّ، ئەوا لەناوئەو هەموو وشە و دەستەواژە ڕەنگاو ڕەنگانەی زمانەكەیدا دەتوانیّ وێنەیەكی جوانی شیعری لە ئاستێكی بەرزی داهێناندا، بهێنێتە بوون و بە ئارەزووی خۆی یاری لەگەڵ وشەكاندا بكات، كەواتە: ((زمانی نووسین و زمانی ئاخاوتن لە ڕووی پێكهاتنەوە، جیاوازییان نییە، تەنیا لە فەرهەنگ و گەنجینەی وشە و چۆنیەتی بەكارهێنانەكانیاندا جیاوازییان هەیە))[٢٧٩].

ئەوەی ئێمە دەمانەوێت، وەك زمان و پێكهاتەی زمانی لەسەری بوەستین ئەو وشە و دەستەواژانەن، كەوا دەق دەكەن بە دەقێكی نۆستالژی و هەڵگری مانا و دەلالەتی نۆستالژیان هەیە، چونكە زمان وەك بنیادێكی دیار و گرینگ لە ئاوێتەبوون و سوود وەرگرتن لە بابەت و كەلوپەلە كولتوورییەكاندا، لە دەقی نۆستالژیدا پانتایەكی فراوان و دیاری لە ئەدەبی هاوچەرخ و نوێدا تەنیووەتەوە، بەلاّم ئەم

---

(٢٧٨) ئیدریس عەبدوڵلا(د)، قۆناخی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری كوردی، ل٣٢٠.

(٢٧٩) محەمەد مەحوی(د)، زمان و زمانەوانی لە ڕۆژنامەگەرییتیدا، گۆڤاری زانكۆی سلێمانی، ژمارە(١)، ساڵی، ٢٠٠٠، ل ٩.

ئاوێتە بوون و تێ هەڵکێشکردنە، تێ هەڵکێشکردنێکی ڕەوانبێژی نییە، لەم بارەیەوە "د.ئازاد ئەحمەد مەحموود" دەڵێ: ((ئەم زاراوەیە، چ وەك كار و چ وەك دەلالەت كردن تێ هەڵکێشێکی ڕەوانبێژی نییە، کە لە کۆندا وەك دیاردەی ڕازاندنەوە و جونکاری و هونەر نواندن بەکاردەهات و ناسراو بووە، بەڵکو نرخێکی گوزارشت و دەربڕینێکی گرانبەهایە و شاعیر لە دەروازەی زمانەوە بە مەبەستی بە هێزکردنی ناوەڕۆکی دەق، کولتوور دەهێنێتە ناو تێکست و پشتی پێ دەبەستێ و داهێنانی تێدا ئەنجامدەدات..))[٢٨٠]، بۆیە دەقی نۆستالژی پڕیەتی لەم وشە و دەستەواژانەی، کەوا کولتوور و مێژوویەکی کۆنیان هەیە، لەناو نەتەوە و کۆمەڵگەی کۆندا، ئەمەش وا لە شاعیر دەکات زمانی شیعریان پڕبکەن و دەوڵەمەندی بکەن بەو وشانە بۆ ئەفراندن و داهێنانی بەردەوام لەڕێگەی سامانی نەتەوەییان، کە فۆلکلۆرە بە هەموو ژانر و جۆرەکانەوە، کەواتە: لێرەدا دەتوانین بڵێین: زمان لە دەقی نۆستالژیدا، چەند پێکهاتەیەکی هەیە، کەوا دەقەکە دەکاتە دەقێکی نۆستالژی. لەخوارەوە بەخاڵ ئاماژەیان پێ دەکەین :

(٢٨٠) ئازاد ئەحمەد مەحموود(د)، بنیادی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل ٢٩.

**یەکەم**: بەکارهێنانی وشە و دەستەواژەی دەربڕینی سۆزاوی، کە هەڵگری سۆز و خولیا و هەڵچوونی دەروونییە و لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆکاری دەرەکی و ناوەکی دێتەدی، جا هەندێك جار ئەو سۆزە سۆزێکی ڕۆمانسی و عاشقانەیە و هەندێك جاریش سۆز و لاوانەوەیەکی ویژدانی و لەئەنجامی ڕووداوێك و بینی دیمەنێکی جەرگبڕ و خەماوی و دڵ و دەروون هەژێن دروست دەبێ، لە هەردوو دۆخدا ئەو دەقەی لە ئەنجامی ئەو سۆزانەوە دێتەبەرهەم، دەقێکی نۆستالژی و وشە و پێکهاتەی لێوان لێو دەبێ لە نۆستالژیای تاك، کە پەیوەندی بە خودی دڵ و دەروون و هەست و سۆزی شاعیرەوە هەیە، ئەوتا دەبینین لەم بارەیەوە "ڕیتشاردز" دەڵێ: ((زمانی شیعر شێوەیەکی باڵای سۆزە و زیاتر جەخت لەسەر زمانی سۆز دەکاتەوە، لەناو شیعردا..))[٢٨١]. تەنانەت بەشێکی زۆری نووسەران هاوڕان لەسەر ئەوەی ، کە زمانی شیعری زمانی سۆزە و هەر ئەوەشە لە زمانی پەخشان جیای دەکاتەوە، نۆستالژیاش، پەیوەستە بە دڵ و دەروون و هەست و سۆزی شاعیرەوە، ئەوەش وایکردووە، دەقە نۆستالژیەکان پڕبن لە وشەی سۆزاوی و خەم و ژان و لاوانەوەی سۆزاوی، وەك: (خۆشەویستی و بێ وەفایی و دابڕان و یاد و

(٢٨١) پەخشان سابیر حەمەد(د)، ڕەمز لە شیعری هاوچەرخی کوردی– کرمانجی خوارووی کوردستان، لە ١٩٧٠–١٩٩١، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل١٦٧.

بیرەوەری جاران و بەردەرگای مـالآن و ژێـر سـێبەری داران و ڕێگـای کانی و ناو باخ و بێستان و.....تاد)ه.

**دووەم**: دەرکـەوتنی ئـەم وشـانەی بـێ ئومێـدی و ڕەشـبینیان لێ دەخوێندرێتـەوە، واتـە هـەموو ئـەم وشـە و دەسـتەواژانەی هـەڵگری چەمك و ڕەهەندی خەم و ژان و ئازار و ئێش و نەهامـەتین بـۆ شـاعیر لـە خـۆ دەگرێـت، جـا بەمـەش دەقێکـی تـەواو تراژیـدی دەهێنێتـە بەرهەم، تراژیدی بەهەردوو مانایەوە، چ وەك لە دەستدان و شین و ڕۆ ڕۆی شـاعیر بـۆ لـە دەسـتدانی ئـازیزێکی نزیکـی خـۆی، چ وەك بـێ ئومێـدی و کوژانــەوەی مـۆمی ئومێـد و نـەبوونی تروسـکایەك بـۆ داهـاتوویێکی باشـتر، بەمـەش نـاخ و دەروونـی شـاعیر تراژیدیایـەکی نۆستالژی، دێنێتە بەرهەم.

ئەم جۆرە دەقانەش، لە ئـەدەبی کـۆن و نـوێی کـوردی بـوونێکی دیار و بەرچاوی هەیە و لە لایەن ئەم سێ شاعیرەی "عەبدوڵلاَ پەشێو ، ئـەنوەر قـادر محەمـەد ، سـەباح ڕەنجـدەر"، کـە ئێمـە هـەڵمان بژاردوون، نەك هەر بوونی هەیە، بـەڵکو بنیـادی سـەرەکی پێکهاتـەی بەشـێکی دەقـەکانی هـەر سـێ شـاعیری پێکهێنـاوە، وەك وشـەکانی (مردن و ژیان و ترس و پایز و ڕۆژئاوا بـوون و تـەنیایی و ئـاوارەیی و با و ڕەشەبا و زریان و بەفر و بـاران و شەسـتە و غوربـەت و غـەریبی و.....تاد).

**سێیەم**: گەڕانەوە بۆ ئەم وشانەی کۆنن و ئێستا نەماون و بەکارنایەن، جا چ وەك وشەی کۆن، یان ناوی کەرەستە و ئامێرەکۆنەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری، ئەمەش هەندێکیان بەهۆی بەرەو پێشوەچوونی تەکنەلۆژیا و ئامێری نوێ، چ وەك ناو، چ وەك ئامێر بەکارنایەن، بۆ نموونە: داس و گۆزە و جەڕە و شەربە و کەندوو و هەمبانە و دەلاقە و جاحم و عەلەتریك و.....تاد،ە. "ۆردزۆرث– Wordworth" دەڵێ: ((شیعر گوزارشتە لە هەڵچوون، لەبەر ئەوەی ئەو زمانەی لەگەڵیدا دەگونجێت، زمانی سروشتە، کە لەسەر زمانی خەڵکی چینی خوارەوەیە، چونکە شارستانییەت خراپی نەکردووە، بەتایبەتی گفتوگۆی ئاسایی نێوان گوندنشینەکان))[282].

---

( ٢٨٢) جەبار ئەحمەد حوسێن(د)، ئێستێتیکای دەقی شیعری کوردی کوردستانی عێراق(١٩٥٠–١٩٧٠)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٩٣.

## لەڕووی پراکتیکییەوە:

### ـ زمان لە دەقە نۆستالژییەکانی "عەبدوڵلا پەشێو"دا

شاعیر یەکێکە لە شاعیرە دیارەکانی ئەدەبی کوردی و شوێن پەنجەی لە پێگەی ئەدەبی کوردیدا دیار و بەرچاوە، بە شێوەیەکی ئاشکرا و زەق لەناو دەقەکانیدا ئەم وشە و دەستەواژانە بەرچاو دەکەون، کە هەڵگری چەمکی نۆستالژیان، شاعیر بەو پەڕی هۆشیارییەوە، ئەم کارەی ئەنجامداوە و گەڕاوەتەوە، بۆ وشەی کۆن و پەتییە کوردییەکانی سەرجەم ناوچەکانی کوردستان، بە هەموو دیالێکت و شێوەزارە جیاجیاکانەوە، لەم ڕووەوە "پەشێو"خاوەنی پاشخانێکی ڕۆشنبیری و کولتووری بەرزە و تەنانەت، وەك فەرهەنگێك لە وشەی کۆنی کوردی وایە، چونکە لە کۆتایی هەردوو دیوانەکەیدا سەدان وشەی کۆن و نەماوی کوردی بەکارهێناوە و لە کۆتایدا فەرهەنگێکی بۆ دروست کردوون، چونکە دڵنیایە لەوەی بەشێکی زۆر لە خوێنەران ئەم وشانە ناناسن و گوێیان لێ نەبووە، ئەوەش دەوڵەمەندی ئەندێشە و خەیاڵی "پەشێو"مان پیشان دەدات لەم بوارەوە.

"پەشێو" لە هەردوو شاعیرەکەی دیکە "ئەنوەر قادر محەمەد، سەباح ڕەنجدەر"، زۆر و زیاتر ئەم گەڕانەوەی بۆ وشە کۆن و لەبیرچووەکانی زمانی کوردی بردووە، دیارە ئەو کارەی شاعیریش بە مەبەست بووە، چونکە دەیەوێ زمانەکەمان لەناو نەچێت و نەکەوێتە ژێر لێشاوی زمان و وشەی بیانی بە ئاشکرا هەست بە نیگەرانی و خەمخۆری شاعیر دەکەین لەم بارەیەوە، لەلایەکی دیکەوە، شاعیر دوای ئەزموونێکی دووروو درێژ لە تاراوگەیی و دوورە وڵاتی، بەڵام بەم کارە هەوڵیداوە زمانەکەی خۆی بپارێزێ و ڕێگا بە وشە و دەستەواژەی بیانی نەدات بخزێتە ناو دەقەکانی، هەر چەندە تاك و تەرا وشەی بیانیشی بەکارهێناوە، بەڵام ئەمە حاڵەتە نەوەکو دیاردە، ئەگەرچی گەڕانەوە، بۆ وشە کۆنەکانی کوردی پەتی بووەتە دیاردە لەناو دەقەکانی، ئەمەش بۆ مەبەستی و شێوازی تایبەتی خۆی و گەیاندنی پەیام و گوتارە شیعرییەکانی پەنانی بۆ ئەم وشە کۆنانە بردووە و سامانێکی دەوڵەمەند و چەندین داهێنانی لەم ڕێگایەوە پێ ئەنجامداوە، بۆ نموونە وشەکانی وەك: (کیسە، قڕەقڕ، هەیهۆ، کەژاوە، پریشکی ئاگر، کلدان، هەش، دەقیڕوسیا، حەجمان، پرێسکە، مخابن، خەسێن، بێ سەودا، دەبەنگ، خەمە گڕوو، عەیامێك، مەفتەن، دەوار، کوندە، حەسحەس، لۆتی، بەیار، سابات، قانگ، هەتاو گاز، وانەك، گۆزە، زمانە گا، تاقچکە (دەلاقە)، بالۆرە، بسك، تۆتکە گرتن، ڕاشکان، نیفۆ و.....تاد)ە، ئەمانە و چەندین

وشەی کۆنی دیکە، لـە شـیعرەمانی (پەشـێو)دا، بوونیـان هەیـە، کـە هەندێکیان وشەی مردوون و بەکار نایەن، هەندێکیشیان تەنیا لە گوند و دێهاتەکان لای پیاو و ژنە بە تەمەنەکان بەکاردێن.

بۆ نموونە لەم شیعرەی خوارەوە " پەشێو" دەڵێ:

**((بەلأم، هەیهۆ!**

**کەی لای ئێمە**

**پەسند بووە پیاوی ڕاستگۆ؟)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل١٤٥).**

یان لە شیعری (ژان)دا دەڵێ:

**((بەم نیوە شەوە**

**هەروا پرسیارە و فڕکەی باڵی دێ**

**حەجمانم نییە..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل٢٥٦).**

یان لە شیعری (پرێسکە )شدا، دەڵێ:

**((لەو کۆڕەدا**

**پرێسکەیێکم کردەوە،**

**کەوا ڕۆژگار**

**عەیامێك بوو گرێی دابوو..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسـپم هـەورە و ڕکێفم چیا، ل ٣٣٠).**

"پەشێو" زمانێکی سادە و ساکار و ڕەوانی هەیە، ئەو سادە و ساکارییەی دەگەڕێتەوە بۆ بە ئاگایی و ئاستی مەعریفی شاعیر و وشەکانی سامانی کەلەپووری نەتەوەکەی، زمانی "پەشێو" زمانێکی پاراوە، پڕیەتی لە وشە و دانەپەیڤی فۆلکلۆری و زمانی میللی و خەڵکی لادێ و گوندەکانی کوردستان، بەڵام بۆ مەبەست و داهێنانی هونەری و گیانێکی نوێخوازی پێ بەخشیووە، چونکە ((پرۆسەی داهێنانی شیعر، زیاتر لە بواری داهێنانی زماندا خۆی دەنوێنێت..))[٢٨٣].داهێنانی شیعریش ئەوەیە، کەوا شاعیر وشە و دەستەواژەیەك بەکاربێنێ دەلالەتێك زیاتر بگەینێت، بۆ نموونە: لە شیعری (ئەگەر ئەمجارە بێمەوە) وشەی میللی و سادە و ساکاری لادێی، وەك (قەرسیل، بەلەك، نەوی، گاشەبەرد، بەرۆك، کفت، تفت، بەرخۆڵە، جووین و.....تاد)، بەکارهێناوە. شاعیر دەنووسێ:

**((ئەگەر ئەمجارە بێمەوە**

**بەیانییان،**

**وەك بەرخۆڵەیەکی ساوا،**

**لەناو قەرسیلی پاراوا**

**تل دەخۆم و**

(٢٨٣) نصرت عبدالرحمان(د)، الصوره الفنیه فی الشعر الجاهلی فی ضوء النقد الحدیث، مكتبه الاقصی، عمان، ١٩٨٢، ص ١.

**گیایەکی تفت تێر تێر دەجووم،**

**تا کفت دەبم،**

**پێ و بەلەکم**

**لە شەونمی سارد هەڵدەسووم!..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ٣٣٩-٣٤٠).**

شاعیر لەم وشە سادە و ساکارانەی میللەتەکەی، توانیوویەتی دیمەن و وێنەیەکی هونەری پڕ لە سۆز و هەستی ورووژێنەر بهێنێتە ئاراوە، توانای "پەشێو" لێرەوە دەدرەوشێتەوە، بۆیە دەگووترێ: ((زمانی شیعری پەشێو، زمانێکی ئامادەکراو و تایبەت نییە، زمانێك نییە، کە جیاواز بێت لەگەڵ ئەوەی کە خەڵك قسەی پێ دەکات، بەڵام بەکارهێنانەکەی تایبەتە))[٢٨٤].

ئەم دەقەی شاعیر دەقێکی تەواو سۆزاوی و عاتفیە هەست بە هەڵچوون و گڕگرتوی دڵ و دەروونی شاعیر دەکەین، بۆ نیشتیمانەکەی، سۆزەکەی ئەوەندە بەهێز و کاریگەرە ئامادەیە ببێتە بەرخۆڵەیەکی کوردستان، بۆیە "پەشێو" لەم بارەیەوە لەسەر زمانی شیعر، دەڵێ: ((شیعر بەکارهێنانی تایبەتی زمانە، ئەگەر نا هەر ئەو زمانەی شیعری پێ دەنووسم هەر ئەو زمانەشە قسەی پێ دەکەم،

---

(٢٨٤) شەرمین ئیبراهیم عەزیز، پەشێو و تازەکردنەوە لە شیعری کوردیدا، چاپخانەی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٦، ل١٢٤ .

ئـيتر باوەڕناكـەم كـەس وشـەی تـازە دروسـت بكـات، بـەڵام زۆرجـار دەبينی وشە و زاراوەی گوندێك دەيكەيە هۆنينی شيعر، بەبێ ئەوەی پێويستت بە قاموس هەبێ...))[285].

دەبێـت ئـەوەش لـە بـیر نەكـەين "عەبـدوڵڵا پەشـێو" وەك شـاعیرێكی ناسـيۆناليزمی و بـۆ گەيانـدنی مەبەسـت و پـەيامی شيعرەكانی پێويستی بە وشە و دەستەواژەی سادە و ساكاری ناو ميللەتەكەيـەتی، هـەر ئـەوەش وای لـە "پەشـێو" كـردووە فـۆرم و ڕوخساری نوێ، بـە قوربـانی گوتـاری شـيعری بكـات، چـونكە زمـانی شيعر لای شـاعیر زمـانی گەيانـدن و ئامانجـە، كـە دوو هێڵـی تـەريبی زمانی شيعرن.

## ـ زمان لە دەقە نۆستالژييەكانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

شاعیر كەمتر لە "پەشـێو" ئـەم گەڕانـەوەی ئەنجامـداوە، چـونكە شـاعیر زيـاتر لايـەنی سـۆز و وشـەی سـۆزاوی و عـاتفی لـەناو شـيعرەكانيدا، وەك بابـەتێكی نۆسـتالژيا و زمـانی دەقـی نۆسـتالژی بەكارهێناوە، لەگەڵ هەسـتكردن بـە ڕەشـبينی و بـێ ئومێـدی و ئـەو وشە و دەستەواژانەی ڕەشبينی و خەم و حەسرەتی بـێ ئومێـدی لـە خۆ دەگرێت لە شيعرەكانی بوونێكی زەق و بەرچـاوی هەيـە، چـونكە شـاعیر ئـەزموونێكی درێـژی لـە غـەريبی و تاراوگەيـدا هەيـە، بـەڵام

---

(٢٨٥) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٤.

ئەمـــەش بـــەو مانابیـــە نابیـــە، کـــەوا پـــەنای بـــۆ هـــیچ وشـــە و دەستەواژەیەکی کۆن و مـردووی میللەتەکـەمان نـەبردووە، بـەڵام بـە بەراورد لەگەڵ "پەشێو"دا، تەنیا حاڵەتە لای "ئەنوەر جاف" شـاعیر ئەو وشە کۆنانـەی، کـە بـەکاریهێناون، بـریتین لـە (سـێوێ، غـەریب، شاران، زەنگیانە، کڵاو بـۆرگ، فـەرەنگی، لـێ لـێ، لـۆ لـۆ، خـەرمان، هۆن هۆن، هەیوان، لۆکس، ئەسارەت، لرفە، قوتیلکە، دەلاقـە، چـڕە دوکەڵ، قوڵینگ، پەرێز،...تاد)، ه.

شـاعیر لـە شـیعری (شـیعرەکانم)دا، ئـەو زمانـەی دەقەکـەی پـێ نووسیووە، وشە و دەستەواژەکانی پڕن لـە خـەم و ژان و نائـارامی و بێ ئومێدی و نیگەرانی، تەنانەت هەست و سۆز و تراژیدیایەکی قـووڵ لەناو دەقەکاندا بوونی هەیە، ئەویش دەنگی ناڕەزایی و بێ ئـۆقرەیی و ڕەشبینی شاعیرە، کە دەڵێ:

**((سوێ و مەینەتی یەکەم کۆستن**

**تفت و تاڵیی کۆچ کردنن،**

**شەو سووتانی غەریبانن،**

**کسپە و ئازاری نۆ زامن..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل١٢٧).**

لێرەدا دەبینین وشەکانی (سوێ و کۆست و تفت و تـاڵ و کـۆچ و شەو و سووتان و غەریب و ئازار و زام). ئەو زمانە نۆستالژییەن، کەوا شاعیر دەقەکەی پێکردووە، بە دەقێکی نۆستالژی، لێرەوە گرینگی و

دەست ڕەنگینی و خەیاڵ بڵاوی شاعیر بۆ سوود وەرگرتن لەم وشە خەماوی و پڕ لە هاوارانە، بووەتە داهێنانێکی هونەری و وورووژاندنی هەست و سۆزێکی کاریگەر، چونکە زمان بە هۆی دەوڵەمەند بوونی لە فەرهەنگی لێکسکی وشەدا، بۆ پێکهێنانی وێنەی شیعری و داهێنانی هونەری تێدا ئەنجامدەدات، وەك لەم دەقانەی شاعیر بەڕوونی هەستی پێدەکەین. هەروەها شاعیر لە شیعری (ساماڵ)دا، وشە و دەستەواژە زمانییەکە، هەمووی دەلالەتی ڕەشبینی و نائومێدی و حەسرەتی شاعیرن، هەست بە دەروونێکی نائارام و تەنیا دەکەین، کە ئەوەندە تەماویە هیچ ترووسکایەك بەدیناکەین، خەریکە دنیا دەکات بە خەراباتی نا ئومێدی و سیمایی ڕەشبینی باڵی بەسەر دەقەکەدا کێشاوە، وەك وشەکانی (چۆلەکە، کزەی سارد، هەردی دەروون، هەور، ئازار، هەڵچوون، زریان، بەستان، تەور، زمدار، بەفر، تەم،.....تاد)ە.

شاعیر دەڵێ:

**((گەر چۆلەکەی کزەی ساردی هەردی دەروون**

**کۆکەمەوە و بە ئاسماندا بەڕەلای کەم**

**هەوری قورسی کەوەڕۆژە و شینایی لە ئاسمان ئەبڕێ**

**گەر نیهالی هەڵچووی ئازار**

**بە تەوری وەڕزیی ببڕم**

**گزرەیەکی وای تیا ئەبێ...گەر داگیرسێ...**

**گەر ڕوخساری تەماویی خۆم شەقام بوایە**
**هەموو ڕۆژێ لێم ئەنووسی:"بێزارم لێت"..**
**شیعرەکانم دارکاژن و کوکوختیی خەم**
**بە دەوریانا گڕ ئەخوات و بە حەواوە**
**لەسەر سەری سەوز و بەرزیان ڕائەوەستێ.)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل ٥٥،٥٦).**

زمان لە دەروونی شاعیر کۆمەڵێك وشە و پەیڤ لە خۆ دەگرێت، کە هەڵگری مانا و دەلالەتی خۆشی و شادی و نیگەرانی و خەمۆکی و حەسرەتدار و ئێش و ئازارە، چونکە لە دەرەوەی سنووری زمانی شیعریدا ئەم وشە و پەیڤانە ڕەنگە تەنیا واتای لێکسیکی فەرهەنگی سادە بگەیەنن و لەبیرکردنیشیان ئاسانتربێ، لە دڵ و دەروونی مرۆڤ، چونکە ((ئەرکی شاعیر ئەوەیە، زمانێك دابهێنێ، کە گوزارشت لە خۆی بکات))[٢٨٦]، بەجۆرێك بە هۆی ئەو زمانەیەوە بتوانێ پرسەکانی ناخی خۆی بەرانبەر بە دیاردەکانی بوون و بوونەوەر دەرببڕێ.

---

(٢٨٦) محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم، پێکهاتەی زمانی شیعری لە ڕوانگەی ڕەخنەی ئەدەبیی نوێوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٢، ل ٢٤-٢٥.

## ـ زمان لە دەقە نۆستالژیەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

زمان و پێکهاتە زمانییەکان، لەلای شاعیر کارێکی زۆری لە سەر کراوە و شاعیر هەمیشە لە ئاخاوتنی ئاسایی و قسەی خەڵکی هەوڵیداوە زمانێکی دیکە، دروست بکات و ببێتە خاوەن دەنگ و ڕەنگی خۆی، زمان ڕەگەزێکی پڕ بایەخە لای شاعیر، زمانی شیعرەکانی "ڕەنجدەر" زمانی مەجاز و کینایە و خواستنە، وەك لەوەی زمانێکی ڕاستەوخۆی گەیاندنی پەیامی شاعیر بێت، "شارلَ بۆدلێر"، نووسیوویەتی ((ئەو هەوڵە چاکەی بۆ شیعر دەدرێت، هەوڵێکی پڕ لە تەقەڵلاَ و ماندووبوون و بنیادنان و پێکهێنانی بینا و ئەفراندن و داهێنانە، لە ڕێگەی زمانەوە جێبەجێ دەکرێت ))[287].

ئەگەر زمان لای شاعیرانی کلاسیك هۆکارێك بێت، بۆ ڕازاندنەوە و هونەرەکانی ڕەوانبێژی، ئەوا لای شاعیرانی نوێخواز و هاوچەرخ ئامانجە و دەبێ شاعیر بەو پەڕی هۆشیارییەوە، مامەڵە لەگەڵ ئەو ڕەگەزە بکات و زمان لەناوزماندا بخولقێنێ، ئەوەتا"سەباح ڕەنجدەر"، خۆی دەڵێ: ((من زمان دەنووسم لەبارەی زمانەوە

(٢٨٧) ئازاد ئەحمەد مەحموود(د)، بنیادی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل١٨.

نانووسم))[288]، کەواتە هەر بەرهەمێکی نووسراو، بەتایبەتی شیعر، نەتوانێ بچێتە ناوەوەی چین و توێژەکانی کۆمەڵگەوە، ناتوانێ سوود لە زمان و پێکهاتەکانی وشە و دەستەواژەی خەڵکی ڕەمەکی و ئاسایی ناو کۆمەڵگە وەربگرێت و بیانگوازێتەوە، بۆ خاڵی ناوەندنی دەقە شیعرییەکانی و بۆ مەبەست و ئامانجی خۆی بەکاریان بهێنێت، بەمەش دەقێکی داخراو و مردوو دێنێتە بوون و لە داهێنان دەکەوێت، شاعیرانی هاوچەرخ سوودێکی زۆریان لە زمان و وشەی کۆنی کوردی پەتی و کەلەپووری فۆلکلۆری وەرگرتووە، **"عەبدوڵڵا سەڕاج"** لەبارەی زمانی شیعری "سەباح ڕەنجدەر"ەوە، گوتوویەتی:**((لەشیعری هاوچەرخدا کەم شاعیر هێندەی تۆ قووڵایی زمانی لە شیعردا خەملاندووە.))**[289]."ڕەنجدەر"یش، خاوەن مەعریفەیەکی قووڵی زمانی نەتەوەکەیەتی و بە ئاگایەوە دەستی بۆ وشە و دەستەواژە زمانیەکانی ناو کۆمەڵگەی کوردی بردووە، بە کۆن و نوێیەوە لە خزمەت تەکنیکە نوێکانی نووسین و داهێنانی پێ ئەنجامداوە، بەگەڕانەوە، بۆ ئەو ڕەگەزانەی لەناو حەیران و لاوك و بەیت و داستانە خۆماڵییەکاندا بەزەقی لەناو دەقەکانیدا دیارە، بەشێوەیەکی نەستی لەناوزەینی شاعیر. وشەکانی، وەك: (شەربە،

---

(٢٨٨) سەباح ڕەنجدەر، ئەزموون وەك ئاخاوتنێك لەناو ژیان، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٤، ل٥٥.

(٢٨٩) عەبدوڵڵا سەڕاج، دۆنایدۆن یان بەد گۆڕان، سلێمانی، ٢٠١٣، ل١٤٨.

گۆزە، دەفـە، کـێچ، مۆرانـە، جـەردە، چـرا، هەمبانـە، تەشـی، لبـاد، عـەودالٚ، تـاق، خرمـەخرم،...تـاد). ئـەوەتا لـەم بارەیـەوە، "سـەباح ڕەنجدەر" دەنووسێت ((واتە کولتووری کۆمەڵگەی خۆت، ئەم جـۆرە دۆخگۆڕینە و گواستنەوەیە خەسڵەتی ئەدەبی ئێستێتیکییە و هێـزی دەروونی دەدات بە مرۆڤ، هەنگاو بە هەنگاو خەسـڵەتەکانی خـۆی لـە دەروونی مرۆڤدا دەپارێزێـت و بـۆ قـووڵترین گۆشـەی دلٚ دەگـەڕێت و باری دەروون دەخەملێنێت،...))[290].

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، "پەشـێو" لـە هـەردوو شـاعیر زیـاتر گەڕاوەتەوە، بۆ وشەی کـۆنی کـوردی پـەتی، بـەلاّم لای "ڕەنجـدەر" زمانــە نۆســتالژیەکە، زیــاتر هــەڵگری چــەمك و ڕەهەنــدی خــەم و حەسرەت و نیگەرانی و بیٚ ئومێدین...، جا چ خەم و سۆزی عاشـقانە و بــیٚ وەفــایی یــار و دووری و دابــڕان بێــت، چ خــەم و ژان و ســۆزی لاوانـەوە و لـە دەسـتدانی ئـازیزان و.....تـاد، ئەمـەش بووەتـە هـۆی بەکارهێنانی وشە و دەستەواژەی نۆسـتالژی لـەناو ئـەو دەقانـەی بـۆ ئـەو مەبەسـتانەی سـەرەوە، کـە ناومـان هێنـا نووسـیوویەتی، بـەلاّم بەشێواز و تەکنیکی جیاواز و ئـەزموونی شـیعری خـۆی، بـۆ نموونـە: شاعیر لە کتێبی (ساڵی سفر)دا، دەڵیٚ:

(٢٩٠) سەباح ڕەنجدەر، کـە شـکۆی شـیعر دەبێتـە ئـەزموونی ژیـان و نووسـین، "وتـاری ئـەدەبی" ڕۆژنامەی هەولێر، ژمارە(١٩٩٢)ی ، سێشەمەی (٣٠)ی، ئەیلوولی ٢٠١٤، هەولێر، ل١٧.

**((ئەگەر تەشیی ژیان باتنەدا**

**دڵخۆشیی میوە هەست پێ ناکەین**

**لە کاتی پێگەیشتن دا..))(سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل٢٢٥).**

هەروەها لە دەربڕینی کۆمەڵێك وشە و پەیڤی سۆزاوی و لاوانەوە، بۆ لەدەستدان و گۆڕی باوکی "ڕەنجدەر" دەقێکی پڕ لە نۆستالژی بەرهەم هێناوە، کە تەواوی زمان و دەربڕینە زمانییەکانی هەڵگری نۆستالژیای خودین، کە پەیوەستە بە هەست و دڵ و دەروونی شاعیرەوە، وشەکانی وەك (کێل، گۆڕستان، گۆڕ، تازییە، تاتاشۆر، کفن، ئێسك، گوند، منداڵی، مزگەوت، ڕاز، گلەیی،...تاد)، لەم دەقەی خوارەوە بەرچاو دەکەون.

**((ئاوێنە کە ناوەخنی چاوە نەیگەیاندمەوە وێنەکانی**

**بە منداڵی لەسەر کێلی باوکم کێشام...**

**گۆڕەستان ماڵێکە ئازیزەکانی**

**بانگ دەکاتە ناو خۆی بە مەدالیا ناسراویان دەکات**

**فێری زمانی هەموومان دەبن...**

**دەنگێك لە هەستی جەربەزەیی شیری دایکمەوە**

**ئەو گۆڕە گۆڕی باوکتە...**

**گۆڕ داکەوتن**

**کێل نووشتانەوە...**

**بەم زووانە قاوەی تازیەم لە دەستی مێوانان دەگێڕدرێ...**
**تاتەشۆری مزگەفتی گوندی گەنجینەی منداڵیم تەڕە...**
**بەڕازی تۆ ڕووناکی ئومێد لە کفنمان دەدا...**
**دەڕۆمە نزیک گۆڕستانێك**
**گوێ دەدەمە خشپە و ڕاز و گلەیی ئێسکان...**
**دەبێ کێلی گۆڕێك بە نیشان و هێزی یادەوەریم بزانم)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم ، ل١٥،٢٥،٢٩،٤٨،٥١،٦٠-٦١).**

شاعیر لەڕێگەی بەکارهێنانی ئەو زمانە، کە زمانێکی پڕ لە لاوانەوە و نیگەرانییە دوای لە دەستدانی باوکی ئازیزی، شاعیر هەست بە غوربەتێکی ڕووحی و سووتانی دڵ و دەروونی دەکات، لەیاد و بیرەوەری باوکی، ئەم بەبیرهێنانەوە و چوونە سەر گۆڕی باوکی بووەتە هۆی داهێنانی ئەم دەقە نۆستالژیە، لەبەرئەوەی لەزمانەوە بەرەو هەموو پانتایەکانی ژیان و واقیع دەچێت و هەموو نهێنی و ئاراستە دەروونی و دووربینی و مەعریفیەکان ئاشکرا دەبن، بۆیە دەبینین شیعر ((دەربڕینێکە میکانیزمی گواستنەوەی واقیعی ژیان و بابەت و شت نییە، بەڵکو هەندێ لایەنی شاراوەی مرۆڤیش ئاشکرا دەکات و دەیانخاتە ڕوو))[٢٩١].

(٢٩١) مصطفی الگیلانی، وجود النص الادبی – نص الوجود، مجله الفکر العربی المعاصر، العدد(٥٤ و ٥٥)، ١٩٨٨.

## ٢-٢ ئێستێتیکای ناونیشان لە دەقی نۆستالژیدا

### لەڕووی تیۆرییەوە:

ناونیشان سەرەتایەکی پڕ سەرنجە لەناو دەقدا، واتە ناونیشان دەبێتە هۆکارێك بۆ والآکردنەوەی دەق بەسەر خوێنەر و لێکدانەوەی جیاواز، هەروەها ناونیشان وەك سەری جەستەی مرۆڤ وایە، پێش هەموو شتێك سەیری سەر و شکلی مرۆڤ دەکرێ لە ناسیندا، بۆیە بۆ دەقیش بەر لە چوونە ناو ناوەرۆك و پێکهاتەکانی دەقەکە، خوێنەر لە ناونیشانی دەقەوە دەست پێدەکات، لە شیعری نوێدا ڕووحی دەق ناونیشانە، زۆرجار دەقەکە دەقێکی زۆر باش و سەرکەوتووە، بەلآم ناونیشانەکەی زۆر لاواز و سادەیە، ئەمەش وا دەکات، دەقەکە فەرامۆش بکرێت و نەخوێندرێتەوە، لەلایەکە دیکەوە ناونیشانە، دەبێتە هەلگری کۆمەلێك مانایی دەلالی جیاواز و بەشێکی زۆری نهێنییەکانی دەقەکە دەشارێتەوە، بۆیە ناونیشان لە توێژینەوە و ڕەخنەی نوێدا زۆر بایەخی پێدراوە، لە خوارەوە هەندێ پێناسەی ناونیشان، دەخەینەڕوو.

بەشێوەیەکی گشتی ناونیشان، جا ناونیشانی لێکۆڵینەوە بێت، یان ناونیشانی دەقێکی ئەدەبی، بەپێی شوێنە جوگرافیەکەی

هەمیشـە دەکەوێتـە سـەرەتایی دەق و باسـەکەوە، بەمـەش دەبێتـە جێگای تێڕامانی خوێنەر و ڕاکێشی بۆ ناو دەقەکەی، چێژێکی خۆشی لا دروست دەکات و وای لێدەکات بـە حەسرەتەوە بگاتـە نـاوەرۆکی دەقـە، کەواتـە بـەر لـە هـەموو شـتێك خوێنـەر بـە ناونیشـان ئاشـنا دەبێـت. چـونکە ((یەکـەمین بڕگـە و وشـە و دەسـتەواژە و دێرەکـە دەکەوێتە بەر دیدەی خوێنـەر و هـەر زوو بـەر لـە نـاوەرۆك سـەرنجی خوێنـــەر بـــەلای خۆیـــدا ڕادەکێشـــێ...))[292]، بۆیـــە دەگوترێـــت: ((ناونیشـان تـەنیا دەسـتەواژەیەکی زمانـەوانی دابـڕاو نییـە، بـەڵکو کلیلێکـی ڕاڤـەکاریی بنچینەییە، بـۆ کردنـەوەی لایەنـە داخراوەکـانی دەق))[293].

کەواتە، ناونیشان کلیل و دەست پێکی چوونە ناوەوەی دەقە، بۆ بەسەر کردنەوەی هەموو کون و قـوژبنێکی نـاو دەقەکـە و والاکردنـی دەرگا لەسەر ژووره تاریکەکانی دەقەکە، چونکە ناونیشان بێجگە لـە ئەرکی سەرنج ڕاکێشان و هێنانە ناوەوەی خوێنەر بۆ خودی دەقەکە، خۆشی وەکو بابەت و تەوەر لە دەقی ئەدەبیدا بەرجەستە دەبێت و ڕەنگدەداتەوە، چونکە ناونیشان ڕەگەزێکی گرینگی دەقی ئەدەبییـە و شوناسـی دەقـە و بـە هۆیـەوە نـاوەرۆکی دەق زیـاتر و زووتـر

(٢٩٢) فوئاد ڕەشید(د)، دەقی ئەدەبی (ئەدگار، چێژ، بەها )، چاپخانەی دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٥٤.

(٢٩٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣.

دەناسرێت. کەواتا: ((بەو پێیەش پێکهاتەی ناونیشان نیشانەکانی سیمۆتیکای زمانە، بۆیە دەبێ توێژەر خوێندنەوەی تایبەت بۆ نیشانەکان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان بکات))[٢٩٤]، بەمەش خوێنەر و توێژەر لە ڕێگەی کردنەوەی ئەو ئاماژە و هێما و نیشانانە هەنگاو بەرەو شیکردنەوەو ڕاڤەی دەقەکە دەنێ و لایەنی ئێستێتیکای دەقەکەمان بۆ دەخاتە ڕوو، هەر ئەمەشە دەتوانین بڵێین: ناونیشان و دەق دوو ڕووی یەك دراون، یان دەگوترێت، ((ناونیشان ناسنامەی دەقە))[٢٩٥].

هەڵبژاردنی ناونیشان بۆ دەقی شیعری کارێکی ئاسان و هەرەمەکی نییە، چونکە دەقی نوێ هەڵگری فەلسەفەیەکی قووڵ و سەختی ژیانە، هەروەها شاعیران بەشێوەیەکی ئاگاییەوە، وەك هونەرێکی ئیستاتیکی هەوڵیانداوە، جوانترین و گرینگترین ناونیشان بۆ دەقەکەیان هەڵبژێرێ.

---

(٢٩٤) عوسمان دەشتی(د)، لەبارەی بنیاتی زمان و شێوازی شیعر، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر،٢٠١٢، ل١٧٣.

(٢٩٥) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٣.

## لەڕووی پراکتیکیەوە:

هەوڵدەدەین بەشێك لەو ناونیشانانە بخەینە ڕوو، کەوا هەڵگری مانا و چەمکی نۆستالژیان، ئێستێتیکایەتی هونەری و سۆز و هەستێکی وروژێن بە خوێنەر دەبەخشن و پەیوەندیەکی پتەو و بەهێزیان لەگەڵ دەقدا هەیە.

## ـ ئێستێتیکای ناونیشان لە دەقە نۆستالژییەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

شاعیر بەشێکی زۆری لە دەقەکانی هەڵگری ناونیشانێکی نۆستالژین، لەبەر ئەوەی خۆی لە دوورە وڵاتی و تاراوگەدا زەمەنێکی زۆری بەسەر بردووە، لەلایەکی دیکەشەوە، هەستی نیشتیمانی و نەتەوەخوازی شاعیر هۆکارێکی دیکەی ئەم جۆرە شیعرانەن، کە ناونیشانەکانیان نۆستالژین، ئەمە جگە لەو عەشقە قووڵ و ڕەگ داکوتراوەی ناخی شاعیر، کە خۆی لە خۆیدا بابەت و باسی نۆستالژیان. بۆ نموونە، لە دیوانی (پشت لە نەواو ڕوو لە کڕێوە)دا، کە شیعرەکانی سالآنی (١٩٦٥– ١٩٧٩) تێدا چاپکراوە، چ وەك ناونیشانی ئەم کتێبە شیعریانەی ناوی و چ وەك ناونیشانەکانی تاکە شیعرییەکان واتە ناونیشانە لاوەکییەکان تەژین لە ناونیشانی

نۆستالژی، وەك: (فرمێسك و زام، بتی شکاو، شەونامەی شاعیرێکی تینوو، ١٢وانە بۆ منالآن، شەونییە خەونتان پێوەنەبینم، ) ، هەروەها لە دیوانی (هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا) کە بەرهەمی سالآنی (١٩٨٠ــ ٢٠٠٥) لەخۆ دەگرێ، ئەمەش خۆی لەچەند کتێبێکی شیعری دەبینێتەوە(برووسکە چاندن، بەرەو زەردەپەڕ، پرێسکەی عاشقێکی زگماك، شەڕی برا کوژی)، ئەوانە ئەو بەرهەمانن، کەوا شاعیر بەدرێژایی ئەزموونی شیعری و لەماوەی لەژیانیدا بلآویکردووەتەوە، دەبینین ناونیشانەکان نەك تەنیا هەندێکیان، بەڵکو سەرجەمیان هەڵگری ناوەخنی نۆستالۆژین، بەلآم بەڕێژەی جیاواز، ئەگەرچی ئێمە تەنیا باس لەو ناونیشانانە دەکەین، کە لەناو ئەم بەرهەمانەدا سەد لە سەد هەڵگری مانا و دەلالەتی نۆستالژین.

وەك: (ژوانی شەوانی کەندالێ، ئەوپەڕی تاسە، نەورۆزی (١٩٦٩)، ئالآ، زستانی پار، کوردستان، نامۆیی، تۆش بەجێم دێڵی، تەنیایی، بۆ قەرەجێك، نەستەلژی، حەسرەت، مردن، گەنجی و پیری،......تاد).

((حەسرەت )):

شاعیر لە شیعری ((حەسرەت))دا، ئەگەر سەیری ئەو ناونیشانەی، بکەین دەبینین خودی وشەکە بەر لەوەی، وەك ناونیشان بخرێتەڕوو، ببێتە سەردێر و تایتڵی دەق، واتای (خەم و

خۆزگـە و لەدەستچـوون) دەدات، لـەناو ئـەم دەقەشـدا، کـە بـەناوی (حەسـرەت)ە، شـاعیر بـە شـێوەیەکی ئیسـتاتیکی توانیویـەتی بەستنەوەیەك لـەنێوان ناونیشـان و دەقـەکان بکـات و پەیوەندیـەکی قـووڵ لـە نێوانیانـدا دروسـت بکـات، چـونکە مانـای (دەلالی) وشـەی (حەسـرەت) وەك (دال)، هـەڵگری چـەمکی نۆسـتالژیایە، کـە بـە ماناکـانی (خـەم و داخ، حەسـرەتی لـە دەستچـوو، خۆزگـەی ئاواتخواستن)، ئەوەتا دەگوترێت: ((ناونیشان بـە نـاوەرۆك و بابـەتی دەقەکەوە پەیوەستە و گوزارشتی لێ دەکات، هـەر بۆیـەش پێویسـتە گوزارشـت لـە زۆربـەی واتـا و دەلالەتـەکانی دەقەکـە بکـات))[٢٩٣] ، ئەوەتا شاعیر دەڵێ:

**(حەسرەت)**

**((سەد مخابن !**

**ئەو ئازیزانەی ڕۆژگارێك**

**بژوێنی حەسانەوەم بوون،**

**ئەوانەی شەکرە مێوانی**

**دڵی هەردەم کراوەم بوون،**

**هەنووکانە**

**یا نەماون لە یادمدا،**

(٢٩٣) عەبدوڵڵا ڕەحمان، بیاتی گێڕانەوە(لێکۆڵینەوەی ئەدەبی)، چاپی یەکەم، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٤، ل١٢٧.

**یا ماوێکی کاڵ و ماتن**

**کەچی... ئیستاش**

**هەر چاوەڕێی ئەو ئاسکانەم**

**کە بەڵێنیان دا و نەهاتن!)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٧٨-٧٩).**

خوێنەر هەر بە بینینی ئەم ناونیشانە تێ دەگات، کە شاعیر حەسرەت و داخ بۆ کۆمەڵێك شت هەیە دەخوات، چ ئەوانە لە دەستچوون و، چ ئەوانەی خەونیان پێوە دەبینێ و پێیان ناگات، حەسرەت لە دێرەکانی (ئەو ئازیزانەی ڕۆژگارێك و هەر چاوەڕێی ئەو ئاسکانەم کە بەڵێنیان دا و نەهاتن) زۆر بە هێزە و ئاشکرا و دیارە. واتە:

**حەسرەت ← ئازیزانی ڕۆژگارێك..**

**حەسرەت ← چاوەڕوانی و ئومێدی هاتن..**

**(لەبیرت ناکەم) :**

ئەمە ناونیشانی دەقێکی دیکەی شاعیرە، لەگەڵ بینینی ناونیشانەکە هەست دەکەین شاعیر دەیەوێ چەند شتێکی خۆش و دڵگیری یارەکەی بە بیرە خۆی بهێنێتەوە و لە بیریان نەکات، چونکە خودی وشەکە (لەبیرت ناکەم) هەستێکی نۆستالژی قووڵی لە دواوەیە، لەبەر ئەوەی بە مانا و دەلالەتی ڕابردوو دێت، واتە ئەو

شتانەی شاعیر ناوی ناون (لەبیرت ناکەم) ڕوویانداوە، خۆ ئەگەر ڕوویان نەدابێ، شاعیر چۆن دەتوانێ (لە بیرت ناکەم)، بکاتە سەر دێر و ناونیشانی دەق، واتە، لەبیرت ناکەم: "یار و ژوان ← گەڕانەوە بۆ ڕابردوو ← دووری ئاوارەی و زێد ← خەم و ژانی یاد"

**لەبیرت ناکەم**

**((ساچۆن دەبێ لەبیرت کەم؟**

**چۆن بۆم دەکرێ دڵگیرت کەم؟**

**هێشتا کوڵمی خوێنتێزاوت،**

**ئاخافتنی گۆشەی چاوت،**

**وەك تارمایی لەبەر چاون**

**نەخشەی سەر دڵی داماون..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە، ل ١٧–١٨).**

کاتێ ئەم ناونیشانەت بەرچاو دەکەوێت خەیاڵت بۆ کۆمەڵێك شتی تایبەت و جوان و خەم و ژان و شادی خۆشی دەچێت، کە مرۆڤ ناتوانێ لەبیریان بکات، لە زەمەنێك لە زەمەنەکانی ژیاندا، دوای دوورکەوتنەوە لێیان. ئەگەر لەسەر ئاستی قووڵی دەقەکەوە، سەیری ناونیشانەکە بکەین، دەبینین پەیوەندیەکی هارمۆنی لە نێوان ناونیشان و دەقدا هەیە، چ لە ڕووی سیمۆلۆژیەوە بێ، چ لە ڕووی سیمۆتیکاوە بێت، بەمەش ئێستێتیکایەکی هونەری بە دەقەکە،بەخشیوە.

## ـ ئێستێتیکای ناونیشان لە دەقە نۆستالژییەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

"ئەنوەر قادر محەمەد" خاوەن کۆمەڵێك دەقی جوانی پڕ لە نۆستالژییە، هەر لە خوێندنەوەی ناونیشانەکاندا هەست بە خەم و ناخۆشی و ئازارەکانی ناخی شاعیر دەکەی، هەروەك ناونیشانی دیوانەکەی، کە هەر سێ کتێبی شیعری شاعیری لە خۆگرتووە، بە ناوی (زریان و زایەڵە و زنار)، دەبینین ئەم ناونیشانە ناونیشانێکی بالاً لەسەر بەرگی کتێبەکە نووسراوە، خودی ناونیشانەکە لەڕووی سیمۆلۆژیاوە ناونیشانێکی لێوان لێو لە نۆستالژییە، ئەمەش ئێستێتیکایەکی پڕ لە پرسیار و گەڕان بە دوای دۆزینەوەی وەڵامەکان دەخاتە ڕوو، بەڵام جگە لەمەش چەندین ناونیشانی، دیکەی سەر شیعرەکان هەڵگری ئەم جۆرە نۆستالژیایەن، بۆ نموونە: (پشکۆکانی ناخم، وەرزی سەرهەڵدانی فەرهاد، خاك و زریان و خۆشەویستی، پرسی، کاك، یاد، سلێمانی، غەریبی، زەنگەڵەی یاد، هۆ غەریب، تەنیایی و.....تاد).

**((غەریبی)):**

ناونیشانی (غەریبی) ئەوە ناونیشانی شیعرێکی "ئەنوەر قادر محەمەد"ە، ئەم ناونیشانە هەست و سۆزی خوێنەر دەخرۆشێنێ و

خەیاڵی بۆ (غەریبی و دووری و تەنیایی و بێ وڵاتی) دەبات، چونکە کاتێ بۆ ناوەوەی دەق دەچین، هەست بە ئێستێتیکای ناونیشان دەکەین، لەگەڵ ئەو پەیوەندییەی دەق بە ناونیشانەکە، کە یەکە یەکەی وشەکان و گرێ و تەنانەت پیتەکانیش تێکەڵ بە ناونیشان بووینە، ئەوەتا: غەریبی ← شوێن ← بێ وڵاتی ← تاراوگە ← غەریبی رووح. شاعیر لەم دەقە شیعرەدا بە دوای شوناسێکی رووحیدا دەگەڕێت و کوچە بە کوچەی سلێمانی هەست و سۆز و ئەندێشەی شاعیریان بە دەنگ هێناوە، لە یەك بەرگدا بە ناوی "غەریبی".

((مەولانا بەو گەورەییە

ڕۆژێ دوو دوو

تەنەکە ئاوی بەسەر شان،

بۆ تەکیەکەی شێخی "دەهلەوی"دەهێنا،

لەڕێ لایدا، تۆزێ دانیشت، نەختێ ڕاما،

هۆن...هۆن فرمێسك بەسەر ڕوویدا قەتارەی بەست،...

هەر کە بینیم، سلێمانیم کووچە کووچە هاتە پێش چاو،

یەکسەر ئاگرم تێبەربوو، دڵم پڕ بوو،

ببورە لێم! خۆت دەزانی قوربان سۆز و

قوربان! کەڵکەڵەی نیشتیمان..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل٩٨).

ئێستاکە دەبینین "غەریبی" چۆن، وەك ناونیشانێك باڵی بەسەر تەواو دێرە شیعرەکاندا کێشاوە، بۆیە شاعیر لە هەڵبژاردنی ئەم ناونیشانە زۆر سەرکەووتوو بووە، لەهەمان کاتیش دەقەکەی هێندەی دیکە جوان و پڕ سۆز و هەست کردووە. لەبەر ئەوەی ناونیشان هەڵگری کەسایەتی و جەوهەری ئەو بابەت و دەقەیە، کە بۆی دادەندرێت و سیما و خەسڵەت و لایەنەکانی تێدا ڕەنگدەداتەوە و گوزارشت لە ناخ و دڵ و دەروونی خودی شاعیر دەکات.

**((یادت)):**

ناونیشانی (یادت) ناونیشانێکی دیکەی شیعرێکی "ئەنوەر قادر محەمەد"ە، خوێنەر بە خوێندنەوەی ئەو ناونیشانە تێدەگات، کەوا شاعیر گەڕاوەتەوە بۆ کۆمەڵێك بیرەوەری و یادی ژوان و ئازیزان، چونکە خودی وشەکە (یادت) واتە (ڕابردوو) شتی بەسەر چوو، کە ئەمەش بابەتی سەرەکی نۆستالژیایە، بۆیە ناونیشانی (یادت) تەواو دابەشی سەر دەقەکە کراوەو سەد لە سەد بۆ ئەم ناوەرۆکەی دەقەکە گونجاوە، تەنانەت هەستێکی دەروونی بەو دەقە بەخشیووە، بۆیە لەم بارەیەوە، **"لۆسیە گۆڵدمان"** دەڵێ: ((ناونیشان سورەیای دەقە و ڕێگا پێچ و پەناکانی دەق ڕووناك دەکاتەوە))[٢٩٧] (یاد) لێرەدا مانا دەلالەیەکانی، وەك: یادی ڕۆژ و ساڵ و شەو و ڕۆژ و

(٢٩٧) ئارام سدیق، ناونیشان لە چیرۆکی کوردیدا، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ١٤٩.

هاوین و زستان و هەموو ئەوانەی پەیوەستە بە ژوان و یادی دڵداری دەگرێتەوە. هەروەك لە شیعرەکەدا، دیارە و شاعیر دەڵێ:

((یادت))

((ئێوارانی شەممان،

بۆ سینەما، یان کۆنسێرتی، یان پییەسێ دەچووین،

دەمویست لە پێش تۆدا بکەم،

کەچی لەوێ چاوەڕێم بووی،

چاوی شینت دوور دەیڕوانی،

قژی زەردت بەسەر بەیانی مەم و سینەتا

پەخش بوو بوو..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل١٨٧).

## - ئێستێتیکای ناونیشان لە دەقە نۆستالژییەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

"سەباح ڕەنجدەر"یش، گرینگی زۆری بەناونیشان دەدات، تەنانەت وەکو پرۆژەیەکی نووسینیش سەیری کردووە، لە هەردوو شاعیرانی پێشوو "عەبدوڵلا پەشێو، ئەنوەر قادر محەمەد"دا، زیاتر هەوڵی بەکارهێنانی پێکهاتەی نوێی داوە، بۆ ئەوەی شیعرەکانی زیاتر هونەری بن، (ڕەنجدەر)، خۆی هەستی بە گرینگی و ترسی ناونیشان کردووە بۆ جەستەی دەق، بۆیە لەم بارەیەوە دەڵێ: ((ناونیشان رووناکییەکی تیژ تێپەرە بۆ رۆشنکردنەوەی پانتایی و بنیاد و جووڵەکانی ناوەرۆك و ناساندنی دەق، چونکە بە هۆی ناونیشانەوە نووسین و بینینی نووسەر پێشکێش دەکرێت، واتە کرۆکی دەق دێتە بەر بیر و خەیاڵی خوێنەر))[٢٩٨]. شاعیر لە بەشێکی زۆری ناوی کتێبە شیعرییەکانی، ناونیشانی نۆستالژیان و ئێستێتیکایەکی زۆر بەرزی هونەریان تێدایە، دووجار شاعیر هەموو بەرهەم و شیعرەکانی لە دوو توێی کتێبێکدا کۆکردووەتەوە، بەناوی (سی ساڵ شیعر)، کە دوو بەرگ لە خۆ دەگرێ، ئەگەر سەیری ئەو ناونیشانە بکەین، وەکو ناونیشانێکی باڵا بۆ تەواوی کتێبەکە،

(٢٩٨) سەباح ڕەنجدەر، دوو کتێب لەبارەی شیعرەوە، دەزگای توێژینەوە و بڵاو کردنەوەی موکریان، هەولێر، ٢٠١١، ل ٢٩.

هەڵگری مانـا و دەلالـەتی نۆسـتالژیە، چـونکە سـی سـاڵی تەمـەن لـە ئەزموونی شیعر، سی ساڵی تەمەن لە شەونخوونی و فرمێسك ڕەشتن و حەسرەتخواستن لەناو ئـەم کتێبـەدا بـوونی هەیـە، ڕستەکە، (سـی ساڵ شیعر) دەلالەتی ئەزموونی ڕابردوو، تا چاپکردنی ئەم دوو بەرگە دەدات، هـەروەها ناونیشـانەکانی نـاو ئـەم دوو بەرگـە و ناونیشـانی خودی شیعرەکانیش بەشێکی بەرچاویان هەڵگری دەقی نۆستالۆژین، وەك (زێـوان، قۆناخـەکان، پێکهاتـە، وەرزەکـان، سـرووش، سـەد و یەکشـەوە، تکـا، یاداشـت، گـۆزە، گریـان، حەسـرەت، شـوێن، لـە کتێبخانەی تایبەتی بابا تاهیردا،... تاد).

**((زێوان)):**

ئەمـە ناونیشـانی یەکـەم بەرهـەمی شـاعیرە و ناونیشـانی کتێبـی یەکـەمی شاعیریشـە، (زێـوان) ناونیشـانێکی گشـتییە بـۆ هـەموو دێرەکـانی شـیعرەکە، خـۆی لـە(٨١) لاپـەڕە دەبینێتـەوە، خـودی ناونیشانەکە بە مانا و دەلالەتی نۆستالژیا دێت، چونکە (زێـوان)، کـە دەربڕی تەواوی پێکهاتەی دەقەکە لەخۆ دەگرێت، کە باسـی شـوێنی زێـدی شـاعیر و شـاعیر تەمـەنی منـداڵی و یـاری و بیرەوەرییـەکانی سـەرەتایی ژیـانی لـەم گونـدە، کـە(دەربەنـدی گـۆم)ە، لـە هـەمووی گرینگتر گۆڕی باوکیەتی لەم گوندە، کە پەیوەندیەکی ڕووحـی لـەلای شاعیر دروستکردووە، چونکە هەڵبژاردنی ئـەو ناونیشـانە پـەیوەسـتە

بـە دڵ و دەروونــی خــودی شــاعیرەوە، واتــە ڕەنگدانــەوەی ژیــانی شــــاعیرە لــــە منــــداڵی و گەنجییەتیــــەوە بەســــەرجەم خۆشــــی و ناخۆشیەکانەوە، کەواتە ئەو ناونیشـانە دابەشـی سـەر تـەواوی دێـرە شـیعرەکان بـووە، پەیوەندیـەکی پتـەو کـۆنکریتی لـە نێـوان دەق و ناونیشـانەکەدا بـوونی هەیـە، کەواتـە ئـەم ناونیشـانە ناونیشـانێکی سەرکەوتوو و گونجاوە، بۆ ناوەرۆکی دەقەکە، چونکە شاعیر باس لە هـەموو ئـەو ڕووداو و بەسـەرهات و کاولکارییانـەی کـردووە، کـە لـە سـەردەمی منـداڵی لـەم ڕوویانـداوە، (زێـوان)، هـەڵگری ماناگـەلێکی شـاراوەییە و هەسـت و سـۆزێکی قـووڵ و ڕەگ داکوتـاوی بـەناخی شاعیرەوە هەیە، لە ڕێگەی ئەو ناونیشانەوە هەست بـە خـەم و ژان و ئێش و ئازاری شاعیر لە دوورکەوتنـەوە لـە زێـد و یـادەوەری منـداڵی دەکەین. شاعیر دەڵێ:

**((زێوان))**

**((گوندی گەنجینەی منداڵیم بۆ من هەموو شتێکە**

**نان و**

**شەراب و**

**ئومێد و**

**خەون و**

**بنەماڵە و**

**خانەدانی..**

**ئەم دنیایە**

**سێ بەشی ئاوە**

**بەشێکی زەوی**

**منیش سێ بەشم گوندی گەنجینەی منداڵی**

**بەشەکەی دیکە حەکایەتی پاڵەوانەکانی دەم ئاگردانی داپیرە..))**

**(سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل ١٢،٢٨).**

ئێستێتیکای ناونیشان لەم دەقەدا، واتە زێوان ← خەونی منداڵی ← ژیان ← مردن ← نان ← بنەماڵە ← گۆڕ ← شکۆ ← زێد ← ئەفسانە و حەکایەتەکانی داپیرە ← ئەزموونی ژیان.

"سەباح ڕەنجدەر"ی شاعیر لە ((سۆنگەی هەست پێکردنی ئەم گرینگییەی، ناونیشان و مەبەستی جێ کردنی ئەم پەیوەندییە مەعریفی و ئیستاتیکییە، ئامادەبوونی ناونیشانی لە ڕووی چۆنیەتی و چەندایەتییەوە زاڵکردووە بەسەر بەرهەمەکانی دا))[٢٩٩].

شاعیر لە کتێبی (شەڕی چڵ ساڵە)دا، جگە لە ناونیشانی سەرەکی کە مانابیەکی قووڵ و پڕ لە پەردەی شاراوەی هەیە هەر شیعرێکیش ناونیشانێکی لاوەکی لەخۆگرتووە، واتە"سەباح ڕەنجدەر"شاعیرێکی داهێنەرە لەم بوارەدا، چونکە ناونیشانی لەناو

(٢٩٩) فوئاد ڕەشید(د)، دەقی ئەدەبی (ئەدگار، چێژ، بەها )، چاپخانەی دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٥٩.

ناونیشاندا داهێناوە، واتە دوو ناونیشان، یان زیاتر لەسەر یەك دەق و لەناو یەك پێکهاتەدا بوونی هەیە، لەهەمان کاتیشدا بەشێوەیەکی وا هونەری و ئێستێتیکی داڕشتووە، کە خوێنەر دەتوانێ لە ژێرەوە بۆ سەرەوە، واتە لە ناونیشانی لاوەکییەوە بۆ ناونیشانی سەرەکی بچێت بەبێ ئەوەی مانای دەقەکە بشێوێ، بەمەش شاعیر توانیوویەتی پەیوەندیەکی هارمۆنی و کۆنکریتی لە نێوان دەقەکە و ناونیشانی دەقەکەدا بکات، بۆ نموونە: لە شیعری (قۆناخەکان)دا، ئەمە بەرچاو دەکەوێ.

شاعیر دەڵێ:







**شانازی و ڕوخسار پاراویی دایک**

**دوای منداڵ خستنە سەر سەبەتە**

**باوك لەشكۆی گۆرانی بەرەبەیانیدا..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەكەم، ل ٤٨٠،٤٨٢،٤٨٤ ).**

بۆیە دەگوترێت: ((ناونیشان بنیادی خۆی هەیە و تۆڕی پەیوەندییە ئاڵ و گۆڕییەكانی نێوان ناونیشان و دەقە، لەتەك وەزیفەی جیاوازی هەریەكەشیاندا واتا و دەلالەتی واتاكان دەردەخات، دەبێتە هۆی دەرخستنی ئاستەكانی سیمانتیك لەناو دەقدا))[٣٠٠]، بە نزیك بوونەوەمان لە ناوەرۆكی دەقەكە و لایەنە ئاشكراو شاراوەكانی دەق وردە وردە ئاوێتە بوونی ناونیشان و دەقەكە ڕوونتر دەبێتەوە، بۆیە ناونیشان و دەق، هەمیشە تەواوكەری یەكترین بۆ پەردەلان لەسەر دەلالەتەكان و كردنەوەی هێما و ئاماشەكان.

(٣٠٠) نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، شیعرییەتی دەق و هەنگوینی خوێندنەوە، ل١٠.

## ٢- ٣ وێنەی شیعری لە دەقی نۆستالژیدا

### لە ڕووی تیۆرییەوە:

وێنـەی شـیعری یەکێکـە لـە ڕەگـەزە دیـار و گرینگـەکانی دەقـی شیعری و پێکهاتەیەکی سەرەکی دەقی شیعرییە، بە جۆرێـك زۆرجـار لـە ڕێگـەی کـۆ دەلالەتـەکانی وێنـەوە، دەتوانـدرێت شـتە شـاراوە و داهێنانەکانی شیعرەکە بخەینەڕوو، وێنەی شـیعری گرینگـی تایبـەتی هەیە، لەلای شاعیران و توێژەر و ڕەخنەگرانی ئەدەبیەوە.

شاعیران هەمیشە هەوڵیان داوە، لە ڕێگـەی وێنـە شـعرییەکانەوە، هەست و نەستی دڵ و دەروونی خۆیان بکەن بە تابلۆیەکی شیعری پڕ لە وێنەی هونەری و ئێستێتیکی جوان، چونکە زۆربەی کات شـاعیران لە ڕێگەی وێنەی شیعرییەوە، توانا شیعرییەکانی خۆیان دەخەنەڕوو، ئەمە بەو پێیەی وێنەکان تەنیا وێنەی جیهـانی دەرەوەی شـاعیرنین، بـەڵکو هـەڵگری چـەمکی جیهـانی هەسـتی و نەسـتی و عەقڵگـەرایی شاعیرەکەنە و کراون بـە وێنـەی جـوانی هونـەری و شـیعرییەتیان بـە دەقەکە بە خشیووە.

"جابر عصفور"، دەڵێ: ((وێنەی ئەدەبی کرۆکی هەمیشەی شیعرە ))[٣٠١]، ڕۆڵ و ئەرکی وێنەی شیعری تەنیا ئیشی جوانی ڕازاندنەوەی دەقەکە نییە، بەڵکو پێکهاتەیەکی گرینگ و پێویستە، داهێنان و نەمریی دەقە شیعریەکە، بۆیە دەگووترێ: ((وێنەی شیعری شتێك نییە، بۆ جوانی بێت))[٣٠٢]، کەواتە وێنەی شیعری شاعیر تەنیا بۆ یەك مەبەست کاری لەسەر ناکات، بەڵکو دەیەوێت ئەم وێنەیە، ببێتە هەڵگری ئاوێنەی ناخ و هەموو لایەنەکانی سیمۆلۆژیا و سۆسۆلۆژیا، لە خۆی بگرێت.

"ئەزرا پاوەند Ezra Pound"، لەم بارەیەوە، دەڵێ: ((وێنەی شیعری نواندنێکی وێنەییە، یان پێکهاتەیەکی ژیری و سۆزییە))[٣٠٣]. وێنەی شیعری بە یەکێك لە و چەمکانە دادەندرێت، کە پێناسەکردنی کارێکی ئاسان نییە، بەتایبەتی، کە هەندێ جار هونەرەکانی ڕەوانبێژی، وەکو جۆرە وێنەیەکی شیعری دێتە بەرچاو، بەمەش سنوورێك لە نێوان ئەوان و وێنەی شیعریدا نامێنێت و ئاوێتەی یەکتر دەبن. بۆیە وێنەی شیعری هەڵگری چەندین پێناسەی جیاواز و تەنانەت دژ بەیەکیش لەخۆ دەگرێت. ئەوەش وای کردووە، لە

(٣٠١) جابر عصفور(د)،الصوره الفنیه فی الثراث النقدی والبلاغی عند العرب، طبع ٣، مرکز الثقافی فی العربی، بیروت، ١٩٩٢، ص ٧٠.

(٣٠٢) عەبدولقادر محەمەد ئەمین، وێنەی شیعری لە ڕێبازی ڕۆمانسیی کوریدا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢، ل١٣.

(٣٠٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦.

ئــەدەبی نــویٚ و هاوچــەرخدا وێنــە بایــەخێکی زۆری پــیٚ بــدرێت و داهێنانی هونەری و تازەی لیٚ بێتە بەرهەم.

"د.کــەمال مــەعرووف" لــەم بارەیــەوە، دەنووســێت: ((وێنــە شوێنێکی بنچینەیی لە بنیادی شیعریدا داگیرکـردووە، ئامرازێکـە لـە ئامرازەکان لە شیعری نوێدا))[٣٠٤]. وێنـەی شـیعری هێزێکـی دیکـە و تازە بە زمان دەبەخشێت و لە هونەرە وێنەییەکان نزیکی دەکاتـەوە، بەتایبەتی نوێخواز بۆ گەیاندن و بەرجەستەکردنی زمانێکی هونەری و فـەنتازی پـەنایان بـۆ وێنـە شـیعرییەکان بـردووە و لـەوێوە زمـانێکی دیکـەیان لەناوزمانـدا، لـە ڕێگـەی ئـەم وێنانـەوە، داهێنـاوە. لەبـەر ئەمەشە، کە "ئەزرا پاوەند Ezra Pound"، دەنووسێت: ((ئەگـەر بـە درێـژایی ژیـانی خـۆت، وێنەیـەکی شـیعری پێشـکێش بکـەن زۆر چاکترە، لـەوەی، کـە چـەند کتێبێـك بنووسـیت))[٣٠٥]. هـەر ئەمەشـە وایکردووە، لـە شـیعری نـویٚ و هاوچـەرخدا، چـەندین وێنـەی تـازە و داهێنانی نویٚ، لەلایەن شاعیرانی نویٚ و هاوچەرخەوە ئەنجامبدرێت.

بەشێوەیەکی گشتی وێنەی شیعری چـەندین جـۆری هەیـە، بـەلاٚم ئەوەی ئێمە لێرەدا، باسی دەکەین، وێنەی ڕەوانبێژییە، واتە ئـەوەی

(٣٠٤) کەمال مەعرووف(د)، ڕەخنەی نوێی کوردی، بەڕێوەبەرایـەتی چـاپ و بلاٚوکـراوەی سـلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٣٥ .

(٣٠٥) نەوزاد عەبدوڵلا حەسەن، وێنیٚ هۆزانیٚ دهھۆزانێن قوچـانی دا، گۆڤـاری (پـەیڤ)، ژمـارە(٧)، دهۆك، بهارا ١٩٩٨، ل٤٥.

لە ڕەوانبێژیدا سەرچاوەکان زۆر گرینگیان پێداوە و بە بناخەیەکی سەرەکی دەزانن و ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینن لە پێکهێنانی وێنەی شیعریدا، کە وێنەی (لێکچوواندن و خواستن)ە، بۆیە ئێمەش تەنیا باسی (وێنەی لێکچوواندن و وێنەی خواستن)، دەکەین.

## یەکەم: وێنەی لێکچوواندن:

وێنەی شیعری لێکچوواندن، ئەگەر لە سادەترین پێناسەی دەست پێ بکەین بریتییە: ((لە چوواندنی شتێك بە شتێکی دیکەوە لەبەر هەبوونی خەسڵەتێك، یان زیاتر لە خەسڵەتێکی هاوبەش بێ بەکارهێنانی ئەوزار و ڕووی لێکچوون، هەشیانە بەسوود وەرگرتن لە ئەوزار و ڕووی لێکچوون، جا لە هەردووکیان، یان لە یەکیان))[٣٠٦].

دەشێ لێکچوواندنەکە، لێکچوواندنی هەستی و هەستی، یان هەستی و ئەقڵی، یان ئەقڵی و هەستی، یان ئەقڵی و ئەقڵی بێ، لە ئەقڵی و هەستی ئەوەیە، کاتێ شاعیر ڕووی یارەکەی دەچووێنێ بە ئەستێرە و مانگ و خۆر، ئەوا لێکچوواندنەکە هەستی و هەستییە، چونکە ڕووی یار و ئەستێرە و مانگ و خۆریش هەستینە، بەڵام کاتێ خۆشەویستەکەی دەچووێنێ بە کانیاوی سۆز، ئەوا لێکچوواندنەکە ئەقڵی و ئەقڵیە، چونکە نە (خۆشەویستی) و نە (کانیاوی سۆز) بەر

(٣٠٦) ئیدریس عەبدوڵڵا(د)، کۆ وانەکانی ڕەوانبێژی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٣، ل١٤٦.

هەستەکان ناکەون و ئەقڵینە، لەبەر ئەوە زانایان، دەڵێن: ((لێکچوون بۆ خۆی ڕەگەزێکی بنەڕەتییە و جوانی بە دەق دەبەخشێ و زیاتر لە تێگەیشتن نزیکی دەکاتەوە، هەروەها ڕەگەزێکی پێویستە، بۆ پێشکێشکردنی مەبەست، چونکە لە لێکچوواندندا، نواندنی وێنەکە و سەلماندنی بیرۆکەکان و وەڵامدانەوەی پێویستییەکانی دەروونی هەیە))[٣٠٧].

کەواتە: شاعیران بە پێویستیەکی گرینگ و تەنانەت، وەك ئەرکێکی شیعری سەیریان کردووە، شاعیران بەردەوام بەهۆی وێنەی لێکچوواندنەوە، کۆمەڵێك شتیان بە یەکتر چوواندووە، چ بۆ لایەنی جوانی بێ، چ بۆ ناشیرین پێشاندانی ئەو شتانەی خودی شاعیرەکە، مەبەستیان بووە.

(٣٠٧) محمد حسين على صغير(د)، أصول البيان العربي، دار الشؤن الثقافية، بغداد، ١٩٨٦، ص٦٥.

## "وێنەی شیعری لێکچوواندن و وێنەی شیعری خواستن"، له شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو، ئەنوەر قادر محەمەد، سەباح ڕەنجدەر"دا.

### لەڕووی پراکتیکییەوە:

**یەکەم: وێنەی لێکچوواندن:**

**ـ وێنەی لێکچوواندن لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا**

ئەم جۆرە وێنەیە، لەلای شاعیر پانتایەکی فراوانی داگیرکردووە، بە تایبەتی بۆ گەیاندنی مەسەلە سیاسی و دڵداریەکانی، پەشێو پەنای بۆ وێنەی لێکچوواندن بردووە.

بۆ نموونە، شاعیر دەڵێ:

**((منداڵ و شێت ڕاستگۆن... منیش**

**منداڵێکی سەرسیپم و**

**سەر شێتێکی لاساری کورد..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل٤٤٢).**

**مـــن ← لێچووە.**

**منداڵێکی سەر سپی ← لەوچووە.**

"پەشێو" لەرێگەی بەکارهێنانی قسەیەکی باوە ناو کۆمەڵگەی کوردییەوە، کە دەڵێت: ((قسەی ڕاست، یان لەشێت دەزاندرێ، یان لە منداڵ))، توانیوویەتی ئەم وێنە جوانەی لێکچوواندنمان، بۆ بەرهەم بهێنێ. شاعیر بۆیە دەگەڕێتەوە بۆ منداڵی و شێت، چونکە نە منداڵ و نەشێتیش، هیچ یاسایی قەدەغە و کاردانەوەیەکی یاسایان لەگەڵدا ناکرێ. هەروەها له دەقێکی دیکەدا، شاعیر دەنووسێت:

**((کورد: مریشکە ڕەشەیەکە**

**بە تۆپیش ناجوڵێتەوە**

**نازانم ماوە یا مردووە**

**دەیان ساڵە**

**لەسەر لوغمی ئۆتۆنۆمی کڕکەوتووە!)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل ٢٦٢).**

شاعیر خەسڵەتی مریشکی بە سەرکردایەتی کورد بە خشیووە، کە بێ دەنگی و ڕازی بوونە، کڕکەوتن لەسەر ئەو مافە سەرەتاییانەی بە کورد دراوە، لەوەشدا:

**کورد ← لێچووە.**

**مریشك ← لەوچووە.**

**ڕازی بوون و کڕکەوتن و بێ دەنگی و قبوولکردن ← ڕووی لێکچوواندنە.**

"پەشێو" وێنەکانیشی لەوشە نۆستالژیەکان داهێناوە، ئەوەتا گەڕاوەتەوە بۆ ژیانی سادەی گوندی و دانانەوەی هێلکە لەبن مریشک، ئەوەپیشەی گوند نشینەکانە، بەمەش وێنەیەکی لێکچوواندنی پێ بەرهەم هێناوە و مەبەستێکی سیاسی پێ بەخشیووە.

## - وێنەی لێکچوواندن لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد"دا

شاعیر، بەسوود وەرگرتن لە تاراوگە و دووری لە زێد و دڵدارەکەی و چەوسانەوەی نەتەوەکەی، توانیوویەتی چەندین وێنەی هونەری جوان لەناو دەقەکانیدا، بەرجەستە بکات، بە تایبەتی وێنەی لێکچوواندن. شاعیر لە شیعری "پشکۆکانی ناخم"دا، وێنەیەکی لێچوواندنی بە شێوەیەکی ئێستێتیکی و هونەری داهێناوە و ڕووحێکی زیندووی بە بەرداکردووە، کاتێك، دەڵێ:

**((خۆشەویستی پەیامی سپیی عیسایە**

**تەنانەت دڵی خاچەکان ئەگرێنێ..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل٥).**

شاعیر لەرێگەی گەڕانەوە، بۆ نۆستالژیای گشتی، کە سەردەمێکی مێژووی کۆن و کەسایەتییەکی ئایینی، وەك حەزرەتی "عیسا"یە، "دروودی خوای لەسەر"، توانیوویەتی وێنەیەکی لێکچوواندن دروست بکات، چونکە لای شاعیر خۆشەویستی هەڵگری پەیامێکی پاك و بێ گەردە، لە وەشدا لەپەیامی سپی و پاکی حەزرەتی عیسا نزیك دەبێتەوە، وێنەیەکی جیهانبینی شاعیرە، چونکە ((زۆرجار شاعیران وێنەی نوێ لەو دەقانەوە سازدەکەن، کە پەیوەندی بە ئەزموونی

تایبــەتی خۆیــەوە هەیــە))[٣٠٨]، لــەو ڕوانگەیــەوە ســەیری دەقــە ئایینیەکە، دەکات و لە باری تایبەتی خۆی دەیگوازێتەوە، بۆ چـەمك و مانـا و بـارێکی دیکـە، بەمـەش وێنەیـەکی لێکچـوواندنی لێ دروسـت دەکات، کەسایەتیە ئایینیەکان و پێغەمبەر و پیاو چـاکان و.....تـاد، شاعیران هەمیشە، وەك ڕەمزێك بەکاریان هێناوە، بەڵام بـۆ مەبەسـتە ئایینییەکـەی نـا، بـەڵکو بـۆ مەبەسـتی تایبـەتی خۆیـان و بەخشـینی شیعرییەت بە دەقەکانیان و گەیاندنی پەیامی شیعریان. لەوەشدا:

**خۆشەویستی ← لێچووە.**

**عیسا ← لەوچووە.**

**پاکی و بێ گەردی و ئاشتی و ئارامی ← ڕووی لێکچوواندنە.**

هەروەها لەم دەقی خوارەوەشدا، شاعیر دەڵێ:

**((یادت چراوگی شەوە زەنگێکە**

**ئاگری دووری شەوانی کەژە،**

**تین و تاوی دەدا بەڕووحی..)) (ئـەنوەر قـادر محەمـەد، زریـان و زایەڵە و زنار، ل١٨٧).**

(٣٠٨) هاوژین سلێوە عیسا، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری "شـێرکۆ بێکـەس"دا، چـاپی یەکـەم، چاپخانەی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل٢٩٦.

ئەم وێنەیە وێنەیەکی نۆستالژییە، چونکە شاعیر بە یادکردنەوەی ئازیزان و شوێنە کۆنەکانی ژیانی هەست بە ناخۆشی و نیگەرانی دەکات و وێنەیەکی تراژیدی بە دەروونێکی نیگەران و ئێش و ئازار دەکێشێ، بەمەش وێنەیەکی شیعری لێکچوواندنی بەرهەم هێناوە، لێرەوە هەست بە ڕۆڵی دیار و گرینگی نۆستالژیا دەکەین لە دروستکردن و داهێنانی ئەم جۆرە وێنەیە، بەم پێیە لەم دەقەدا وێنە شیعرییەکە دەربڕین لە ناخی شاعیر دەکات و بریتییە لەو دیمەنەی، کە شاعیر کاردانەوەیەکی سایکۆلۆژی لە بەرانبەری هەبووە و لە ڕێگەی زمانەوە بەر جەستەی کردووە. "عەبدولڕەحمان مزوری" لەبارەی وێنەی شیعریەوە، دەنووسێت: ((وێنەی هونەری گەوهەری شیعرە و قووڵایی و پاکیی شیعرمان بۆ بەدیار دەخاتەوە، ئەم وێنەیە ژیان و مردنی شیعرە))[٣٠٩] ، شاعیر بیرەوەری و یادی یارەکەی چوواندووە، بە شەوێکی تاریکی زستان، کە تێیدا چاوچاوی نەبینێ، واتە شەوێکی ئەنگوستە چاو لەناو دڵی شاعیر دروست دەکات و ترووسکای تێدا نامێنێ، وەك ئاگری دووری و سووتانی کەژ و کێو دڵ و دەروونی شاعیر گڕدەگرێت و دەبێتە خۆڵە مێش. لەوەشدا:

---

(٣٠٩) عەبدولرحمان مزوری، الصورة الفنية في مم و زين خاني، مجلة (سەرهەڵدان)، عدد (١٤)، دهۆك، ١٩٩٤، ص١٢٨.

**یاد/ بیرەوەری یار ← لێچووە.**

**شەوەزنگ ← لەوچووە.**

**ئاگر و سووتان و دووری و خەم و ژان ← ڕووی لێکچوواندنە.**

## ـ وێنەی لێکچوواندن لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا

لەلای "ڕەنجدەر"یش، وێنەی لێکچوواندن بەشێوەیەکی هونەری و جوان و کاریگەر بەرهەم هاتووە، واتە: شاعیر هونەرمەندانە هەستێکی دەروونی قووڵی ئەزموونی ژیانی خۆی کردووەتە، وێنەی خەیاڵی و وێنەی فەلسەفی بەرز، واتە وێنەکان هەڵگری خەون و خەیاڵ و جیهانبینی قووڵ و ئاییندەیەکی ڕوونن، ئەرکی شاعیر ئاشکراکردن و پەردە لە سەر لادانی نهێنییەکانی ئەم ژیانە شاراوەیە، کەلە شتەکانی دەورووبەرماندا حەشاردراون و ونن، بۆیە دەگووترێت: ((ئەرکی شاعیری ڕاستەقینەش ئەوەیە، توانای ئەو ئاشکراکردنە لەلای بگاتە ئەو پەڕی ))[٣١٠].

شاعیر لەم دەقەدا، دەنووسێت:

**((ئەو خەونەی سندووقی دەخیلەی منداڵیمە**

**بیرەوەرییەکانمی جەنجاڵ کردووە**

**ڕێگام لە ڕووناکی ون**

**تا دەگەمە شکاندنی سندووقی دەخیلەی منداڵیم**

(٣١٠) شوقي ضيف(د)، في النقد الأدبي، ط(٤)، دار العارف، القاهيرة، ١٩٧٦، ص١٧١.

**سبەینەیەکی پڕ لە سروودی پـیَ دەکـرم..)) (سـەباح ڕەنجـدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل١٧٧).**

شاعیر لە ڕێگەی کۆمەڵێك وشـەی سـادە و ئاسـتداردا، وێنەیـەکی لێکچوواندنی بەرهەم هێناوە و گەڕانەوەیەکی نۆستالژیای تاکی پڕ لـە حەسرەت و ئـێش و ئـازاری کێشـاوە، چـونکە شـاعیر لـەم ڕێگایـەوە بەهۆی وشەکانی: (دەخیلە ـ منداڵی ـ خەون ـ سبەی ـ شـکاندن ـــ بیرەوەری) یـەوە، کـە هـەموویان هـەڵگری مانـای دەلالی نۆسـتالژین، بەمەش وێنەیەکی شیعری لێکچوواندنی داهێناوە، لە هەمان کاتیشدا، ئێســتێتیکایەکی هونــەری و جــوانی بــە دەقەکــەداوە بەخشــیوە و تەنانەت پیت و وشەکانیش هەڵگری مانای نۆستالژیان، چونکە شاعیر بیرەوەری منـداڵی، کـە تـاوەکو ئێسـتا لـەناو مێشـك و زەینـدا مـاوە، چوواندوویەتی بـەو دەخیلەیـەی، کـە لـە منداڵیـدا پـارەی تێدەکـەن، پاش چەند مـانگ و سـاڵێك دەیشـکێنیَ و جـل و بـەرگ و دیـاری پـیَ دەکـریَ، واتــە مێشــکی شــاعیر، وەك دەخیلــەی زانیــاری و تــابلۆ ڕەنگاوڕەنگەکانی ژیان و ڕووداو و بیرەوەرییـەکانی تێـدا هـەڵگیراوە، لــەکاتی پێویســت بــەکاری دەهێنێــت و وەك، پارەکــەی ســوودی لیَ دەبینیَ. لە وەشدا:

**خەون ⟵ لێچووە.**

**سندووقی دەخیلەی منداڵیم ⟵ لەوچووە.**

هەروەها لەم دەقەشدا، دەنووسێت:

**((لە منداڵی بە هێیەکم کرد بەدوو کەرتەوە**

**کەرتێکی بە هەشت**

**کەرتێکی دۆزەخ**

**هەتا ئێستاش لە کەرتی بەهەشت دەخۆم و تەواو نەبووە))**

**(سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، ل٢٩٧).**

شاعیر لەرێگەی ئەم وێنەیە باسی دوو هێز لە جیهاندا دەکات، کە هێزی "چاکە" و هێزی "خراپ"ەیە، واتە مرۆڤ هەر لەگەڵ لە دایکبوونیدا و دوای ئاشنا بوونی بە دەوروبەرەکەی دوو هێز دەووری دەدەن، کە هێزی خێر و شەڕن، کە شاعیر بە بەهەشت و دۆزەخ ناویان دەبات، ئەو بەهێیەی شاعیر کەرتێکی، وەك بەهەشت و کەرتەکەی دیکەی وەك، دۆزەخ، واتە شاعیر منداڵی دەچووێنێ بە بەهەشت لەلایەك و لەلایەکی دیکەش، بە دۆزەخ، چونکە منداڵ پاکە وەك بەهەشت، بەڵام دوای ناسینی دەوروبەر و تێکەڵبوون بەو ژینگە پیسەی ژیان، ئەویش بەرەوە خراپە و شەڕ دەچێ، بەمەش وێنەی دۆزەخ دەچووێنێ بە هێزی خراپە و شەڕ، بەڵام شاعیر دەیەوێت بڵێ: منداڵ پاك و بێگەرد و بێ گوناحە، وەك بەهەشت منیش، تاوەکو ئێستا لەسەر ئەو پاکی و بێگەردییە ماوم و درێژە بە ژیان دەدەم،

هەر لەو کەرتەی بەهەشت دەخۆم و تەواو نەبووە، ئەمەش بە واتای بەردەوامی ژیان دێت، واتە بەهەشت و منداڵ لە پاکی و بێگەردی و بێ گوناحی لەیەك دەچن و هاوبەشن. کەواتە:

**منداڵ ← لێچووە.**

**بەهەشت ← لەوچووە.**

**بێ تاوانی پاکی و بێ گەردی ← ڕووی لێکچوواندنە.**

لەبنەڕەتدا وێنەکە، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**کەرتێك بەهێ ← لێچوونە.**

**کەرتێك بەهێ ← لێچوونە.**

**بەهەشت ← لەوچوونە.**

**دۆزەخ ← لەوچوونە.**

## دووەم: وێنەی خواستن :

خواستن ڕۆڵێکی چالاکی هەیە، لەپێکهاتە و داهێنانی وێنەی شیعری، بە دەگمەن شیعری شاعیرێك دەدۆزیتەوە، ئەم جۆرە وێنەی تێدا نەبێت، چونکە ((زۆر لە خواستنەکان شتێکی هەست پێکراوە لە شوێنی شتێکی هەست پیێ نەکراو، وێنە لە شیعردا تێپەڕاندنی زمانی ئاماژەییە"دەلالی"، بۆ زمانی سرووشی"ایحائی"، ئەوەش پەڕینەوەیەکە لەڕێی سووڕانەوە لە دوای وشەیەك، کە واتای لەسەر ئاستی یەکەم ون کردبێ، بۆ ئەوەی لە ئاستێکی تردا بە دەستی بینیێ))[٣١١].

خواستنیش لە بنجدا لێکچوواندن بووە، بەڵام لێکچوواندنەکە شکێنراوە، یان(لێچوو) و یانیش، (لەوچوو)ی، ماوە. بۆیە دەگووترێت: ((خواستن بەکارهێنانی وشەیەکە لە جیاتی وشەیەکی تر، لەبەر ئەوەی پەیوەندییەکی لێکچوواندن لە نێوان ئەم دوو وشانەدا هەیە، قەرینەیەکیش هەیە ڕێگری دەکات لەوەی وشە هێنراوەکە بۆ واتای دروست بەکارهێنرابێ))[٣١٢]. بە شێوەیەکی

(٣١١) هیتلەر ئەحمەد حەمە، وێنەی شیعری لای نالی، نامەی ماستەر، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، بەسەر پەرشتی (پ.ی.د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان)، ٢٠٠١، ل١٧.

(٣١٢) ئیدریس عەبدوڵڵا (د)، کۆ وانەکانی ڕەوانبێژی، چاپی یەکەم، چاپخانەی، ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٣، ل ١٦٦.

گشـــتی زانایـــانی ڕەوانبێـــژی "خواســـتن"، دەکـــەن بـــە دووجـــۆر سەرەکییەوە، ئەوانیش:

أ) خواستنی ئاشکرا.

ب) خواستنی درکاو.

### ـ وێنەی خواستن لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو"دا

شاعیر لە شیعری (هەڵچوون) دا، دیمەنێکی شەڕ و جەنگ و قەڵا و پەلامار و تێکشکاندن و تەفروو توناکردنی کردووە، بە وێنەیەکی خواستن، وەستایانە توانیوویەتی کاری لەسەر بکات و ئەم وێنەی لێ دروست بکات، شاعیر ئەم شتە بێ گیانانەی بە جەستە و کەس و گیان کردووە، وەك ((قەڵا، گەمارۆ، سەنگەر، پەلامار))، بەمەش وێنەیەکی خواستنی داهێناوە، چونکە شاعیر، کە پەنادەباتە بەر خواستن هەر لەبەر ئەوەیە، چونکە ((گەلێ شت هەیە، ناتوانێت بە ڕێگاکانی تر دەریان ببڕێت ))[٣١٣]. بۆیە خواستن باشترین ڕێگا چارەیە بۆ خستنە ڕووی ئەم شتانەی شاعیر خۆی دەیەوێ.

شاعیر لەم وێنەیەدا، دەڵێ:

**((گەمارۆم ناوێ، پەلامارم دە**

**سەنگەر و قەڵام تەفر و توناکە..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل٢٨٢).**

شاعیر خەسڵەتی شەڕ و جەنگی وەرگرتووە و خواستوویەتی و کردوویەتی بە وێنەیەکی هونەری جوان و مەبەستەکەی خۆی پێ

(٣١٣) سەردار ئەحمەد گەردی(د)، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری کوریدا، (١٩٧٠ – ١٩٩٠ )، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٢٣٨.

گەیاندووە، بەمەش تیٚ گەیشتنێکی زیاتری بە خوێنەر بەخشیووە، چونکە وشەکانی (گەمارۆدان و جەنگ و سەنگەر و قەڵا و پەلاماردان)، ئەمانە ڕێك و ڕەوان وێنەی دیمەنێکی بەرەی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەیە، بەڵام شاعیر جەنگی عەشق و دووری لە یار دەکاتە بەرەی جەنگ و سەنگەری بەرگری.

**لەڕووی ڕەوانبێژییەوە**، واتە: لاشەی من، وەکو قەڵا و سەنگەرێکە، تۆ تەفر و توناى بکە، بەڵام (لاشەی من)، کە (لێچوو)ە، لابراوە، ئەوەی ماوە تەنیا(لەوچوو)ە، کە (سەنگەر و قەڵا)یە، ئەوەش وێنەیەکی خواستنی ئاشکرایە.

لە وێنەیەکی دیکەدا "پەشێو"، دەنووسێت:

**((تۆ دەتوانیت باڵی زەمانم ببەستی و**

**درەختی پەنجەم بێبەر کەی..)) (عەبدوڵڵا پەشێو، هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا، ل١١٩).**

"پەشێو" لە ڕێگەی ئەندێشەوە، توانیوویەتی، وەك خەیاڵێکی بەرزی هونەری ئەم وێنە خواستنەمان، بۆ بهێنێتە بەرهەم، چونکە ئەندێشە و خەیاڵ بۆ هەر دەقێکی ئەدەبی ڕەگەزێکی بنەڕەتی و پڕ بایەخە و هەر ئەمەشە ئەدەب و قسەی ڕۆژانەی ئاسای لێك جیادەکاتەوە، هەر شیعرێکیش لە ڕووی خەیاڵ و ئەندێشەوە لاوازبێت، ئەوا دەقەکەش لاواز و کەم بایەخ دەبیٚ، بەمەش وێنەیەکی

سادە و بێ وورووژێنەر دێتە بەرچاو و دیدی خوێنەران، چونکە خـەیاڵ هەموو سنوورەکان دەبڕێت و شتە بـێ گیانـەکان دەکـات بـە گیـان و شیعرییەت بە دەقەکە دەبەخشێت. بەمەش وێنەیـەکی ئیسـتاتیکی و پڕ لە مانا و دەلالەتمان پێ دەبەخشێت، لەبەر ئەمەشـە دەگووترێـت: ((وێنــە لــەدایکبووی خەیاڵــە و خــەیاڵیش دامەزرێنــەری بنچــینە و بنــەمایی وێنــەی ئەدەبییــە))[٣١٤]، لەبــەر ئــەوەی خــەیاڵ بابەتەکـە مشتوماڵ دەکات و لە هەمان کاتدا جوانی هونـەری وێنـەی شـیعریش دەپارێزێت و بەردەوامی پێ دەبەخشێت.

**لــەڕووی ڕەوانبێژییــەوە**، ئــەم دەقــەی ســەرەوە، دوو وێنــەی خواستنی درکاوی تێدایە:

**یەکەمیان: واتە، زمانم وەکو باڵندەیەکی ئازاد باڵی هەیە..،**

**دووەم: پەنجەم وەکو درەختێك بەری هەیە..،**

ئەمانەش لە بنجدا، کە بەو شێوەیەن وێنـەی لێکچـوواندنن، بـەلاَم شاعیر کورتبڕی کردووە و ئەم پێکهاتە لێکچـوواندنانەی شـکاندووە و کردووینەتـە وێنـەی خواسـتن، لـە هـەردووکیان (لەوچـوو ) لابـراوە و (لێچوو ) هێڵدراوەتەوە، بۆیە هەر دووکیان وێنەی خواستنی درکاون.

---

(٣١٤) محمد صبحي أسعد أبو حسن، صورة المرأة في الأدب الأندلسي في عصر الطوئف والمرابطين، ط(٢)، عالم الكتب الحدث للنشر والتوزيع، اربد– الأردن، ٢٠٠٥، ص٢٨١.

## ـ وێنەی خواستن لە شیعرەکانی "ئەنوەر قادر محەمەد "دا

شاعیر هەمیشـە وێنـەکانی هـەڵگری چـەمك گـەلێکن خـەم و ژان و حەسرەتی بە ئـێش و ئازاریـان لـێ دەچـۆڕێ، شـاعیر تەنانـەت وێنـە شـیعرییەکانیش غـەریبی و ئـاوارەیی و دووره یـاری پێـوە دیـاره و بووەتە هەوێنی بەشێکی زۆری دەقەکانی شاعیر، ئەوەتا دەڵێ:

**((خۆشەویستم!**

**زۆر دەمێکە دەنووکی واژەی ژانی تاڵ**

**جـەرگی جەسـتەی چـاوەڕوانیم هەڵئـەدڕێ..)) (ئـەنوەر قـادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل٦).**

شـاعیر بـەهۆی ئـەم وشـانەوە، کـە هەریەکـەیان هـەڵگری مانـای جیاوازن، واتە مانای شتێك دەگـەینن، کـە لەوانەیـە ئـەو شـتە وابـێ، بەڵام لە زمانی شیعریدا ئەو مانـا و دەلالەتـەیان وەرگرتـووه، چـونکە دەگووترێت: ((وشە واتای شتێك دەگەینێت، بەڵام مەرج نییە لەزمانی شـیعریدا ئـەم واتایـە ببەخشـێت، بـەڵکو ئامـانجی شـیعر دەربڕینـی وێنەیەکی شیعرییە))[٣١٥]. چونکە شیعر زمانی مەجازە، بۆیـە وشـە و دەستەواژەکانیش واتا و دەلالەتی دیکە، لە خۆ دەگرن.

---

(٣١٥) عزالدین اسماعیل(د)، الشعر العربـی المعاصـر قضـایاة و ظـواهره الفنیـة المعنویـة، ط(٥)، دار العودة، بیروت، ١٩٨٨، ص ١٣١.

**لەڕووی ڕەوانبێژییەوە**، لەم کۆپلەیە دوو وێنەی خواستنی درکاو هەیە، ئەوانیش:

**یەکەمیان: دەنووك هی باڵندەیە، دراوەتە (واژەی ژانی تاڵ )، واتە: خەسڵەتی (لەوچوو)، دراوەتە (لێچوو)، ئەوەش وێنەی خواستنی درکاوە.**

**دووەم: لەم وێنەیەشدا جەستەی هی مرۆڤە، یان هی هەر گیاندارێکە، کە (هەستی، ماددی)نە، دراوەتە (چاوەڕوانی)، کە (ئەقڵی، مەعنەوی)یە، بەوەش وێنەی خواستنی درکاو بەرهەم هاتووە.**

هەروەها لە دەقێکی دیکەدا، دەنووسێت:

**((لێوی با ئارەقەی گۆنای جوانیٚ دەسڕیٚ**

**بە پەنجەشی کەزیی خاوی دەشێوێنیٚ..)) (ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، ل١٨٣).**

لەم کۆپلەیەشدا دوو وێنەی خواستنی درکاو هەیە، (لێو) و (پەنجە)، هی(مرۆڤ )ن و، دراونەتە (با)، کە (با) نە (لێو) و نە (پەنجەش)ی، نییە.

واتە: **(با) وەکو مرۆڤێك بە لێوەکانی ئارەقەی گۆنای یارەکەی دەسڕیٚ..**

**(با) وەکو مرۆڤێك بە پەنجەکانی کەزی خاوی یار دەشێوێنیٚ..**

**ـ وێنەی خواستن لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر"دا**

شاعیر لە دروستکردنی وێنەی شیعریدا توانایەکی لێهاتوو و بەرز و ئەندێشە و خەیاڵی فراوانی لە داهێنانی وێنەی شیعریدا هەیە، چونکە زمانی شاعیر، کە شیعری پێ دەنووسێت زمانێکە لە سەر بنەمای مەجاز و میتافۆر و کینایە و.....تاد، دامەزراوە و هەڵگری واتایەکی قووڵە و پڕ نهێنییە.

شاعیر لە ڕۆمانەشیعری (زێوان ) دا، دەنووسێت:

**((نواڵە ئێستا کاتژمێرەکەی نووستووە**

**ماوەیەکە پیاسەمان بە تاڵکردووە..)) (سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، ل٢٨).**

ئەم وێنە شیعریەی شاعیر لە ئەنجامی کۆ بوونەوەی کۆمەڵێك دیمەنی دابڕان و جێ هێشتن و بێ وەفایی یارە، کە لە مێشك و زەینی شاعیر لە ڕێگەی نەستەوە جارێکی دیکە، شاعیر بەکاری هێناوەتەوە و ئەم وێنەی لێ بەرهەمهێناوە، چونکە ((ژیانی شاعیر پڕیەتی لە کارەسات و ئەشکەنجە و گریان و پێکەنین، شاعیر ڕێبوارێکە لە تووڕەگەی دڵ و دەروونیدا بە سەدان وێنەی جۆراوجۆر و یادگاری بە

جێماو داخوان کراوە "هەڵگیراوە"، تانۆتە و دڵە کوتەی مابێت ئەم وێنانە بە دامێنی پێنووسەکەی دێنە خوارێ ))[٣١٦].

لەم کۆپلە شیعرەدا، وێنەی خواستی درکاو هەیە، لە نیوە دێری دووەمدا، چونکە (پیاسە) چەمکە و خەسڵەتی بە تاڵکردن هی (پیاسە) نییە، بەڵکو هی (قوتو)وە.

واتە: پیاسەمان وەکو قوتووەك شیر بەتاڵکرد.

لەوەشدا: **پیاسە ← لێچووە.**

**قوتو ← لەوچووە.**

**بە تاڵکردن ← پەیوەستی لەوچووە.**

وێنە لێکچوواندنەکە شکێنراوە، (لەوچوو) کە (قوتو) وە، لابراوە و خەسڵەتەکەی دراوەتە (لێچووە)، بەوەش وێنەیەکی خواستنی درکاو دروست بووە.

(٣١٦) موحسین ئاوارە، ڕەنگدانەوەی وێنە لەشیعری نوێی کوریدا، گۆڤاری(ڕۆشنبیری نوێ )، ژمارە(٧٥)، تەمموزی ١٩٧٩، ل٦٣.

# ئەنجامەکان

**یەکەم:** هەر یەکە لە "عەبدوڵڵا پەشێو و ئـەنوەر قـادر محەمـەد و سەباح ڕەنجدەر"، لە هەموو جۆرەکانی نۆستالژیا، نۆستالژیای تـاك، نۆستالژیای کۆ، نۆستالژیای تاك، وەك: دووری لەیار و وڵات و بنەماڵە و برادەرانی کۆن و سەردەمی منـداڵی و گەنجیـەتی و پـیری و ترسـی مردن و داهاتووێکی نموونـەیی و گـەڕان بـە دوای شـاری نموونـەیی و ڕووحی ئەزیەلی و بەهەشـتی ونبـوو، لـە نۆسـتالژیای گشـتیش، وەك: گەڕانەوە بۆ ئەفسانەکان و داستانە خۆماڵییەکان و کولتوور و وشـەی کـۆن و بابەتــە فۆلکلۆرییــەکان و ڕووداوە سیاســی و مێژوویــەکانیان بەرهەم هێناوە، بەڵام بە هەندێك جیاوازییەوە، بۆ نموونـە: گەڕانـەوە بۆ سەردەمی منداڵی و گەنجی و داهاتووی نموونەیی و ڕوحی ئـەزەلی بە هەشتی ونبوو، لەلای "سەباح ڕنجدەر" زیاتر و زەق و بەرچاوترە، وەك، لـەلای "عەبـدوڵڵا پەشـێو و ئـەنوەر قـادر محەمـەد"دا، کەچـی

لەلای ئەوان: دووری غوربەتی نیشتیمان و یار و نائومێدی و ڕەشبینی سیاسی زیاتر و بەرچاوترە.

**دووەم:** هۆکاری درستبوونی نۆستالژیا لە بەرهەمی ئەم سێ شاعیرانە، هەندێ جار دوورکەوتنەوە لە وڵات و کەوتنە ژیانی غەریبیە، وەکو ئەمەی لەلای "عەبدوڵڵا پەشێو و ئەنوەر قادر محەمەد"دا، هەستی پێ دەکەین، هەندێ جاری دیش هۆکارەکە زوڵم و ستەم و کاولکاری و تێکدانی واقیعە خۆشە ئاسانەکەیە، بۆ واقیعێکی دیکەی ناخۆش و زەحمەت و ئاڵۆز، با لە نێو وڵاتەکەش بێ، وەکو ئەوەی، لەلای "سەباح ڕەنجدەر"، بەدی دەکەین.

**سێیەم:** داستان و بابەتە فۆلکلۆریەیکانی جیهانی و کوردی، وەکو بنیاتێکی نۆستالژی لە بەرهەمەکانی هەر سێ شاعیردا، بەرجەستە کراوە، بەڵام بە شێوەی جیاواز، بۆ نموونە: هەر یەکە لە "عەبدوڵڵا پەشێو و ئەنوەر قادر محەمەد"، گرینگیەکی زۆریان بە داستانە خۆماڵییەکانی، وەك "مەم و زین، شیرین و فەرهاد، محەمەد و سێوێ" داوە، بەڵام هەرچی"سەباح ڕەنجدەر"ە، جگە لە داستانە خۆمالییەکانی، وەك "مەم و زین، شیرین و فەرهاد، لاس و خەزال"، گرینگی بە داستانە جیهانیە بەناو بانگەکانیش داوە، وەکو"داستانی گلگامێش، هەزار و یەکشەوە، لەیل و مەجنوون و.....تاد"ە.

**چوارەم:** نۆستالژیا لە شیعری ئەم شاعیرانە، بووەتە هۆکاری بەرهەم هێنانی گەلێ وێنەی بەلاغی، کە بە غەم و حەسرەت و باری دەروونی ماندووەوە داپۆشراون.

**پێنجەم:** زمانی شیعری ئەم دەقانە لای "عەبدوڵڵا پەشێو" ڕوونترە و وشەی کۆنی کوردی زۆرتر بەکارهێناوە، لای " ئەنوەر قادر محەمەد و سەباح ڕەنجدەر "دا، زیاتر بەرەوە تەکنیکی نوێ و وشە و دەربڕینی ڕەمزی و مەجازی زیاتر هاتووە، لەگەڵ هەندێك جیاوازی لە نێوان شێوەزارەکانیاندا، بۆ نموونە: " ئەنوەر قادر محەمەد" شێوەزاری سلێمانی بە ئاشکرا و دیار و زاڵە بەسەر دەقەکانیدا، لەولاوەش" عەبدوڵڵا پەشێو " زیاتر شێوەزاری هەولێر و دەوروبەری بە دەقەکانیەوە دیار و زاڵە، بەڵام هەرچی" سەباح ڕەنجدەر"ە، زمانەکەی کەمتر هەست بە بوونی شێوەزاری ناوچەی دەکەین، بەڵکو زمانێکی ئەدەبی یەکگرتووی پەیڕەوکردووە لەناو دەقەکانیدا.

**شەشەم:** زۆرترین ڕێژەی نۆستالژیای تاك، لەلای ئەم سێ شاعیرە، لە شیعرەکانی "سەباح ڕەنجدەر" بەدی دەکرێت و بەتایبەتی نۆستالژیای گەڕانەوە بۆ منداڵی و گەنجیەتی و

ئاییندەخوازی و داهاتوویێکی باشتر و بەختەوەری و ئارامی نموونەیی، ئەویش لەرێگەی "خەون و زیندەخەون"ەوە، چونکە خەون خۆی بە واتا و دەلالەتی ئاییندە و گریمان و پێشبینیەوە دێت، بە پێچەوانەی گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، کە دەبێتە هۆی خەم و ژان و ئازار و داخ و حەسرەتی ناخۆش و ئازار بەخشی و شتە لەدەستچووەکان، بەڵام زۆرترین ڕێژەی نۆستالژیای گشتی، بە پلەیەك لە شیعرەکانی "عەبدوڵڵا پەشێو" بەکارهاتووە، دواتر لای "ئەنوەر قادر محەمەد" بەکارهاتووە.

# لیستی سەرچاوەکان:

## ١. قورئانی پیرۆز

## یەکەم: سەرچاوە بە زمانی کوردی:

### أ) کتێب

٢. ئازاد ئەحمەد مەحموود(د)، بنیادی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢.
٣. ئارام سدیق، ناونیشان لە چیرۆکی کوردیدا، چاپخانەی، کارۆ، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٤. ئەحمەد شاملوو، داستانی گلگامێش، وەرگێڕانی: ئیدریس شێخ شەرەفی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج، هەولێر، ٢٠٠٤.
٥. ئەحمەد مەحموود عەبدوڵڵا، سوریالیزم لە ئەدەبی کوردیدا لە دوای ڕاپەرینی ١٩٩١، چاپخانەی بینایی، سلێمانی، ٢٠١٣.

٦. ئەرخەوان محەمەد عوبێد، ڕەمز و نووسینی سەرگۆڕەکان، بەنموونەی چوارگۆڕستانی باشووری کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨.
٧. ئەنوەر قادر محەمەد(د)، لە ئەدەبی ڕووسیەوە، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٦.
٨. ئیبراهیم ئەحمەد شوان(د)، ئەدەبی کۆنی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠١٢.
٩. ئیبراهیم ئەحمەد شوان (د)، مەحوینامە، چاپی دووەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠١٠.
١٠. ئیسماعیل ڕەسووڵ، چەند باسێك دەربارەی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەب، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨١.
١١. ئیدریس عەبدوڵلا(د)، قۆناخی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری کوردی (١٨٥١-١٩٣١)، چاپی یەکەم، چاپخانەی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری هەولێر، ٢٠٠٦.
١٢. ئیدریس عەبدوڵلا(د)، کۆ وانەکانی ڕەوانبێژی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٣.
١٣. باوکی عەبدوڵلا، بەهێزترین فەرموودەکانی پێغەمبەر(صلی اللە علیە وسلم)،چاپی یەکەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣.
١٤. پەخشان سابیر حەمەد(د)، ڕەمز لە شیعری هاوچەرخی کوردی کرمانجی خوراووی کوردستان (١٩٧٥-١٩٩١)، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢.
١٥. جەبار سابیر، لەو دیو هەناسەی شیعرەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨.
١٦. جەبار ئەحمەد حوسێن(د)، ئیستاتیکای دەقی شیعری کوردی کورستانی عێراق (١٩٥٠-١٩٧٠)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٨.
١٧. حەمە سەعید حەسەن، شیعر و شمشێر(لێکۆڵینەوەی ئەدەبی )، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بلاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.

١٨. حەمە ساڵح فەرهادی، سۆزی غەریبی و سێ چامەی کوردی، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٦.

١٩. حەمید عەزیز(د)، فەلسەفەی سەردەمی ڕۆمانتیکی، چاپی یەکەم، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٠.

٢٠. خورشید ڕەشید ئەحمەد، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی الجاحظ، بغداد، ١٩٨٩.

٢١. دواگفتوگۆکانی بورخیس و ئوسـﭬالدوفراری، وەرگێڕانی لە فارسیەوە: ڕەووف بێگەرد، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٢٢. رانیا سەمارە، ئەفسانە و ئەدەب، وەرگێڕانی :حوسین سابیر عەلی، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠٠٨.

٢٣. ڕەزا سەید حسینی، قوتابخانە ئەدەبییەکان، وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.

٢٤. ڕێبوار سیوەیلی، نەتەوە و حەکایەت، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٢.

٢٥.س.م.پترۆﭪ، پۆشکین (ژیان و بەرهەمی شاکاری)، وەرگێڕانی: محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٣.

٢٦. سەباح ئیسماعیل، چەمك و ئێستێتیکای شوێن لە ئەدەبدا، چاپی یەکەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩.

٢٧. سەباح ڕەنجدەر، دوو کتێب لەبارەی شیعرەوە، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریان، هەولێر، ٢٠١١.

٢٨. سەباح ڕەنجدەر، سێ کتێب لەبارەی شیعرەوە، چاپخانەی بینایی، سلێمانی، ٢٠١٣.

٢٩. سەباح ڕەنجدەر، ئەزموون وەك ئاخاوتنێك لەناو ژیاندا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٤.

٣٠. سەردار ئەحمەد گەردی(د)، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری کوریدا، (١٩٧٠ – ١٩٩٠ )، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٣١. سەرکەوت سەعدی قادر، نامۆیی لە ڕۆمانەکانی"سەڵاح عومەر"دا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١.
٣٢. شوکریە ڕەسووڵ(د)، وەرز و ساڵنامەی میللی لە پەند و شیعری کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٥.
٣٣. شوکریە ڕەسووڵ(د)، و شوکریە ڕەسووڵ و جەلال تەقی(د)، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی، لە چاپکراوەکانی ئەمینداریێتی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان، هەولێر، ١٩٨٤.
٣٤. شەرمین ئیبراهیم عەزیز، پەشێو و تازەکردنەوە لە شیعری کوردیدا، چاپخانەی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٦.
٣٥. عادل سادق(د)، خەمۆکی هۆکار و ڕێگاکانی چارەسەرکردنی، وەرگێڕانی: شیرین عەزیز بەکر، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣.
٣٦. عەبدولڕەحمان فەرهادی، دیداری غوربەت و زامداری نیشتیمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢.
٣٧. عەبدولمەتەڵیب عەبدوڵڵا، داهێنان سەر بە کەشفکردن و خەون و دنیا بینییە، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢.
٣٨. عەتا قەرەداخی، لە نێوان دەنگی خاك و دەنگی ڕووحدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی، سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٣.
٣٩. عەبدولقادر محەمەد ئەمین، وێنەی شیعری لە ڕێبازی ڕۆمانسیی کوریدا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢.
٤٠. عزەدین ئەحمەد عەزیز، بنەماکانی دەروونزانی گشتی، چاپی چوارەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢.
٤١. عومەر یاسین جەباری(د)، دەروونزانی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠٠٠.

٤٢. عوسمان دەشتی(د)، لەبارەی بنیاتی زمان و شێوازی شیعر، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر،٢٠١٢.

٤٣. عەبدوڵلا خالید ئاگرین(د)، کاریگەری بیری نەتەوەی لە گەشەسەندنی کورتە چیرۆکی کوردیی کوردستانی عیراق (١٩٦١– ١٩٧٠)، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٩.

٤٤. عەبدوڵلا ڕەحمان، بنیاتی گێڕانەوە(لێکۆڵینەوەی ئەدەبی)، چاپی یەکەم، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٤.

٤٥. عەبدوڵلا سەڕاج، دۆنایدۆن یان بەدگۆڕان، چاپخانەی بینایی، سلێمانی، ٢٠١٣.

٤٦. عەبدوڵلا سەڕاج، دیدار بینییەکانم، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٣.

٤٧. فازیل شەوڕۆ، (٢) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٣.

٤٨. فوئاد ڕەشید(د)، دەقی ئەدەبی (ئەدگار، چێژ، بەها )، چاپخانەی دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧.

٤٩. فەرهاد پیربال(د)، ڕێبازە ئەدەبیەکان، چاپخانەی دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، ٢٠٠٤.

٥٠. کامەران جەوهەری، پەشێو لە نێوان عەشق و نیشتیماندا، عەبدوڵلا پەشێو شاعیرێك لە ڕەگەزی سەربزێوی، کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: زیاد نادر عالڵلایی، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣.

٥١. کامەران موکری، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٤.

٥٢. کلۆد لیڤی شتراوس، ئەفسانە و واتا، وەرگێڕانی: خالید عوسمان، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٦.

٥٣. کەریم دەشتی، ئەدەب و فەلسەفە، چاپی دووەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣.

٥٤. کـەریم شـارەزا، ئەفسـانە لـە شـیعری هاوچـەرخی کوردیـدا، چـاپی یەکـەم، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٥.
٥٥. کـەریم شـەریف قەرەچـەتانی(د)، سروشـتی مرۆڤایـەتی لەڕوانگـەی جـان جـاك ڕۆسـۆ و سـیگمۆند فرۆیـدەوە، چـاپی یەکـەم، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣.
٥٦. کـەمال مـەعرووف(د)، ڕەخنـەیی نـوێی کـوردی، بەڕێوەبەرایـەتی چـاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠٧.
٥٧. کەمال مامەند میراودەلی، چەند وتارێك دەربارەی ڕەخنەی ئەدەبی، چاپخانەی الحواث، بەغداد، ١٩٨١.
٥٨. لەستایشـی ئەدەبدا، کۆمـەلێك وتـار، وەرگێڕانـی لـە ئینگلیزییـەوە: (شـێرزاد حەسەن)، چاپ و بلاوکردنەوەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠١١.
٥٩. محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم، پێکهاتەی زمانی شیعری لـە ڕوانگـەی ڕەخنـەی ئەدەبیی نوێوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٢.
٦٠. محەمەد فەریق حەسەن، هێمن و بۆنی غەریبی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.
٦١. محەمـەد.س.ڕۆسـتەم زادە (نـامۆ)، هونـەر و تەکنـەلۆژی، چـاپی یەکـەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ٢٠١٢، لـە بلاوکراوەکـانی دەزگـای موکریان.
٦٢. مەولوود ئیبراهیم حەسەن(د)، پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی، چـاپخانەی ڕەنـج، سلێمانی،٢٠٠٧.
٦٣. مەولوود ئیـبراهیم حەسـەن(د)، گـەڕان بـە دوای نەمرییـدا، چـاپخانەی ئـاراس، هەولێر،٢٠٠٢.
٦٤. مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، خولاصـەی تەفسـیری نـامی (قورئـانی پـیرۆز)، چاپی دووەم، ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا، سلێمانی، ٢٠١٠.
٦٥. میلان کۆنـدرا، ڕۆمـانی (نـەزانی)، وەرگێڕانـی: ئـەنوەر حەسـەن پـوور، چـاپی یەکەم، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٦٦. ناڵە حەسەن، چەمکە دەروونییەکان و دەقی ئەدەبی، چاپی یەکەم، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٢.
٦٧. هاوژین سلێوە عیسا، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری (شێرکۆ بێکەس) دا، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٦٨. هۆراس، هونەری شیعر، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: (حەمید عەزیز)، چاپی دووەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٦٩. هۆمیرۆس (ئەلیادە و ئۆدێسە)، وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی: (شاکر فەتاح)، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٤.
٧٠. هیمداد حوسێن(د)، ڕێبازە ئەدەبییەکان، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.

***ب) دیوانەکان:***

٧١. ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، چاپی یەکەم، چاپخانەی دلێر، سلێمانی،
٢٠٠٤.
٧٢. بابا تاهیری هەمەدانی، گەنجینە، بەشێك لە چوارینەکانی بابا تاهیر، وەرگێڕانی: دڵزار، چاپی دووەم، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.
٧٣. حەسیب قەرەداغی، فەرهەنگی خەم ٢، چاپخانەی دار الحریه للطباعة، بغداد، ١٩٨٩.
٧٤. سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢.
٧٥. سەباح ڕەنجدەر، سی ساڵ شیعر، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢.
٧٦. سەردار حەمید میران و کەریم شارەزا، دیوانی "حاجی قادری کۆیی"، سنە، ١٣٩٠.

٧٧. سەلام محەمەد (دیوان)، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٧٨. عەبـدوڵڵا پەشـێو(د)، دیـوانی"پشـت لـە نـەواو ڕوو لـە کرێـوە"، چـاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
٧٩. عەبـدوڵڵا پەشـێو(د)، دیـوانی"هەسـپم هـەورە و ڕکـێفم چـیا"، چـاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
٨٠. فەرهاد پیربال(د)، ئێکسل (Exil)، ئەنیستیوتی کورد، پاریس، ١٩٩٢.
٨١. لـەتیف هەڵمـەت، دیـوانی لـەتیف هەڵمـەت، بـەرگی یەکـەم، چـاپی دووەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٨٢. محەمەد عومەر عوسمان، لە غوربەتا، چاپخانەی نەورەس، سلێمانی، ١٩٨٥.
٨٣. محەمەد حەمە باقی، کۆشیعر، ژوان، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ١٩٨٠.
٨٤. مـەلا عەبدولکـەریمی مـودەڕیس و محەمـەدی مـەلا کـەریم، (دیـوانی مـەحوی)، چاپی دووەم، چاپخانەی ئۆفێستی حسام، بەغدا، ١٩٨٤.
٨٥. مــەلا عەبدولکــەریمی مــودەڕیس و فــاتیح عەبدولکــەریم (دیــوانی نــالی)، پێداچوونەوەی: محەمەدی مەلا کەریم، چاپی یەکەم، کۆڕی زانیاری، بەغدا، ١٩٧٦.

***ج) نامەی ئەکادیمی(ماستەر و دکتۆرا)***

٨٦. ئاشنا جەلال ڕەفیق، لاواندنەوە لە شیعری کوردی کرمانجی خـواروودا، نامـەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، کۆلیژی زمان، ٢٠١١.
٨٧. ئیـبراهیم حەسـەن حەمـەد، ڕەنگدانـەوەی کەلـەپوور لـە ڕۆمـانی هاوچـەرخی کوردیدا لە باشووری کوردستان (١٩٨٥ – ١٩٩١)، نامەی دکتۆرا، بەسەر پەرشـتی، پ.ی.د.(هیمـداد حوسـێن بـەکر )، زانکـۆی سـەڵاحەددین/ کۆلیـژی زمـان، هـەولێر، ٢٠١٠.
٨٨. ئەرسەلان بایز، سیمای شیعری کوردی دوای ڕاپەڕین، نامـەی دکتـۆرا، زانکـۆی سلێمانی، کۆلیژی زمان، بەشی کوردی، ٢٠٠٣.

٨٩. ڕزگار عومەر فەتاح، ڕۆمانسیزم له شیعری (هێمن و محەمەد نووری) دا، نامەی ماستەر، زانکۆی کۆیە، کۆلیژی زمان، بەشی کوردی، ٢٠٠٨.
٩٠. ڕووناك سەلاح عەلی، هونەری فەنتازیا له چیرۆکی نوێی کوردیدا، بە نموونەی چیرۆکەکانی" سابیر ڕەشید و شێرزاد حەسەن"، نامەی ماستەر، کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠١٤.
٩١. کامیران محەمەد نەبی، قۆناخەکانی گەشەکردنی بیری نەتەوایەتی له شیعری کوردیدا، له سەرەتاوە تاکۆتایی سەدەی بیستەم، نامەی دکتۆرا، کۆلیژی زمان، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠٠٥.
٩٢. هیتلەر ئەحمەد حەمە، وێنەی شیعری لای نالی، نامەی ماستەر، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، بەسەر پەرشتی (پ.ی.د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان)، ٢٠٠١.

### د) گۆڤار:

٩٣. ئامانج غازی، پەیوەندی نێوان بەرهەمە ئەدەبیەکان و مۆسیقا، گۆڤاری سبەی، ژمارەی (١)ی جۆزەردان، هەولێر،١٩٩٣.
٩٤. ئیبراهیم ئەحمەد شوان(د)، ڕەمز له شیعره کوردیەکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی دا، گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ژمارە(٣٤)، ساڵی ٢٠٠٨.
٩٥. ئیبراهیم ئەحمەد شوان (د)، نامۆیی له شعرەکانی مەحویدا، گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەددین، ژمارە،(٣٠)، ٢٠٠٧.
٩٦. دانا سەعید سۆفی، دەقی هاوچەرخ، گۆڤاری(سبەی)، ژمارە(١)ی، جۆزەردانی ساڵی، ١٩٩٣، هەولێر.
٩٧. سابیر ڕەشید، گۆرانی فۆلکلۆری، گۆڤاری، (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە،(٢١)، ساڵی، ٢٠٠٦.

٩٨. سـەرکەوت پێنجـوێنی، تاسـەی غوربـەت لـە شـیعری نـوێی کـوردی تاراوگـەدا، گۆڤاری (ڕامان)، ژ(٤٨)، ٢٠٠٠.

٩٩. سەمیرە عەلی، شێرکۆ بێ کەس، گۆڤاری ((سـورینێ نـوێ))، ژمـارە(٤)، سـاڵی سێیەم، سلێمانی، ئابی٢٠٠٧.

١٠٠. عزەدین مستەفا ڕەسووڵ(د)، شـیعرەکانی ئـەم ژمارەیـە و چـەند سـەرەنجێك، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە(٨)، ١٩٧٣.

١٠١. عەزیز گەردی (د)، ڕوخسار و ناوەرۆك لە هۆنراوەدا، گۆڤاری(هـەولێر)، ژمـارە (١)، ساڵی دووەم، ١٩٧١.

١٠٢. عەبـــدوڵڵا خـــدر مـــەولوود(د) و مـــەولوود ئیـــبراهیم حەســـەن(د)، هێمـــا ئەفسانەییەکان لە دیـوانی"نـالی و سـالم و کـوردی"دا، گۆڤـاری ئـەکادیمی کـوردی، ژمارە(١٨) ی، ساڵی ٢٠١١، هەولێر.

١٠٣. عەلی ئەشرەف دەروێشیان، سەمەدی بەهرەنگی، وێڵێـك بـە دوای خەونـەکانی مندالأندا، گۆڤاری ((سورینێ نوێ))، ژمارە(٤)، ساڵی سێیەم، ئابی ٢٠٠٧.

١٠٤. کۆواری کۆڕی زانیـاری (دەسـتەی کـورد)، بـەرگی ٢٩-٣٠، چاپخانەی کـۆڕی زانیاری بەغدا، ٢٠٠٢.

١٠٥. کەریم شارەزا، کەرەستەی ئەفسانە لە شیعری هاوچـەرخی کوردیـدا، گۆڤـاری (نووسەری کورد)، ١٩٧٣.

١٠٦. کەریم شەریف قەرەچەتانی(د)، داهێنـانی هونەرمەنـد و ئـەدیبان لـە ڕوانگـەی سیگمۆند فرۆیدەوە، گۆڤاری(کاروان)، ژمارە(١٣٥)، هەولێر، ١٩٩٩.

١٠٧. لاوك سـەلاح، مالڤـا ڕابـردوو و ئێسـتا، وەرگێڕانـی لـە ئینگلیزیـەوە، گۆڤـاری سبەی، ژمارە(١)ی جۆزەردان، ١٩٩٣.

١٠٨. محەمەد مەحوی(د)، زمان و زمانەوانی لە ڕۆژنامەگەرێتییـدا، گۆڤـاری زانکـۆی سلێمانی، ژمارە(١)، ساڵی، ٢٠٠٠.

١٠٩. موحســـین ئـــاوارە، ڕەنگدانـــەوەی وێنـــە لەشـــیعری نـــوێی کوریـــدا، گۆڤاری(ڕۆشنبیری نوێ )، ژمارە(٧٥)، تەمموزی ١٩٧٩.

١١٠. نەجات حەمید ئەحمەد، بنیاتی دووسەرەی نۆستالژیای بوون لە تراژیدیای نەبووندا، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١١٤).
١١١. نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، وەرگێران، دابەشبوونی ئیگۆ لە بەرگری کردندا، گۆڤاری کاروان، ژمارە(١٣٥)، هەولێر، ١٩٩٩.
١١٢. نەوزاد عەبدوللا حەسەن، وێنێ هۆزانێ دهھۆزانێن قوچانی دا، گۆڤاری (پەیڤ)، ژمارە(٧)، دهۆك، بهارا ١٩٩٨.

### ه) فەرهەنگ:

١١٣. جەمال ڕەشید فەرەج(د)، فەرهەنگی پزیشکی (دەوەن)، ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٠.
١١٤. جەلال مەحموود عەلی سوبحانی وەرگێڕانی: فەرهەنگی ئەلمونجید، بەرگی یەکەم، چاپخانەی سەردەم، هەولێر، ٢٠١٠.
١١٥. حەمە ڕەشید قەرەداغی(د)،فەرهەنگی ئازادی (ئینگلیزی ـــ کوردی)، چاپی یەکەم، چاپ و نشری ئیحسان، چاپخانەی اسوە، ٢٠٠٦.
١١٦. فەرهەنگی لاڕۆس، سەدەی بیستە لە بەرگی شەشەم، ١٩٣٢.
١١٧. زاراوەی ئەدەبی، ئامادە کردنی لیژنەی ئەدەبی کۆڕی زانیاری کوردستان، (کوردی ـ عەرەبی ـ ئینگلیزی)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
١١٨. نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی و ڕەخنەیی، سلێمانی، ٢٠١١.
١١٩. هەژار موکریانی (فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە)، کوردی ـــ فارسی، چاپخانەی سروش، تهران، ١٣٥٩.

### و) ڕۆژنامە:

١٢٠. سەباح ڕەنجدەر، کە شکۆی شیعر دەبێتە ئەزموونی ژیان و نووسین، "وتاری ئەدەبی" ڕۆژنامەی هەولێر، ژمارە(١٩٩٢)ی ، سێشەمەی (٣٠)ی، ئەیلوولی ٢٠١٤، هەولێر.

١٢١. مەجید سالح، دادایزم و ڕێبازی یاخی بوون، ڕۆژنامەی برایەتی، پاشکۆی ئەدەب و هونەر، ژمارە (٣٠١٧)، پێنج شەمە، هەولێر،٢٠٠٣.

# دووەم: سەرچاوە بە زمانی عەرەبی:

***ا) کتێب***

١٢٢. احمد طعمة حلبي(د)، التناص بين النظرية والطبيق شعر البياتي نموذجاً، الهيئة العامة السورية لكتاب، دمشق، ٢٠٠٧.

١٢٣. احسان عباس(د)، فن الشعر، دار الشروق للنشر والتوزيع عمان، الاردن، ط(٤)، ١٩٧٨.

١٢٤. أحسان محمد الحسن(د)، موسوعة علم الاجتماع، ط(١)، الدار العربية للموسوعات، بيروت، ١٩٩٠.

١٢٥. جابر عصفور(د)، الصورة الفنية في التراث النقديى و البلاغي عندالعرب، ط(٣)، المركز الثقافي العربى، بيروت، ١٩٩٢.

١٢٦. جاستر باشلار،جماليات المكان، ترجمه: غالب هلسا، كتاب الأقلام، دار الجاحظ للنشر، بغداد، ١٩٨٠.

١٢٧. جاك شورون، الموت في الفكر الغربي، ترجمة: كامل يوسف حسين، مراجعة: أمام عبدالفتاح أمام، علم المعرفة، الكويت، ١٩٨٤.

١٢٨.جان أيف تادييـة، ألنقد الأدبي في القرن العشرين، ترجمة، د. قاسم امقداد، منشورات وزارة الثقافة، المعهد العالى للفنون المسرحية، دمشق، سوريا، ١٩٩٣.

١٢٩. روز غريب، تمهيد فى النقد الحديث، دار المكشوف، بيروت، لبنان ١٩٧٩.

١٣٠. رمضان الصباغ(د)، في النقد الشعر العربى المعاصر، دار الوفاء، ط(١)، مصر، ٢٠٠٢.

١٣١. ريتا عوض، أسطورة الموت و الإنبحاث فى الشعر العربى الحديث، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت، ط(١)، ١٩٧٨.

١٣٢. شوقي ضيف(د)، في النقد الأدبي، ط(٤)، دار العارف، القاهيرة، ١٩٧٦.

١٣٣. عزالدين اسماعيل(د)، الشعر العربى المعاصر قضاياة و ظواهره الفنية المعنوية، ط(٥)، دار العودة، بيروت، ١٩٨٨.

١٣٤. عبدالرحمن بدوى، الزمان الوجودى، دارالثقافة، بيروت، ط(٣)، ١٩٧٣.

١٣٥. عبدالقادر ابوشريفه، مدخل الى تحليل النص الادبى، دار الفكر، عمان، ١٩٩٩.

١٣٦. عبدالعزيز عتيق، فى النقد الادبى، دار النهضة العربيه للطباعة، بيروت، ١٩٧٢.

١٣٧. محمد عباس يوسف(د)، الاعتراب و الابداع الفني، كلية التربية، جامعة الأزهر، دار غريب للطابعة والنشر والتوزيع، القاهرة، ٢٠٠٤.

١٣٨. محمد حسين على صغير(د)، أصول البيان العربي، دار الشؤن الثقافية، بغداد، ١٩٨٦.

١٣٩. محمد صبحى أسعد أبو حسن، صورة المرأة في الأدب الأندلسى في عصر الطوئف والمرابطين، ط(٢)، عالم الكتب الحدث للنشر والتوزيع، اربد– الأردن، ٢٠٠٥.

١٤٠.محمد مندور، الأدب المذاهبة، طبعة نهضة بمصر، القاهرة، ١٩٧٤.

١٤١. نصرت عبدالرحمان(د)، الصوره الفنيه فى الشعر الجاهلى في ضوء النقد الحديث، مكتبه الاقصى، عمان، ١٩٨٢.

١٤٢. نورالدين حسن محمد، ابن خفاجه شاعر شرق الاندلس، بيروت، ١٩٩٠.

***ب) نامەی ئەکادیمییەکان(ماستەر و دکتۆرا)***

١٤٣. يسرى خلف حسين، التناص في شعر حميد سعيد، كلية التربية ابن رشد، جامعة بغداد، رسالة الماجستير، ٢٠٠٢.

***ج) گۆڤار***

١٤٤. طلال سالم الحديثي، الرمز والاسطورة في الشعر الحديث، مجلة، "التراث الشعبي"، عدد(٨)، ١٩٧٠.

١٤٥. مصطفى الگيلانى، وجود النص الادبى – نص الوجود، مجلة الفكر العربي المعاصر، العدد(٥٤ و ٥٥)، ١٩٨٨.

١٤٦. عەبدولرحمان مزورى، الصورة الفنية في مم و زين خانى، مجلة (سەرهەڵدان)، عدد (١٤)، دهوك، ١٩٩٤.

### د) فەرهەنگ

١٤٧. سهيل إدريس(د)، (المنهل الوسيط)، قاموسي فرنسي ــ عربى ، دار الآدب، بيروت للطبعة العاشرة، عام، ٢٠٠٦.

١٤٨. لطفى الشربينى(د)، معجم مصطلحات الطب النفسي، مركز تحرين العلوم الصحيه،مؤسسة الكويت للتقديم العلمى، عام(؟).

١٤٩. مجدالدين فيروز آبادى، القاموس المحيط، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٤٠٦.

١٥٠. مدحت عبدالرزاق الحجازى، معجم مصطلحات علم النفس،(عربى ــ انگليزى)، دار الكتابه، بيروت، سنه،١٩٧١.

# سێیەم: سەرچاوە بە زمانی فارسی:

### أ) کتێب

١٥١. آلبر کامو، افسانەی سیزیف، ترجمە: علی صدوقی و محمد علی سپانلو و اکبر افسری، چاپ اول، چاپ نوبهار، نشر دنیای نو، تهران، ١٣٨٢.

١٥٢. آلن آراس، روانشناسی شخصیت، ترجمە: سیاوش جمال فر، چاپ دوم، نشر روان، تهران، ١٣٧٥.

١٥٣. رضا سید حسینی، مکتبهای ادبی، جلد اول، چاپ دوازدهم، تهران، ١٣٨١.

١٥٤. سعید شاملو، اسیب شناسی روانی، چاپ ششم، انتشارات رشد، تهران، ١٣٧٥.

١٥٥. سیروس شمیسا، بیان ، ویرایش سوم،چاپ دوم، تهران، میترا، ١٣٨٦.

١٥٦. کارل آبراهام، رؤیا اسطوره، ترجمە: جلال ستاری، جهان اسطوره شناسی، چاپ اول، نشر مرکز، تهران، ١٣٧٧..

١٥٧. محمد رضا شفیعی کدکنی (د)، صور خیال در شعر فارسی(؟).

١٥٨. محمد صنعتی، تحلیلهای روانشناسی در هنر و ادبیات، چاپ دوم، نشر مرکز، تهران، ١٣٨٢.

١٥٩. محمد مختاری، هفتاد سال عاشقانەها، تهران، ١٣٧٧.

١٦٠. منصور ثروت، آشنایی با مکتب های ادبی، چاپ اول، تهران، سخن، ١٣٨٥.

١٦١. مهدی ممتحن و حسین مجیدی و سکینە صارمی گروی، تطبیق نوستالژیا در اندیشە جبران و نیما.

١٦٢. میرچا الیادە، اسطورە ـ رؤیا ـ راز، ترجمە: رؤیا منجم، تهران: فکر روز، ١٣٧٤.

ب) نامەی ئەکادیمی (ماستەر و دکتۆرا)

١٦٣. معصومه خدادادی، نوستالژی در شعر زنان معاصر، پایان نامـه دكـتر زبـان و ادبيات فارسى، دانشگاه تربيت مدرس، ١٣٧٣.

ج) گۆڤار:

١٦٤. احمـد رضـايى(د)، نوسـتالژی دلتنگـی و حسـرت عارفانـه در شـعر سـالهای نخستين از جنگ تحميلى، كتـاب مـاه ادبيـات، شمـاره (٣٢)، پيـاپى (١٣٦)، بهمـن ماه، تهران، ١٣٨٧.

١٦٥. احمد رضا صيادى(د) و على رضا نورى(د)، نوستالژى در أثار ناصر و نظامى و خاقانى، آموزش زبان و ادب پارسى، شماره چهارم، تابستان، ١٣٩٠.

١٦٦. أليـاس نـورايى(د) و مهـدى شـريفيان(د) و علـى أصـغر آذر پـيرا، رويكردهـاى نوستالژيك در شعر م.سرشك، پژوهشـنامەی ادب غنـايى، شمـاره بيسـتم، دانشـگاه سيستان و بلوچستان، سال يازدهم، بهار و تابستان، ١٣٩٢.

١٦٧. تقى زاده، نۆستالژى، مجله فرهنگ و هنرى بخارا، شماره (٢٦)، ١٣٨١.

١٦٨. رابـرت سـەيد و ميشـل لـووى، رمانتيسـم و تفكـر اجتمـاعى، ترجمـه: يوسـف اباذرى، مجلەی ارغنون، شماره (٢)، انتشارات سازمان، تهران، ١٣٨٣.

١٦٩. خليل پروينى(د) و سجاد اسماعيلى، بررسى تطبيقى نوستالژى در شعر احمـد عبدالمعطى حجازى و نادر نـادرپور، فصـلنامه نقـد و ادبيـات تطبيقـى، شمـاره(٢)، ١٣٩٠.

١٧٠. سەير و لووى ميشل، رومانتيسـم و تفكـر اجتمـاعى، مجلـەی ارغنـون، شمـاره (٢)، تهران، سازمان انتشارات، ١٣٨٣.

١٧١. حميـد نفيسـى، نوسـتالژى مهـاجر، فصـلنامه گفتگـو، شمـاره(١١)، تهـران، ١٣٧٥.

١٧٢. صفدر تقی زاده، نوستالژی، نشریه بخارا، شماره(٢٤)، خرداد و تیر، تهران، ١٣٨١.

١٧٣. علی باقر طاهری نیا(د) و نسرین عباسی(د)، بررسی پدیده نوستالژی (غم غربت) در اشعار ابن خفاجه، پژوهشنامەی ادب غنایی، دانشگاه سیستان و بلوچستان، سال نهم، شماره(١٧)، پاییز و زمستان، ١٣٩٠.

١٧٤. مهدی شریفیان(د)، بررسی فرایند نوستالژی در اشعار سهراب سپهری، مجله زبان و ادبیات فارسی، دانشگاه سیستان و بلوچستان، سال پنجم، بهار و تابستان، ١٣٨٦.

١٧٥. مهرانگیز کاظمی، روانشناسی مرگ، مجله اطلاع رسانی همگانی، شماره (١٩١)، سال ١٣٨١.

١٧٦. محسن میرصادقی، نوستالوژی در شعر قیصر امین پور.

١٧٧. محمد ریحانی و ربابه قصابان شیروان، نوستالژیك "دووری معشوق" دربرخی از اشعار منوچهر آتشی، فصلنامه علمی پژوهشی زبان و ادب فارسی، دانشگاه ادبیات و زبان های خارجی، دانشگاه ازاد اسلامی واحد سنندج، سال چهارم، شماره(١٠)، بهار، ١٣٩١.

١٧٨. نجمه نظری و فاطمه کولیوند، بررسی نوستالژی (در شعر حمید مصدق)، فصلنامه زبان و ادب فارسی، شماره(٤٦)، زمستان ١٣٨٩.

١٧٩. یوسف عالی أباد(د)، غم غربت در شعر معاصر، نشریه علمی ـ پژوهشی گوهر گویا، سال دوم، شماره (٦)، تابستان، ١٣٨٧.

## د) فەرهەنگ

١٨٠.حسن انوشه، فرهنگ نامه ادبی فارسی، جلد ٢، چاپ اول، سازمان چاپ و انتشارات، تهران، ١٣٧٦.

١٨١. داریوش آشوری، فرهنگ علوم انسانی، تهران: مرکز، ١٣٨١.

١٨٢. سليمان حييم، فـرهنگ معاصـر، انگليـزى و فارسـى حيـيم، جلـدى يـك، چـاپ نوبهار، تهران، ١٣٧٥.
١٨٣. سيماداد، فرهنگ اصطلاحات ادبى، تهران، چاپ مرواريد، ١٣٨٧.
١٨٤. محمد رضا بـاطنى و ديگـران، واژەهـاى دخيـل اوروپـايى در فارسـى، فـرهنگ معاصر، چاپ چهارم، تهران، ١٣٧٢.
١٨٥. نصرت اله پورافكارى، فرهنگ جامع روانشناسى و روان پزشكى، انگليسـى ــ فارسى، جلدى دوم، انتشارات فرهنگ معاصر، تهران، ١٣٨٢.

## چوارەم: سەرچاوە بە زمانی ئینگلیزی:

### أ) کتێب

186 . Archer,J. Amus,S.L.Broad, H.& currid.L.Duration of Home sickness scale. British journal of Psy Schology,1998.
187. J.starobinski, llconcet to dellanostalgia,tr.itinprete Alacuradi) ,Raffaello cortino,1992
188. paul-Marie couteaux,royaliste"Les francais Souhaitunnouveaule gitimisme (enteretien) proposreceillis parchristophe Barbieer, LExpress,2002
189. Ray,yveline(1996)memoire, oubliette, nostalgiaen.therapie: vademander a mammy, eiie terecontera, Journal-Article.
190 . Tamara.S.Wagner,fellow. (Nostalgiaand The Victorian Novel),National university of Singapore/ university of combridge.
191 . Tilburg,1997 .

192 . Svetlana Boym,Nostalgia and Its Discontents.

## ب) فەرهەنگ.

193 . Addison Wesley Longman, Dictionary of English Language and Culture,1998 .
194 . M-N.Bouillet, Dictionnaire universel des sciences, desletterset desarts…, paris, Libraivie braivie del.Hacheet teetcit, 1857.
195 . Hornby,A.S., Oxford Advanced Leaness, Dictionary, Oxforduniversity press, 2003 .

# پێنجەم: ئینتەرنێت


١٩٦. حسين پاينده، نوستالژی و جست و جوی هويت WWW.atiban.com

197 . http:// agora.qc./doss:ery/Nostalgie paul marievouteaux,

١٩٨. جست و جو www.imdb.com

١٩٩. يوسف عالی، غم غربت در شعر معاصر، ١٣٨٨، ص ٩٠(http://yosefaali.blogfa.com)

٢٠٠. أمين صالح، نوستالجيا تاركوفسكی، مقاله حيث يلتقی الماء و النار، ترجمه لعربيه.

# شەشەم: چاوپێکەوتن

٢٠١. چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێز (ئەنوەر قادر محەمەد)، لە سلێمانی، کۆلیژی زمان، بەشی کوردی، لە ڕێکەوتی (٢١/٤/٢٠١٤)، کاتژمێر (١١)ی بەیانی.

٢٠٢. ئەنوەر قادر محەمەد(د)، (ئەزموون) گەڕان لەدووی خۆدەربڕین، بەشی یەکەم، سەرەتا هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٧٨. (بڵاونەکراوە).



# پێرست